# ڕشتەی مرواری





کۆمەڵە ئەدەبییێکی هەرە بەنرخە
لە فەلسەفە و بیر و باوەڕی کوردی

عەلائەددین سەجادی



| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | سجادی، علاءالدین، ۱۹۰۷ - ۱۹۸۴م. |
| عنوان و نام پدیدآور | : | ڕشتەی مرواری: کۆمەڵە ئەدەبییکی هەرە بەنرخە لە فەلسەفە و بیروباوەڕی کوردی/ دانراوی عەلائەددین سەججادی. |
| مشخصات نشر | : | سنندج : کردستان ، ۱۳۹۹. |
| مشخصات ظاهری | : | ۸ ج.: ۲۱/۵×۱۴/۵ سم. |
| شابک | : | دوره : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱۱-۸ / چ۱ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰٤۱۲-۵ |
| | | چ۲ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱۳-۲ / چ۳ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱٤-۹ |
| | | چ٤ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱۵-٦ / چ۵ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱٦-۳ |
| | | چ٦ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱۷-۰ / چ۷ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱۸-۷ |
| | | چ۸ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱۹-٤ |
| وضعیت فهرست نویسی | : | فیپا |
| یادداشت | : | کردی. |
| موضوع | : | شوخی‌ها و بذله‌گویی‌های کردی-- عراق-- قرن ۲۰م. |
| موضوع | : | ۲۰th century -- Kurdish wit and humor-- Iraq |
| موضوع | : | داستان‌های طنزآمیز کردی |
| موضوع | : | Humorous stories, Kurdish* |
| رده بندی کنگره | : | PIR۳۲۵۶ |
| رده بندی دیویی | : | ۸فا۹/۲۸۲۶۲ |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۷۴۲۸۵۳۱ |
| وضعیت رکورد | : | فیپا |

# ڕشتەی مرواری

-١-

کۆمەڵە ئەدەبییێکی هەرە بە نرخە
لە فەلسەفە و بیروباوەڕی کوردی


دانراوی:

**مامۆستا عەلائەددین سەجادی**





انتشارات کردستان

سنە

انتشارات کُردستان

# ڕشتەی مرواری

## -١-


| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | ڕشتەی مرواری |
| ✓ دانراوی (مؤلف): | مامۆستا عەلائەددین سەججادی |
| ✓ پێداچوونەوە و هەڵەبژێری: | ژیلا قەوامی / ڕەفیق ڕۆستەمی |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول) ١٣٩٠-٢٠٢١ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ١٠٠٠ بەرگ (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕە و قەوارە (تعداد صفحات): | ٢٤٦ لاپەڕە (صفحەی رقعی) |
| ✓ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کُردستان) |
| ✓ شابک: | دورە: ٨-٤١١-٩٨٠-٩٦٤-٩٧٨ - شابک جلد (١): ٥-٤١٢-٩٨٠-٩٦٤-٩٧٨ |

✓ قیمت (نرخ):
بەرگی سەخت: ٤٧٥,٠٠٠ تمەن - ٣٠,٠٠٠ دینار
بەرگی نەرم: ٣٧٥,٠٠٠ تمەن - ٢٥,٠٠٠ دینار





سنندج، چهارراه شهدا، پاساژ عزتی، انتشارات کُردستان، تلفن: ٠٨٧ ٣٣١۶۵٣٨٢
سنە، پاسازی عیززەتی، بڵاوکردنەوەی کوردستان، تەلەفوون: ٠٠٩٨ ٨٧ ٣٣١۶۵٣٨٢

# ناواخن

بەناوی خودا

ئێمە وەکوو بنەماڵەی مامۆستا عەلائەددین سەججادی «ئازاد سەججادی، دانش سەججادی» ئیجازەمان داوەتە «ئینتیشاراتی کوردستان لە شاری سنە» هەموو بەرهەمەکانی باوکمان «مامۆستا عەلائەددین سەججادی» چاپ و بڵاو بکەنەوە.

جگە لەوان هیچکەس و لایەنێکی تر حەقی چاپکردنیان نییە!

ئازاد علاءالدین سجادی
8-12-2016

دانش علاءالدین سجادی
8-12-2016

ئێمە وەکوو بنەماڵەی مامۆستا علاءالدین سجادی مافی لە چاپدانی سەرجەم بەرهەمی باوکمان داوەتە ئینتشاراتی کوردستان لە شاری سنە وە هیچ کەسی و لایەنێکی تر بۆی نییە چاپیان بکات جگە لەم دەزگایە وە مافی لە چاپدانەوەی پارێزراوە بۆ بنەماڵەی مامۆستا علاءالدین سجادی

دانش علاءالدین سجادی
٢٠١٦/١٢/٢٩

## پێشەکی بۆ ئەم چاپە

**بەناوی بەدیهێنەری بوونەوەر**

نامانەوێ بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای مێژووی مرۆڤ و نەتەوەی کورد، نامانەوێ بڵێین: مرۆڤ واتە کورد و بەس. ناشمانەوێ بڵێین: کورد هیچی نەبووە و دواکەوتوو بووە.

بەڵام ئەمانەوێ بڵێن: کوردیش یەکێکە لەو مرۆڤانەی کە یەزدانی مەزن نیشتمانێکی پیرۆزی کردە خەڵاتی، کە بەپێی دەقی قورئان بە خاکێکی پیرۆز و لەقا لێخراو ناوبراوە.

دیارە خاکی بەپیت و بایەخ، بەری شیاوی لە ئامێزدایە؛ ئەم گەلی کوردە تەڵەبەری ئەم جیهانە پانوپۆڕەیە کە لەم خاکە بەپیتەدا خوای گەورە داینا بۆ ئاوەدانکردنەوە و وەچە خستنەوە و سەرهەڵدانی گەلێکی زەحمەتکێش و دڵسۆز و مرۆڤدۆست و قارەمان.

بەڵام لەبەر ئەوەی شتی بەنرخ، ناحەزی زۆرە و هەرکەسە ئەیەوێ بە شێوازێك خۆی بکاتە خاوەنی، ئەم خاك و نیشتمانی کوردستانەیش کەوتۆتە بەر تەوژمی داگیرکەران و ناحەزان.

بە درێژایی مێژوو پیلانی جۆراوجۆریان بۆ دارێژراوە و شەڕی زۆریان لەگەڵ کراوە، بەڵام گەلی کورد دەوامی هێناوە و تا دوا هەناسە

دژی پیلانگێڕان و ئاژاوەچییان وەستاوە و لەلایەن نیشتماندۆستانەوە بەرپەرچ دراونەتەوە و پاش هەزاران ساڵ هێشتا نیشتمان هەر کوردستانە.

کاتێ بەو جۆرە نەیانتوانی گەلی قارەمان دەستەمۆ بکەن، ڕێکاری‌تریان گرتەبەر بۆ ئەوەی بگەنە ئاواتیان. بۆ ئەم مەبەستەیان هاتن دەستیان برین لە جیهانی ڕۆژ و هەموو کەرەستە پێشکەوتووەکان؛ بەڵام، بەپیتی ئەو خاك و ئاوە، مێشکی وەهای پەروەردە کرد، کە توانییان بەبێ نیاز بە جیهانی دەرەوە، بۆ خۆیان ئامێر و پێداویستی ژیانیان دروست بکەن و لەم ڕێگەشەوە دوژمن ناهومێد بوون.

دوژمن دەیزانی بۆ ئەوەی گەلی کورد لە ڕیشە دەربهێنێ و خاکی بکاتە نیشتمانی خۆی، ئەبێ فەرهەنگ و کەلتوور و مێژووی ئەو گەلە لەناو بەرێ؛ بەم‌بۆنەوە نەیانهێشت گەلی کورد خوێندەوار بن و مێژووی خۆیان تۆمار بکەن بۆ داهاتوو، کەلتوور و فەرهەنگ و زمانی خۆیان، بە ناوی پێشکەوتنەوە، ناردە ناویان و کاڵفامەکانیان لە برە برد و چپانیان بە گوێیاندا کە تا خۆتان نەگۆڕن، پێش ناکەون و هەر دواکەوتوون، کە ئێستە بەرهەمی ئەو خۆفرۆشییە بە چاو ئەبینرێ و بووەتە هێمای مۆدێڕنیتە بوون!.

خەریکیان کردن بە خوێندنەوە و نووسینی بێگانە و خۆیان لە پێنووس بران و بوونە بووکەڵەی دەستی ناحەز و بە هەرجۆر حەزی ئەوان بوو، جلوبەرگیان بۆ ئەدوورین و بۆیان ئەنووسین و پێیان ئەخوێندن.

بەڵام لەناو هەر نەتەوەیەکدا کەسانێك بوون کە وەك مۆم داگیرساون و هێورهێور سووتاون بۆ ئەوە ڕووناکی ببەخشن، خەڵکیان فێری خوێندن و نووسین کردووە تا چی‌تر مێژوویان نەسڕێتەوە، شاعیران بە شیعر و نووسەران بە نووسین کەوتنە زیندوو کردنەوەی گەلی چەوساوە. ئەم

بزاڤەش لەدوای سەرهەڵدانی ئیسلام لە کوردستاندا دەستی پێکردووە و لە مزگەوت و حوجرە و تەکیە و خانەقاکاندا گەشەی کردووە و مێژوو ئەم ڕاستییە دەسەلمێنێ.

یەکێ لەم کەڵەپیاوانە کە بەڕاستی ڕشتەی نووکی خامەی، گەوهەر و مرواری لێدەبارێت و نەیهێشت لەمە زیاتر بێناسنامە بمێنینەوە مامۆستا عەلائەددینی سەججادییە؛ وە یەکێ لە شاکارەکانی ئەم ڕشتەی مروارییەیە، کە سەرەتاکەی ئەو دایهێنا و بە هیواین درێژەی پێبدرێ و لە خەوی بێئاگایی بێدار بینەوە و بە گورگانەشەوێی ناحەز خەونووچکە نەمانباتەوە و کەلتوور و مێژوومان لێنەدزن.

دوای ئەوەی لە ساڵەکانی ١٩٥٠ی زایینی بەدواوە ئەم نووسراوە زیندووە کەوتە بەردەستی خوێنەر، نامۆییەکەی ڕۆشنبیرەکانی سڵەماندەوە (هەروەك مامۆستا خۆی ئاماژەی پێئەکات). بەڵام دواتر خۆیان بوونە خولیای درێژەپێدانی.

ئێمەش وەکوو ڕێبوارێکی ئەم ڕێوازە، قۆڵمان لێ هەڵماڵی و دڵسۆزانە ڕێگەکەمان خاوێن کردەوە و تاسمان دا بۆ عاشقان و بەشی خۆیشمان حەڵاڵ کرد.

## بۆ ئەم چاپی دووهەمە چی کراوە؟

دوابەدوای تەواوبوونی چاپی یەکەمی ئەم هەشت ڕشتەیە، بازاڕی مراوارییەکانی گەرم بوو، هەریەکە و بەپێی توانا سەرلەنوێ چاپی ئەکردەوە و ئەخرایەوە بەردەستی خوێنەر. لە ساڵی ٢٧١٧ی کوردی (١٣٩٦ هەتاوی - ٢٠١٧ی زایینی) چاپی یەکەمی ئەم کتێبە بە ڕێنووسی نوێ لە یەك بەرگدا لەلایەن چاپ و دەزگای بڵاوکردنەوەی کوردستانەوە لە سنە، چاپ و بڵاو کرایەوە. ئینجا لەبەر هەندێ پێویستی جارێکی‌تر

خوێندنەوەمان بۆ کرد و ئەم ئەرکانەی خۆمانمان بە جوانی بەڕێوە برد. هەرچەن ناتوانین بڵێین بێ‌هەڵە و کەموکووڕییە، بەڵام ئەتوانین بڵێین بێ‌هەڵەترین و پوختترین ڕشتەیەکە تا ئێستە کەوتۆتە بەردەستی خوێنەر، لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

١- بە وردی پێداچوونەوەمان بۆ کرد و لەگەڵ چەند نوسخەیەکی چاپکراوی چەند بڵاوکراوەی جیاواز، بەرابەریمان کرد و لەیەکمان دانەوە، تا جوانترین و پوختترین بەرهەم بەدەست بێت.

٢- تا ڕادەی توانا، هەتا لە بابەتیک تێ‌نەگەیشتبین و بۆمان ڕاست نەبووبێتەوە، دەستبەرداری نەبووین و وازمان لێ‌نەهێناوە. وە بۆ ئەم کارەی خۆمان بێجگە لە نوسخە جیاوازەکانی ڕشتە، بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکان و جێ‌ناکۆکەکان؛ لە فەرهەنگە کوردییەکان و تەکنۆلۆژی ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و ئەپلیکەیشنە تایبەتەکان کەڵکمان وەرگرتووە و لە کەسایەتییە شارەزاکانیش لە شارە جۆراوجۆرەکانی کوردستان پرسیار و ڕاوێژمان کردووە.

٣- بۆ ڕاستکردنەوەی زاراوە جیاوازەکانی وەکوو هەورامی و کرمانجی و جافی و فەیلی و... لە پسپۆڕ و شارەزای ئەو ناوچەیە داوای ڕوونکردنەوە کراوە و تا ڕادەی توانا زاراوەکانمان بێ‌قسە کردووە. بەڵام لەبەر ئەوەی هەورامییەکە زۆر جیاوازتر بوو لە زاراوەکەی خۆی، بە پێویستمان زانی لەبەر ئەوەی هەڵەی نووسینەکە نەبێتە مێژوو بۆ نادروستی زمانەکە، لە پەراوێزدا ئەسڵی قسەکەمان بە هەورامی نووسییەوە.

٤- بۆ ڕاستکردنەوەی ناوی شوێن و کەسایەتییەکان، تەواوی هەوڵی خۆمان خستۆتە کار بۆ ئەوەی کێشەیەکی ڕێزمانی و ڕێنووسی لە ناوەکاندا نەبێ.

٥- ڕێنووسەکەی بە ڕێنووسی سەردەم پیتچنی کراوە و ئەو شوێنانەی کە پێویست بوون بە شێوازی نووسینی خۆیان، لەبەر ئەوەی ئەگەر بکرابایە بە ڕێنووسی کوردی مانای وشە، یان ناوەکە ئەگۆڕدرا، لە نێو دوو کەواندا وەکوو خۆی نووسیمانەوە.

٦- هەرچەن بابەت و چیرۆکەکان لە هەندێ جێگادا دووپات کرابوونەوە، بەڵام لەبەر ئەمانەتداری زەحمەتەکانی مامۆستا، بە ئەمانەتەوە وەکوو خۆی نووسیمانەوە و زیادەکانمان لانەبرد.

٧- بۆ زانیاری خوێنەر، بۆ یەکەمجار لەم چاپەدا فەرهەنگۆکێکی کورتی پوختی ساکارمان لە کۆتایی کتێبەکەدا دانا، بۆ دۆزینەوەی مانای هەندێ وشەی نامۆ کە لەناو ڕشتەکەدا بە زاراوە جۆراوجۆرەکان هاتبوون.

٨- ئەگەر لە هەندێ شوێن هەستمان کردبێ وشە، یان ڕستەیەك ناتەواوە و بەبێ ئەوە مانا نادا، لەناو کرۆشەدا پێمان زیاد کردووە و دەسکاری مەتنەکەمان نەکردووە.

٩- ئەگەر لە شوێنێك هێمایەکی سەرسوڕهێنەرتان بەرچاو کەوت لەناو کرۆشەدا، ئەوە مانای وایە ئەم بۆچوونەی مامۆستامان پێ وا نەبووە، بەڵام نەمانگۆڕیوە.

١٠- ئەگەر لە شوێنێکدا نەمانتوانیبێ هەڵەکان ڕاست بکەینەوە، لە پەراوێزدا ئاماژەمان کردووە و لەسەر شانی خۆمان سووك کردووە.

١١- لەبەر ئەوەی تەنیا پەروەردگار هەڵە ناکا، ئێمەیش پێ ئەچێ هەڵەمان بووبێ، هەرچەن لای خۆیشمان وایە بێ هەڵەیە، بەڵام ئێوە بە گەورەیی خۆتان چاکی بکەن و ئاگادارمان بکەنەوە تا لە چاپەکانی داهاتوودا جێگریان کەین.

ئیتر خۆشیتان لە خوای گەورە داواکارین، هەر بژین و خوا پشتیوانی ئێستا و دوارۆژی هەمووڵایەکمان بێت.

**بە سوپاسەوە /م ڕەفیق ڕوستەمی**
**٢٥ی ڕەزبەری ٢٧١٩ کوردی**

# پێشەکیی بڵاوکەرەوە

سەدەی نۆزدەهەم لە مێژووی هاوچەرخی کورددا سەدەیەکە پڕ لە هەوراز و نشێو، لێوڕێژ لە خۆشی و ناخۆشی، دارماڵ لە دەرفەت و هیوا، لێوانلێو لە ناهومێدی و کلۆڵی و شەڕی نەخوازراو و ئاوارەیی و هەژاری و نەداری؛ کورد لەم سەدەیەدا لەباتی ئەوەی وەکوو گەلانی‌تری ئەم جیهانە، مافێکی بدرێتێ و لەسەر ئاو و خاکی باوباپیرانیەوە وەحەوێ، کەچی سیاسەتی نامرۆڤانەی بەرژەوەندخوازانەی ئیمپریالیزمی جیهانی هات و کردی بە چەند کەرتەوە و هەر کەرتێکی نووسان بە پەیکەرەی وڵاتێکەوە کە دەسەڵاتدارانی ئەم وڵاتانە - ئێستەیشی پێوە بێ - وەکوو گەلێکی یاخی و سەربزێو لێیان ڕوانیوە و نەیانهێشتووە پشوویەکی بە بەردا بێتەوە و سەری لە نێو سەراندا دەرکەوێ؛ بەڵام باهۆزی نیشتمانپەروەری و گەلدۆستی لە دەروونی لاوی کورددا نەنیشتووەتەوە و ڕۆژبەڕۆژ لە ڕاماڵیندا بووە، کوشتن و ئاوارەکردن و زیندانکردن نەیانتوانی هەرەس بە وورەی ئەم گەلە بهێنن و لە ئامانجی ڕەوای خۆیی وەرگێڕن، ئەگەر لە بەشێکی ئەم کوردستانەدا شۆڕشی ڕامیاری سەرکوت کراوە، لە بەشێکی‌تریدا شۆڕشی ئەدەبی سەری هەڵداوە کە نەیهێشتووە درەختی خەبات، پاییزی ناهومێدی دایگرێ و لقوپۆی وشک ببێ، لەم سەدەی نۆزدهەمەدا بیرمەندان و

خوێندەواران و نووسەرانێکی زۆر بەتوانا هاتنە ئاراوە کە بەڕاستی دڵسۆزانە خەباتی پێنووسیان کرد، ئاوارەییان کێشا، زیندان و نەداری و هەژارییان بینی، بەڵام هیچیان نەیانتوانی هەڵوێستیان بگۆڕن و بۆ تاوێك لەو بزاڤە ڕۆشنگەرییە زایانگرن.

یەکێك لەم نووسەرە خەباتکەرانە جەنابی مامۆستا عەلائەددینی سەجادییە، کەسێك کە ماوەی چل ساڵ لە تەمەنی خۆی بۆ فەرهەنگ و زمان و کلتوور و کەلەپووری نەتەوەکەی تەرخان کرد، شاربەشار و دێ‌بەدێ دەگەڕا بۆ بەدەستهێنانی پەندێك، مەتەڵێك، یان چیرۆکێکی ڕەسەنی کوردی، تا بەڵکوو لە فەوتان ڕزگاری بکات و مەڵۆمەڵۆ لە شارای خەرمانی کەلەپووری کوردیدا دابنێ، بۆ ئەوەی وەچەی دوایی، پاش شەن‌وکەوکردن، کەڵکی لێ‌وەرگرن.

مامۆستا سەجادی خەمخۆرێکە ئاگای لە دەردی نەتەوەکەیەتی، بۆیە چل ساڵ بەدوای دەرماندا گەڕاوە بۆ چارەسەرکردنی ئەو دەردە، دەردەکەش دەردی نەخوێندەواری و تێنەگەیشتنە، هەر بۆیە لەسەر ڕووبەرگی هەموو کتێبەکانیەوە ئەم ڕستە جوانەی نووسیوە: «زانا دانایە، دانا توانایە» واتە: هەتا زانا و خوێندەوار نەبین، ناتوانین دانا و تێگەیشتوو بین، و تا تێگەیشتوو نەبین، توانا و دەسەڵاتمان نییە و لە ژیانی ژێردەستەیی ڕزگارمان نابێ. کەواتە شۆڕشی پێنووس هاوشان و هاوتەریبی شۆڕشی چەکدارییە و بەڵکوو گۆڕەپانی ئەم بەربلاوترە؛ چونکە کەوشەن و پانتایی شۆڕشی پێنووس مزگەوت و حوجرە و زانکۆ و قوتابخانە و کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە و... دەگرێتەوە و هەموو چین و توێژێك لە هەموو بوارێکدا دەتوانن ئەم جۆرە شۆڕشە ڕێك بخەن. هەروەك چۆن مامۆستا سەجادی و زۆرێك لە زانایان و ڕۆشنبیرانمان

ئەم شۆڕشەیان هەڵبژارد و کتێبخانەی کوردیان تەژی بەرهەمی پاراوی خۆیان کرد و بوونە شانازی بۆ گەلی کورد. بەو هیوایەی جارێکی‌تر گەلی کورد ڕۆڵەی ئاوا پەروەردە بکا و پێشکەشی کۆمەڵگای بکات.

## ژیان و ژیواری:

[عەلائەددین، کوڕی نەجمەددین کوڕی عیسامەددین لە بنەماڵەی سەججادی شاری سنەیە. لە ساڵی ١٩٠٧ی زایینی لە گەڕەکی قەتارچیان لە سنە لەدایك بووە، خوێندنی سەرەتایی لە حوجرەی مزگەوت دەست‌پێ‌کردووە و بە فەقێیەتی زۆر شوێنی کوردستانی ئێران و عێراق گەڕاوە، دواجار لە سولەیمانی دانیشتووە و لە ساڵی ١٩٣٨ ئیجازەی زانستە ئایینییەکانی وەرگرتووە. ئەوجا ڕووی کردووەتە بەغدا و لە مزگەوتی نەعیمەخاتوون لە گەڕەکی بەناوبانگی "مەیدان" بووەتە پێشنوێژ و هەر لەوێش ژیاوە.

لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانی لە ڕۆژنامەگەری نزیك بووەتەوە، بەم هۆیەوە پەیوەندی بە چاپ و چاپەمەنییەوە بووە، لە گۆڤاری «گەلاوێژ»دا کاری کردووە، گۆڤاری «نزار»ی بەڕێوە بردووە. لە ساڵی ١٩٥٩ کراوە بە مامۆستای ئەدەبی کوردی لە زانکۆی ئەدەبیاتی بەغدا، لەسەر ئەم ئیشەی بەردەوام بووە تا ساڵی ١٩٧٠، لەم ساڵەدا کراوە بە ئەمینداریەتی گشتی ئەوقاف (بە پلەی وەزیری) لە هەرێمی ئۆتۆنۆمی کوردستانی عێراق لە هەولێر. ساڵی ١٩٧٧ خانەنشین کراوە و گەڕاوەتەوە بەغدا و کەوتووەتەوە سەر کۆتایی‌هێنان بەو پرۆژە و ئیشانەی کە لە بابەت ئەدەبی کوردیدا نیوە و ناتەواو دەستی لێ‌هەڵگرتبوون.

کوژرانی کوڕەگەورەی لە جەنگی ئێران و عێراقدا (١٩٨٠ ـ ١٩٨٨)

هێزی لێبڕیوە و لە پەلوپۆی خستووە و توانای نووسین و لێکۆڵینەوەی کەم کردووەتەوە، تا لە ڕۆژی ١٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٤ی ز (٢٢/ ٩/ ١٣٦٣ هەتاوی) لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی بە خاك سپێردراوە][1].

**بەرهەمەکانی:**

مامۆستا سەججادی لەگەڵ ئەوەدا کە درەنگ دەستی بە نووسین کردووە؛ بەڵام بەرهەمی زۆر و پڕبەهرەی لێ بەجێماوە کە لە ڕاستیدا هەموویان سەرچاوە و جێی بڕوای لێکۆڵەران و توێژەرانن.

سەرەتای دەستکردن بە نووسینی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەرهەڵدانی جەنگی جیهانیی دووەم، کە ئەودەم ڕۆژنامە گەورەترین دەزگای ڕاگەیاندن بووە، بەتایبەت بۆ خوێندەواران، سەججادیش بە ڕۆژنامەگەری دەستپێدەکات، لە ژێر چاودێریی نووسەری بەتوانا، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد کە خاوەنی گۆڤاری «گەلاوێژ» بووە، بەڵام چونکە بەهۆی سەرقاڵی و کاروباری سیاسییەوە نەیپەرژاوەتە سەر گۆڤارەکە، کاروباری گەلاوێژی هەموو بە مامۆستا سەججادی سپاردووە و ماوەی دە ساڵ وەك سەرنووسەر لەم گۆڤارەدا چالاکیی کردووە. پاش داخرانی گەلاوێژ، بۆ خۆی لە بەغدا گۆڤاری «نزار»ی بە زمانی کوردی و عەرەبی دەرکردووە، پاش دوو ساڵ ئەمیش داخراوە. ڕۆژنامەگەری ئاسۆیەکی ڕوونی بۆ مامۆستا کردووەتەوە و بە دنیای وێژە و مێژوو و فەرهەنگ و زمان و زاراوەی کوردیی ئاشنا کردووە.

---

١. ئەم بەشی ژیان و ژیوارەمان لە کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی دوکتۆر مارف خەزنەدارەوە وەرگرتووە.

١. ساڵی ١٩٥٢ یەکەمین کتێبی بە ناوی «مێژووی ئەدەبی کوردی» لە چاپ داوە و پاشان بۆ جاری دووهەم لە ساڵی ١٩٧٠ چاپی کردووەتەوە.

٢. ساڵی ١٩٥٦ پاش گەشتوگوزارێك بە شارەکانی کوردستانی باشووردا گەشتنامەیەك بە ناوی «گەشتێك لە کوردستانا» چاپ ئەکات.

٣. ساڵی ١٩٥٩ کتێبی بەنرخی «شۆڕشەکانی کورد و کورد و کۆماری عێراق» چاپ دەکات.

٤. ساڵی ١٩٦٠ کۆی ئەو چیرۆکانەی کە لە ماوەی دە ساڵی تەمەنی گۆڤاری گەلاوێژ چاپ کرابوون، کۆیان ئەکاتەوە و بە ناوی «هەمیشە بەهار»ەوە چاپیان ئەکات.

٥. ساڵی ١٩٦٧ کتێبێك بە ناوی «دەستوور و فەرهەنگی زمانی کوردی» چاپ دەکات.

٦. ساڵی ١٩٦٨ کتێبێك بە ناوی «ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوەی کوردی» چاپ دەکات.

٧. ساڵی ١٩٧٠ کتێبێك بە ناوی «نرخ‌شناسی» چاپ کردووە.

٨. ساڵی ١٩٧٣ کتێبێك بە ناوی «دوو چامەکەی نالی و سالم» چاپ کردووە.

٩. ساڵی ١٩٧٤ کتێبێك بە ناوی «کوردواری» چاپ کردووە.

١٠. ساڵی ١٩٧٨ کتێبێك بە ناوی «دەقەکانی ئەدەبی کورد»ـی چاپ کردووە.

١١. ساڵی ١٩٧٨ کتێبێك بە ناوی «خۆشخوانی» چاپ کردووە.

١٢. کتێبێك بە ناوی «گێتی زیندەوەر». چاپکراوە.

١٣. کتێبێك بە ناوی «مێژووی پەخشانی کوردی». چاپکراوە

١٤. «ڕشتەی مرواری» ئەم کتێبە هەشت بەرگە، بەرگی یەکەمی

ساڵی ١٩٥٧ چاپ کردووە و بەرگی هەشتەمیشی ساڵی ١٩٨٣ کە دوای چاپکردنی بەرگی هەشتەمی ئەم کتێبە، ئیدی کتێبی چاپ نەکردووە.

گەورەیی و خەمخۆریی مامۆستامان کاتێ بۆ دەردەکەوێ کە دەبینین هەموو کتێبەکانی بە زمانی کوردی و لەبارەی زمان و مێژوو و دابونەریتی کوردەوەی نووسیون، ئەمە لە کاتێکدایە کە مامۆستا لە بەغدادا بووە و عەرەبی و فارسیشی چاك زانیوە، بەڵام چونکە لە خەمی گەلەکەیدا بووە هەر بە زمانی گەلەکەی نووسیویەتی.

**شێوازی نووسینی:**

مامۆستا سەججادی شێوازی نووسینی بەگشتی ساکار و ڕەوان بووە. زۆر گرنگیی بە وشە و ڕستە داوە و بەکارهێنانی وشەی ڕەسەنی پێ خۆش بووە. لە زۆربەی زاراوە کوردییەکان کەڵکی وەرگرتووە و بەپێی شوێن، شێوازی نووسینی گۆڕیوە. بۆ نموونە، شێوەنووسینی لە «مێژووی ئەدەبی کوردی»دا وایە کە لە سەرەتای باسی هەر شاعیرێکدا، زۆر ئەدیبانە پەخشانێکی سەرواداری ئەفراندووە کە خوێنەر ئەخاتە زەوقەوە، هەروەها لە «شۆڕشەکانی کورد»دا پەخشانێکی حەماسی و هەڵنانیی هەیە. لە «گەشتێك لە کوردستانا» پەخشانێکی شاعیرانە و تەوسیفیی هەیە. لە «هەمیشە بەهار»دا چیرۆك نووسێکە هەندێ جار ڕۆمانتیك و جارجاریش ریالیستانە دەنووسێ. لە «ڕشتەی مرواری»شدا پەخشانێکی گشتپەسەندی هەیە کە خوێنەری لێ ماندوو نابێ. بە گشتی مامۆستا سەججادی ئاگای لە پێنووسەکەیەتی، ئەزانێ چۆن و چی لە کوێ بنووسێ.

## ڕشتەی مرواری:

ئەدەبی گاڵتەوگەپ، شیعرێك، چیرۆکێك، یان بەسەرهاتێکە کە بە شێوەی گاڵتەئامێز باس بکرێت نەك تەنیا بۆ پێکەنین و بەس؛ بەڵکوو هەندێجار دەتوانێ بگرییێنێ، یان مرۆڤ داچڵەکێنێ، یان پەند و ئامۆژگاریی لێوەربگیردرێ، یان نوکتەی زمانەوانی و ئەدەبیی تێدا بێ، یان ڕووداوێکی مێژوویی لێوە دەرکەوێ، یان زۆر شتیتر. ئەم شێوە نووسینەش لقێکی ئەدەبە و لە ئەدەبیاتی کوردیدا بەداخەوە کاری کەمی لەسەر کراوە و بەڵکوو فەرامۆشیش کراوە. مێژووی ئەدەبی گاڵتەوگەپ مێژوویەکی کۆنی هەیە لەناو گەلانی خاوەن ئەدەبدا. لە ڕۆژئاوادا مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش سەدەکانی ناوەڕاست، کە لەلایەن شاعیران و نووسەرانی یۆنان و ڕۆمەوە کاری بۆ کراوە. لەناو عەرەبەکانیشدا یەکەمجار لە سەدەی دووەمی کۆچییەوە لەلایەن جاحیزەوە سەری هەڵداوە و دوو کتێبی «الحیوان» و «البخلاء»ی بەم ئەدەبیاتە نووسیون. پاش ئەو، ئیبنوقوتەیبەی دینەوەری (کە زانایەکی کورد بووە) کتێبی «عیون الأخبار»ی دانا و دواییش ئیبنوعەبدی ڕەببە کتێبی «عقد الفرید»ی دانا. لەناو فارسەکانیشدا یەکەمجار عەتتاری نەیشابووری کتێبی «الهی‌نامە»ی دانا و پاشان عوبەیدی زاکانی چەندین بەرهەمی بەم شێوە نووسین.

لەناو کوردیشدا ناتوانین بڵێین ئەم جۆرە ئەدەبیاتە نەبووە، چونکە هەموو نەتەوەیەك پێویستی بەم جۆرە ئەدەبە هەیە؛ چونکە وەکوو زانایانی لۆژیك پێناسەی مرۆڤ ئەکەن و ئەڵێن: مرۆڤ لەگەڵ ئەوەدا کە گیانلەبەرێکی ئاخێوەرە، تەنیا گیانلەبەرێکیشە کە پێدەکەنێ؛ کەواتە پێکەنین تایبەتمەندییەکی مرۆڤە و لێی جیا نابێتەوە و هەردەم

پێویستیەتی. یەکێك لە کارەکانی ئەدەبی گاڵتەوگەپیش هێنانە پێکەنینە، ئەم کارەش دەم‌بەدەم و چین‌بەچین هەر بووە و گێڕدراوەتەوە؛ بەڵام هەروەك بەگشتی ئەدەبیاتی کوردی لە بێ‌خاوەنیدا کۆنەکراوەتەوە و هەندێکی فەوتاوە، ئەمیش هەر بەو دەردە چووە و مێژوویەکی تەواو نییە بە دەستەوە کە کەی و لەلایەن کێوە یەکەمجار سەری هەڵداوە. ئەڵماس‌خانی کەنوڵەیی (١١١٨ - ١١٩١ کۆچی مانگی) پارچە شیعرێکی گاڵتەئامێزی بە ناوی مشك و پشیلەوە هەیە کە زۆر جوان و بەهێزە. هەروەها میرزا عەبدولقادری پاوەییش (١٢٤٠ - ١٣٢٦ کۆچی مانگی) پارچە شیعرێکی بەناو «کولە و ئاینەمەل» هەیە کە باسی شەڕی عوسمانی و سەفەوییەکان ئەکات؛ بەڵام بە شێوەی کتێبێکی سەربەخۆ، پێش مامۆستا سەجادی بە زمانی کوردی شتێك نەنووسراوە، هەرچەند مامۆستا موحەممەدی خاڵ شتێکی کەمی کۆکردبووەوە و لەم دواییانەدا بە ناوی «لە سەرگوزەشتەکانی ژیان» لە چاپ درا، بەڵام زۆر کەم بوو. کەواتە ئەتوانین بڵێین مامۆستا سەجادی یەکەم کەسە کە ئەدەبی گاڵتەوگەپی کوردیی لەچاپ داوە.

[ڕشتەی مرواری جیا لەوەی کە کۆمەڵەیێکی ئەدەبییە، نموونەیەکی ڕەنگاوڕەنگە لە هزر و فیکری کۆمەڵگای کوردی. لەم بەرهەمە بەنرخەدا لە زمانی خەڵکێکی ئاسایی و زۆرجار نەخوێندەوارەوە، پەند و قسەیەك دەبیسین کە لەوانەیە زۆر لە زانا و فەیلەسووفان بۆ تێگەیشتنی، مێشکیان سواوە و هەم خۆیان و هەم خەڵکیان وە تەنگ هێناوە و لە ئەنجامدا نە خۆیان تێگەیشتوون، نە خەڵکی؛ کەچی نەخوێندەوارێکی ڕەمەکی بە زمانێکی ساکار و پاراو و لە ناخی دڵێکی بەکوڵەوە بەبێ ئەوەی ڕێ بدا زمان، بیری ئاڵۆز و شێواو کا، دەیڵێتەوە.

لە زۆر شوێندا پەندی زۆر جوانمان دێتە بەرچاو کە بەڕاستی دەبێتە زاخاوی مێشك. ساکاریی ئەم قسانە لە ئاستێکدان کە خوێنەر دەباتە ناو دەریای بیر و ئەندێشەوە. زۆرجار ئەزموونی سەدان و هەزاران ساڵەمان دێتە بەر چاوی دڵ و بیرەوە؛ ئەزموونگەلێك کە وەکوو هەتاو تیشك دەبارێننە سەر ڕێگای تاریك و پڕ لە هەورازی ژینەوە][١].

ئامانجی ڕشتەی مرواری گێڕانەوەی کارەساتە مێژووییەکان و ناوبردنی کەسایەتییە ناودارەکان و ئەزموون و تەجرەبەی پێشینیان و هەروەها گێڕانەوەی باری کۆمەڵایەتیی ناوچەکانی کوردستان و باسکردنی ڕەوشتی دابونەریتی کۆمەڵگای لەمەوپێشی کوردە، کە باسکردن و گێڕانەوەی ئەمانە سوودی زانستییان هەیە و مرۆڤ ئاگاداریی بەسەر زاراوە جیاجیاکانی کوردستان و دەوڵەمەندیی زمانی کوردیدا پەیدا ئەکات، کە مامۆستا لەم کتێبەدا بە ئەمانەتەوە هەموویانی بە شێوەزاراوەی ئەو جێگایە کە ڕووداوەکە، یان قسەکەی تێدا کراوە، هێناوە.

لەوانەیە هەندێ کەس وا هەست بکەن کە مامۆستا سەجادی، شەلم‌کوێرم، هیچ دەسپارێزیی نەکردووە و هەرچیی بەردەست کەوتووە لە چاك و خراپ تێکەڵی کردووە و بەم ئیشەی زەرەری لە ئەدەبی گاڵتەوگەپ داوە و نرخی ڕشتەکەی هاتووەتە خوارەوە! بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ، ئەدەبیاتی فولکلۆری کورد، زۆر ڕاشکاوانەتر ژیان و دابی کۆمەڵگای کوردەواریی ڕاژە و لێك داوەتەوە و مامۆستاش ئەم ئەمانەتەی زۆر بە پارێزەوە گواستووەتەوە، کەواتە ئەگەر ڕەخنەیەك هەبێ، ڕوو لە کلتووری کورد دەکات، نەك لە ئیشەکەی مامۆستا.

---

١. دەقی ناو دوو کەوانەکە بە هەندێ دەسکارییەوە وەرگیراوە لە پێشەکیی کاك فەخرەددینی ئامێدی.

**جیاوازیی ئەم چاپە:**

ئەم چاپەمان لە ڕووی نوسخە چاپکراوەکانی مامۆستا خۆیدا سەرلەنوێ پیتچنی کردەوە و لەسەر ڕێنووسی یەکگرتوو دامانڕشتەوە.

- ئەوپەڕی کۆششمان کردووە کە بەرهەمێکی بێ هەڵەوپەڵە پێشکەشی خوێنەران بکەین، بەم بۆنەوە زۆر پێداگریمان کردووە لە هەڵەگیریدا.

- خاڵبەندی و نیشانە و هێمای ڕێزمانیمان بۆ ئاسانتر خوێندنەوە بۆ داناوە.

- بۆ هەر داستان و بابەت و باسێکی سەربەخۆ، ژمارەیەکمان دانا، تا خوێنەر وەك ڕیفرینسێك بتوانێ کەڵکی لێوەربگرێ و بە ئاسانی بگەڕێتەوە سەر ئەو باسەی کە دەیهەوێت.

- ئەم چاپەمان لەسەر ئیزن و لەژێر چاودێریی بنەماڵەی بەڕێزی مامۆستادا ئامادە کردووە، کە بەڕاستی نەجابەت و گەورەیی خۆیانیان نواند و ئەوپەڕی هاوکارییان لەگەڵدا کردین، زۆر سپاسی ئەدەبدۆستییان ئەکەین و تەمەندرێژییان لە خوای گەورە داواکارین.

لە کۆتاییدا داوا لە خوێنەرانی خۆشەویست ئەکەین وەکوو بەرهەمەکانی تری ئەم ناوەندە، لە هەڵە و کەموکووڕییەکانمان ئاگادارمان بکەنەوە.

**بە سپاسەوە**

**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردستان**

# ڕشتەی مرواری:

کۆمەڵە ئەدەبییەکی هەرە بەنرخە لە فەلسەفە و بیروباوەڕی کوردی، لە قسەی خۆش و نەستەق و لەو دەماخ چاخکەرانەی کە لە ئاسۆی خەیاڵێکی کوردییەوە گزنگیان داوە.

بیری کوردی، قاپیی دڵی خۆی کردۆتەوە؛ بۆنی عەبیری، تێکەڵاوی بای شەماڵی ژیری کردووە و وەکوو ڕووناکیی بەری بەیان، بڵاوی ئەکاتەوە بەسەر دڵی خوێنەرەکانیا.

# سەرەتا

گیتیی ئەدەب، گیتییەکی فراوانە. نامەوێ لەمەوە بدوێم، ئەگەر یەکێك ویستی بە پوختی لێی تێبگا، تەماشای کتێبی «مێژووی ئەدەبی کوردی» عەلائەددین سەججادی بکا؛ بەڵام ئەوە ئەڵێم کە قەومی کورد، نامووسی تەبیعی هەزاران ساڵە هێشتوویەتەوە. هۆی ئەم مانەوەیە گەلێ شت بووە؛ یەکێك لەوانە تەریکی و گۆشەگیری بووە لە عالەمی بێگانە، ئەم سووچەی زمانەکەی بۆ هێشتۆتەوە. ناتوانی قەومێك ناو بنێی بە قەوم، تا زمانی نەبێ. بۆیە بە ئینگلیز وەیا جەرمەن وەیا عەرەب ئەوترێ ئینگلیز، جەرمەن، عەرەب، چونکە زمانیان هەیە. کە زمان نەبوو، قەومیەت نییە. کوردیش تا ئێستە بۆیە ماوەتەوە، چونکە زمانی هەبووە؛ ئەگەر زمانەکەی نەبێ مەفهوومی کورد لە فەرهەنگا نامێنێ.

لە سەرەتای ئەم سەدەی بیستەمەوە، وردەوردە خوێندەواری لەناو ڕەمەکی کورددا پەرەی سەندووە و ئەستێنێ. ئینکار ناکرێ خوێندەواری چرای ژیانە، بەڵام لە لایەکی ترەوە من هەست بە زیانێکی گەورە ئەکەم. لەم ڕووەوە هەست بەوە ئەکەم چونکە خوێندەوارییەکە بە زمانی کوردی نییە، [ڕەنگە] هەتا سەدەی بیستەم بەسەر ئەچێ، قەومی کوردیش نامێنێ. بۆیە ئەڵێم نامێنێ، چونکە مناڵەکە لە قوتابخانەی غەیری کوردی لەباتی وشەیەکی کوردی، فێری وشەیەکی غەیری کوردی

ئەبێ. ئەو وشەیە دێنێتەوە ماڵەوە و قسەی پێ ئەکا، برا بچکۆلەکە و خوشکە نەشمیلەکەی لێیەوە فێر ئەبن. باوکی مناڵەش ئەڵێ کوڕپەلەم فێری زمانی نانپەیداکردن بووە؛ ئەویش وەریئەگرێ. دایکەشی ئەڵێ لە دەورت گەڕێم چەند قسەکانت جوانە؛ ئەویش فێری ئەبێ. بەرەبەرە زمانی قوتابخانەی غەیری کوردی مناڵەکە، شوێن هەوارێکی خۆش بۆ خۆی لە ماڵی باوکی مناڵەدا دروست ئەکا و زمانی مادەرزادی کوردییەکە لە ژێریا دەست ئەکا بە نقەنق. کە پشتێك بەم جۆرە ڕۆیشت، پشتی دووهەم و سێهەم ئەڵێن باو و باپیری ئێمە ـ بەڕەحمەت بن ـ بە زمانێك قسەیان ئەکرد کە پێیان ئەوت زمانی کوردی.

ئەوانەی کە هەست بە قەومییەتی کوردی ئەکەن و هەست بەوە ئەکەن کە «بڤە»یەکی گەورە ئابلۆقەی زمانەکەیانی داوە، ئەگەر تەنها ئەم قسەیە بخوێننەوە، ئەکەونە سەر ئەو باوەڕە کە زیندووکردنەوە و بووژاندنەوەی زمانی کوردی لەسەر قاقەز چە کارێکی گەورە ئەکاتە سەر مانەوەی قەومییەتی نەتەوەی کورد.

هیچ ئامانجێکم نییە، تەنیا پاراستنی زمانی کوردی نەبێ؛ ئەویش بۆ پاراستنی قەومییەتی کورد لەو تەنگوچەڵەمانە کە گەمارۆی داون. دنیای ئێمرۆ وەکوو دنیای دوێنێ نییە. گۆڕانی ئێمرۆ وەکوو گۆڕانی پێرێ نییە، قەومی کورد ئەبێ کۆشش بکا ـ بەبێ جیاوازی ـ بۆ پاراستنی قەومییەتی خۆی. ئەم کۆششە بە خزمەتکردنی زمانەکەی ئەبێ. زمانی خۆت بپارێزە و بە زمانی خۆت بخوێنەرەوە، ئیتر خەمی هیچت نەبێ.

هیتلەر کە یادداشتەکەی «کفاحی» دانا وتی: «ئەم نووسینەم بە زمانێکە گەورەتر، عالمێکی ڕایەخ چۆنی لێ تێئەگا، شوانێکی سەر کێویش هەر بەوجۆرە لێی تێئەگا؛ بە زمانێکە کە زمانی ئەڵمانییە».

منیش هەر ئەوەندە ئەڵێم، ئینجا با بچینە سەر بارێکیتر بۆ من و ئەم کتێبە:

بە بیرەوەریی خۆم حەزم بە قسەی خۆش کردووە و لە بیستنی قسەیەکی خۆش وەکوو هەستم بە دەنگێکی نهێنی خۆش کردبێ، وا بووم. لەبەر ئەوە خۆم لە خۆمەوە هەر ئەگەڕام بەشوێن ئەو قسە و سەرگوزەشتە کوردییانەدا کە لەناو کورددا باو بوون. بەبێ ئەوە بە شتێکیتر بزانم گەلێکیان لە سنگما مانەوە؛ دیسان هەر تێریشم نەئەخوارد، ئەمویست زیاتر ببێت. لە پاشا کە ئەمبینی گەلێکیتر وەکوو من حەز بە قسە و سەرگوزەشتەی خۆش ئەکەن و شوێنی ئەکەون، بەلامەوە سەیر بوو کە ئەمە بۆچ وایە؟ لە پاش ورد کردنەوە تەماشام کرد ئەمانە [ئەو] مەعانییە ڕۆحییانەن کە بە وشە تەعبیریان پێ لێ ئەدرێنەوە؛ ئەمانە ئەو ئەدەبەن کە لەگەڵ سروشتی ئادەمیزاد تێکەڵاو کراون. ئەو وەختە بۆم ساغ بووەوە کە ڕاستە ئادەمیزاد بە بنەچە پابەندی ئەدەبە؛ چونکە ئەدەب خۆراکی ڕۆحەکەیەتی. بۆم ساغ بووەوە کە گەورەیی ئەدەب بناغەی هەموو گەورەییەکە، با هەست بە گەورەییەکانیتریش نەکرێت.

کە چوومە بنج و بناوانی کارەوە دەستم کرد بە خوێندنەوەی شتیتر. تەماشام کرد تەنها قەومی کورد نەبێ، قەومەکانیتر بە هەردوو دەستەوە چوونەتە ژێر ئەدەبیات. هەر جۆرە شتێکیان بووبێت خێرا لاپەڕەی کتێبەکانیان پێ پڕ کردۆتەوە و نەیانهێشتووە ون ببێت. کە ئەمەم بینی وتم ئایا بۆچی شتی وامان نەبووە لەگەڵ ئەو هەموو قسە خۆشانەدا کە هەمانە؟ لەوە زیاتر هیچم بۆ نەدۆزرایەوە کە ڕەنگبێ لەناو ئێمەدا وتەی شوورەیی (عەیبە) نەیهێشتووە هیچ شتێك پێکەوە بنێن. دیارە هەرواش بووە، چونکە زۆرتر ئەو قسە و سەرگوزەشتە خۆشانە تا ئێستە هەروا بە

ڕشخەنێکەوە گێڕاونەتەوە و لەوانە بوون هەر لەگەڵ یەکێك، یەکێکیانی لێ گێڕابێتەوە خێرا لیی هاتبێتنە سەر پێ و «عەیب نییە تۆ ئەم قسە ناشیرینە ئەگێڕیتەوە؟» لەگەڵ ئەوەشدا ئەو قسەیە کە ناشیرین وەیا پێچەوانەی ئەدەب و شەرم دائەنرێ، ئەوە جەوهەری ئەدەب و ئەقڵە و ئەدەب لەوە دروست ئەبێ.

ئەدەب پەردەی ژیانی کۆمەڵە کە شان بەشانی هاتۆتە خوارەوە؛ ژیری و زەینی پیشان ئەدا، ڕابواردن و هەڵسوکەوتیان ئەخاتە ڕوو. ئەو پارچە قسانە وەکوو لە ڕواڵەتا ساویلکەن، لە مەعنادا زۆر شت ئەگەیەنن. ئاسمانی مەعنایان گەلێ بەرزترە لەو ئاسمانە کە تیایانا دەرئەکەون.

قەومەکانی تر هەموو شتێکیان وتووە و نووسیویانەتەوە، ئیتر چاك بووبێتن یا خراپ نەیانهێشتووە سەریان تیا بچێ. منیش لەبەر ئەمانە هاتم لەم سەرگوزەشت و پەندانە بە ئەندازەی دەسەڵات، وە بگرە زیاد[تر لە] دەسەڵاتیشم لێ کۆ کردنەوە و حەزم کرد لەم ڕەوشەوە کتێبێکمان ببێت.

ئەزانم سەرەتا لەوانەیە زۆر کەسی لێ بکەوێتە تەقەوە و بڵێ: قسەکان بێشەرمی و پێچەوانەی ئەدەبی دیوەخانانە؛ نەئەبوایە شتی وا بنووسرایە. منیش هەقیان ئەدەمێ؛ چونکە هەموو شتێك لە سەرەتاوە لەبەر ئەوە تازە کورەیە، بەرهەڵستی بۆ پەیدا ئەبێ؛ بەڵام لە پاش ماوەیەك ئیمان بەوە دێنن کە سووچێك لە ئەدەبی ونبووی کوردی زیندوو بۆتەوە و دارمێخەکی سیسی ئاو لێبڕاو گەشێنراوەتەوە. ئەمە و دیسان ئەڵێ:

کابرایەك نوێژی نیوەڕۆی ئەکرد وتی: «نیەتمە هەشت ڕکات نوێژی ئەم نیوەڕۆیە ئەکەم». کە لێبووەوە مەلا پێی وت: باوکم نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکاتە، کەی هەشت ڕکاتە؟ نوێژەکەت بکەرەوە. ئەویش پێی وت:

«مامۆستا، من هەشت ڕکاتم کردووە، خوا تێکەوێ چواری چاکی بۆ خۆی هەڵبژێرێ و چوارەکەی‌تری بداتەوە بەسەر خۆما». ئێستەش ئەم کتێبە هەرکەس ئەیخوێنێتەوە ئەوەی چاکە بۆ خۆی هەڵبژێرێ و ئەوی خراپە بیداتەوە بەسەر خۆما.

دیسان ئەیڵێمەوە: کاکی کوردی خۆشەویست! تووڕە مەبە بۆ نووسینەوەی ئەم کتێبە؛ میللەت وەکوو باخی پادشاهانە، گوڵی چاکیشی تێدایە و هی خراپیش. لە گەورەتر کتێبی ئەدەبیاتی عالەمی عەرەبی «الأغانی، ابوفرج أصفهانی» و «عقد الفرید، ابن‌عبدربّە»یە، ئەم کتێبانە عالەمی ئیسلامی و غەیری ئیسلامی دانیان پیا ئەنێن کە شاکتێبی ئەدەبن، ئەمە بێجگە لە «المستطرف فی کلّ فن مستظرف»ی شەهابەددینی ئەحمەدی ئەبشەهییە. ئەگەر بە پوختی چاوێك بەوانەدا بخشێنی بۆت دەرئەکەوێ ئەوانەی من لەم کتێبەدا نووسیومن، شوورەییەکەیان نەگەیشتۆتە شوورەیی هەندێ لەوانەی کە لەوانا نووسراون. ئەم قسانەی ئێرە وەکوو شوێنانی‌تر هەریەکە دەورێك ئەگێڕنەوە: هەم ئەدەبە؛ کە ئەدەب پەردەی ژێریی تاك و کۆمەڵ ئەگێڕێتەوە. هەم بۆنێکە بۆ دەماخ کە بۆنی دەماخ لەززەتی ڕۆحییە.

عەلائەددین سەججادی

١٩٥٢/٣/٢٤



# سەرنجێک

ئەبێ ئێمە ئەوە بزانین کە لەناو کوردا «مەلا» دەستەیەکی دیاری و ئاشکرا بوون؛ بەرەی خوێندەوار و زانیار هەر ئەوان بوون. لە هەموو وەختێکا و لە هەموو شوێنێکا بە پەنجە، پەنجەیان بۆ ڕاکێشراوە. ئەم دەستەیە لەناو مەردما تا ئەو پەڕی، بە چاوی گەورەیی و ڕێز لێ‌گیراوییەوە تەماشا کراون. لە ئیشی بچووك و زلدا پرس بەوان کراوە و ئەوان بڕیویانەتەوە.

تەنانەت ناوی «مەلا» بە جۆرێك بەرز بووەتەوە، ناوی هیچ چینێکی‌تر نەبووە بەرانبەری بەناوی ئەوان بکا. لەبەر ئەمە ناوی ئەمان لەسەر زمانی گەورە و بچووك بووە. فەرمانێ کە ئەمان دابێتیان گێڕانەوەی نەبووە. جا بەمبۆنەوە هەچ کار و فرمانێك بووبێت دراوەتە پاڵ ئەوان و وتوویانە «مەلا وای وتووە» یا «مەلا وتی». [وتنی] ئەم ناوە لەسەر زمانی خەڵك، هەمووی نیشانەی خۆشەویستی و گەورەیی ئەوان بووە. وەکوو چۆن لە ماڵێکا خێزان و ماڵ و منداڵی ئەو ماڵە هەرکامێکیان هەستن و هەر قسەیەك بکەن بۆ ئەوە کە ئەو ئیشە ئیتر کێشەی تێدا نەبێ هەر ئەڵێن «باوکم وای وت» یا «باوکم وتی»؛ دیارە ئەم ڕستە نیشانە و بەڵگەیە بۆ گەورەیی باوکەکە لە بەرچاوی خێزانەکەوە. وتنی ناوی «مەلا»یش لە بەرچاوی تێکڕای مەردمەکەوە ئەم سەمەرەیە بووە، بۆیە لە زۆر شوێنی سەرگوزەشت و قسەی کوردیدا وشەی «مەلا» پاڵەوانی سەرگوزەشتەکەیە.

# قسەی نەستەق

١. «خلك»ی «مصطفی»ی «پیروەیس» ڕیش سپییەکی هۆزی «شاتری» بوو لە عەشرەتی جاف. قسەکانی هەموو دانسقە بوون. ئەمە یەکێکە لەو قسە بەنرخانەی کە ئەڵێ: «قسە بیگێڕە، بیبێژە، بیوێژە».

٢. هەمەوەن دابوویان بەسەر خێڵێکی جافدا، هیچیان بۆ نەهێشتبوون. پیاوێکی خێڵەکە لە چنگیان دەرباز بووبوو، لەسەر حەوزەکەی مزگەوتی مەلا حسێنی پیسکەندی لە سولەیمانی دەموچاوی ئەشوا. ئەم کارەساتەش بڵاو ببووەوە بە سولەیمانیدا. لەو کاتە مەلا حسێن لە کابرا ئەپرسێ: ها برا! چی هەیە؟چی نییە؟ کابرای جافەش ئەڵێ: «برا چی ببێ؟ پیاو بوو کوژیا، ماڵ بوو بریا، دێ بوو سووتیا، ئیتر چی ما؟»

من قسەی ئەم پیاوە جافەم گەلێ لە قسەی ئەو پیاوە بوخارایییە پێ جوانترە کە لە ٦١٦ی هیجریدا چەنگیزخانی مەغۆلی شاری بوخارای سووتاند و خەڵکەکەشی کوشت؛ ئەم هەڵهات. لە ڕێگەدا باسوخواسیان لێ پرسی، وتی: «آمدند و کندند و سوختند و کشتند و بردند».

٣. «عەزیری مەسرەف» لە دیوەخانی شای ئێران ناسرەددین شادا ئەبێت. شا ئەپرسێ: ئاغا! زووتر ئەسپی چاکت هەبوون

چییان لێ‌هات؟ ئەویش ئەڵێ: «شاهم، خاوەنی خۆیان سواریان بوون و ڕۆیشتن». شا ئەم وەڵامەی پێ خۆش ئەبێ.

٤. جارێك مەولەوی لە شاری سنە لە کۆڕێکا دائەنیشێ. لێی ئەپرسن ئەڵێن: تۆ هەر ئەڵێی هۆزەکەم خۆشیان ئەوێم، بە گەورەم دائەنێن؛ بە چییا پیشانی ئەدەی کە ڕاست ئەکەی؟ ئەویش ئەڵێ: خۆ ئەگەر هیچ نەگێڕمەوە ئەوە بۆ من بەسە کە هەورامییەك بارێکی ئێجگار گران لە کەرەکەی ئەنێ و ئەیەوێ بەسەر کێوی «ئاریز»دا سەری خا، کەرە مان ئەکا و ناڕوا. پێی ئەڵێ: «هەچە دەی هەچە! بەخوا ئەگەر مەولەویش بیت هەر سەرت ئەخەم».

٥. خانزادەخانی هەریری وتوویە: «لە دەوری ئەو پیاوە ئەگەڕێم کە بەنەخوێنەکەی درێژە و بەنی کاڵەکەی کورت».

٦. مەحموودی نادری شاتری هەبوو، منالی نەئەبوو. لە دەمەدەمی پیریدا ژنێکی تری هێنابوو، دوو کوڕی بووبوو. لێیان پرسی: خاڵە مەحموو منالت هەیە؟ وتی: «بەڵێ دوو کوڕم هەیە؛ بەڵام داخی گرانم دایکیان ئەگێن، لەوانە نین دایکی منالی خەڵکی بگێن». مەبەستی ئەوەبوو من پیرم، ئەمرم و دایکیان مێرد ئەکاتەوە.

٧. پاشاکۆرەی ڕەواندز لە جەنگدا بوو، فەرمانی دابوو کەس چرا نەسووتێنێ. شەوێك خۆی گۆڕیبوو، بۆ تاقیکردنەوە بەناو شارا ئەسووڕایەوە. سەیری کرد وا لە دوورەوە لە بنەبەردێکا سووسەی ڕووناکییەك دێت. کە چوو تەماشای کرد، ئەوا مۆمێك ئەسووتێ و ژن و پیاوێك لە بەریەوە دانیشتوون گەمەوگاڵتە ئەکەن. پیاوەکەی بانگ

کرد، پێی وت: ئایا ئەمناسی؟ وتی: بەڵێ.

وتی: ئەی گوێت لەو فەرمانە نەبووە کە وتوومە یاساغە بە شەو چرا داگیرسان؟ وتی: «بەڵێ گوێم لێ بووە، بەڵام ئەمە چوار ساڵە لەگەڵ ئەم کچەدا دڵمان پێکەوەیە تا ئێستە بۆمان ڕێنەکەوتووە پێکەوە دانیشین. ئیمشەو بۆمان ڕێکەوتووە وا پێکەوە دانیشتوین. ئێستەش پاشاسوورە کە هەستا، نە گوێ بە پاشاکۆرە ئەدا نە بە پاشای ساغە». پاشاکۆرە کە ئەمەی بیست، دەست ئەکا بە پێکەنین و ئەڵێ: «بڕۆ هەموو شەو هەر لە خۆشیدا بن».

٨. مەلا فەتاحی خەتێ لە دیوەخانی پاشاکۆرەی ڕواندز ئەبێ. کابرایەك دێت ئەڵێ: پاشا، یەکێ لە پیاوەکانی تۆ گایەکەم هەبوو لێی زەوت کردم. مەلاش ئەڵێ: «برا ئەگەر پاشا مەزرەعەی ڕۆژی دوایی خۆی بە گای هەژارێکی وەکوو تۆ نەکێڵێ چی بکا؟» پاشا ئیتر فەرمان ئەدا گاکەی پێ ئەدەنەوە.

٩. مەلا ڕەسووڵی تەلانی هەبوو لە سولەیمانی ئەمناسی. کتوپڕ نەخۆش کەوت. سەرەتا بۆم ڕێنەکەوت بچمە لای، بە ئیمڕۆژ و سبەی دوام خست. لە پاشا کەوتمە تەقەوە هەر نەچووم. مەلا ڕەسووڵ لە نەخۆشییەکەی چاك بووەوە و هەستایەوە. ڕۆژێ چاوی پێم کەوت و گلەیی لێ کردم کە لە نەخۆشییەکەیدا نەچووم بۆلای. منیش زۆر شەرمەزار بووم، هیچم پێ نەما، وتم: «مەلا ڕەسووڵ خوا ڕووی مردن ڕەش کا، وا منی شەرمەزاری لای تۆ کرد».

١٠. بۆ بەغدا ئەهاتم، کە گەیشتمە جێ، مەلا مەحموودی وەتراخچی وەڵامی بۆ ناردم وتی: «بەو ناو و نیشانەی کە ڕۆیشت و چاومان

پێ‌نەکەوت، سەلامی لێ ئەکەم». منیش وەڵامم بۆ ناردەوە وتم: «بەو ناو و نیشانە کە هاتم و چاوم پێ‌نەکەوت، سەلامی لێ ئەکەم».

۱۱. ژنێکی مەنمی کوڕێك و برایەك و مێردێکی ئەبێ؛ هەرسێکیان لەلایەن حکوومەتی ئێرانەوە ئەگیرێن و فەرمانی خنکاندنیان ئەدرێ. ژنەکە لەبەر «دارقەواخ»ـەکەدا کە بۆ ئەوانە هەڵخرابوو ئەوەستێت و بێهۆش ئەکەوێ. حاکم ئەنێرێ ئەیهێنن، ئەڵێ: ژنەکە یەکێ لەم سێ کەسەت پێ ئەبەخشم، جا بۆ خۆت یەکێکیان هەڵبژێرە. ژنە خێرا ئەڵێ: «براکەم».

حاکم ئەڵێ: بۆچ براکەتت هەڵبژارد؟ کوڕ بەو خۆشەویستییە و مێرد بەو نازدارییە گوێت نەدانێ؟ ئەویش ئەڵێ: «جەنابی حاکم، سبەینێ ئەچم مێردێکی‌تر ئەکەم، ئەوە مێردەکەم. کوڕێکیشم ئەبێ ئەوەش کوڕەکەم؛ بەڵام تازە باوك و دایکم زیندوو نابنەوە برایەکی‌ترم بۆ بێنن». حاکم کە گوێی لەم وەڵامە ئەبێ، هەرسێکیانی پێ ئەبەخشێ.

۱۲. لە کابرایەکی کوردیان پرسی بە چیدا ئەزانی خوا یەکێکە و دوو نییە؟ ئەویش وتی: «بە ئاشەکەی ماڵی لالەما؛ تا ئەو وەختە کە هەر خۆی بوو دایمەگەڕ بوو، ئێستە کە لەگەڵ حەمەی شەفێ بوون بە شەریك، ڕۆژێك ئەگەڕێ و چوار ڕۆژ ئەوەستێ. خواش ئەگەر یەکێکی‌کەی لەگەڵ بوایە ئیشەکەی وەکوو ئاشەکەی لالەمی لێ‌ئەهات».

۱۳. کابرایەکی موکری لەگەڵ ژنەکەیا دانیشتبوون لە گوێ ئاگردانەکەیانا، کلووی بەفر ئەهاتە خوارەوە. دوو چیلکەیان کردبووەوە بە ئاگر و کزوڵەیان کردبوو لە بەریا. ژنەکە لە پیاوەکەی پرسی: «ئەرێ پیاوەکە! ئێمە باش ڕائەبوێرین یا عەزیزخانی سەردار؟» پیاوەکەش

پێی وت: «ژنەکە، عەزیزخان چاك ئەخوا، بەڵام ئێمە چاك ئەکەین».
وەڵامەکەی دوو سووچی هەیە.

١٤. قازی خدروەیس لە ئاڵیبەگی، پیاوێکی دانا بووە، لێی ئەپرسن: «شاسوار کوڕی تۆیە؟» ئەویش ئەڵێ: «من باوکی ئەوم».

١٥. سمایلیحەمەجان هەندێ توتنی هەبوو، مەجیدی خوشکەزای لێی دزیبوو. سمایل چوو سۆراخی توتنەکەی لە مەجید پرسی، مەجیدیش وتی: «خاڵە، توتن دزیاگ و خاوەن توتن و توتن بریاگ یاخوا بە کۆی زوخاڵ بێ؛ دزیش بەڕێی خۆی». سمایلیش وتی: «توخوا برا سوێن مەخۆ، ئیتر دڵم بوو بە ئاوێنە».

١٦. بەگێك تلیاکی ئەکێشا. ڕۆژێ دابووی لە سەری، ڕووی کردە حەمەڕەحیمی پیاوی وتی: «حەمەڕەحیم ئێستە ئەگەر هەزار لیرەم ببوایە، پێنجسەد لیرەم ئەدا، پەنجا ئەسپ و تفەنگ و پەنجا پیاوم سوار ئەکرد و ئەمخستنە پشت سەری خۆم، ئەچووین بۆ تاران بایی پێنجسەد لیرەکەیتری تلیاکمان ئەکڕی و ئەهاتینەوە». حەمەڕەحیمیش وتی: «وەڵڵا میرم، ئەگەر مژێکیتر لە بافوورەکە بدەی هیچ سواریشت ناوێ، هەر خۆت ئەچی ئەیکڕی و دێیتەوە».

١٧. کابرایەك بوو بە میوانی ماڵە کوردێك. نانیان دانا، چێشتەکە زۆر گەرم بوو. کابرای میوان هەموو دەمودانی سووتا. لە تاوانا سەری بەرز کردەوە و سەیرێکی دارەڕای خانووەکەی کرد، بۆ ئەوەی خاوەنماڵەکە هەستی پێ نەکا، پێی وت: «ئەرێ برا ئەم خانووەت بە چەندی دروست کردووە؟» کابرای خاوەنماڵیش وتی: «بە دوو فوو و سەبرێك».

١٨. لە سەرەتای ساڵی (١٩٥٠)دا مزاحم ئەمین پاچەچی نائیب ڕەئیس‌وزەرای عێراق بوو. من عەمرم ٣٥ ساڵێك ئەبوو، زیاتر لە دوو بەشی مووی سەرم سپی بووبوو. بە چەند ساڵێکی کەم لە پێش ئەم تاریخەدا چاوی پێم کەوتبوو. لەم تاریخەشا دیسان لە شوێنێك یەکمان گرت. عادەتیشی وابوو بە دانەدانە قسەی ئەکرد. پێی وتم: «مَا كُنتُ أَتَأَمَّلُ أنْ أرىٰ رَأْسَكَ هٰكذا عاجلاً؟». منیش کتوپڕ پێم وت: «أَفْرَدَنِي الدَّهْرُ و أَلَّمَتْنِي الْمَصائبُ فَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْباً».

١٩. لە شار قوڕیان ئەپێوا. کابرایەکی کورد بەوێدا تێپەڕی، پرسی ئەوە چییە؟ وتیان: «شا مردووە» وتی: «ئۆ! خۆزگەت پێ نەوێ، ئەو «مێ» ئەمرێ، ئێستە ئێژی شا مردگە». «مێ» مەڕە.

٢٠. ئەحمەدبەگی فەتاح‌بەگی ئەرازی، پیاوێکی بۆشناخ و بەدەمار بوو. بە پێچەوانەی ئەو، فەتاح‌بەگی باوکی پیاوێکی ساویلکە و بێ‌دەمار بوو.

ڕۆژێك ئەحمەدبەگ ئەڵێ: «بابە، ئاخر تۆ بۆچی وا لەگەڵ هەموو کەسێکا هەڵسوکەوت ئەکەیت و خۆت ئەکەی بە هاوشانی هەموو کەس؟ ئاخر تۆ نازانی من کوڕی تۆم؟» باوکیشی ئەڵێ: «ڕۆڵە، من ئەزانم تۆ کوڕی منی، بەڵام تۆ نازانی کە من باوکی تۆم».

٢١. ڕەسووئاغای مەنگوڕ هەموو ئیشێکی خراپەی ئەکرد و جارجاریش ئەچوو نوێژێکی ئەکرد. پێیان ئەوت ئاغا ئەوە ئەو نوێژە بۆچ ئەکەی؟ ئەیوت: «کوڕە نەوەك ئەم مەلایانە ڕاست بکەن کە ئەڵێن ڕۆژی قیامەت هەیە، با ئەمەشم بەدەستەوە بێت».

٢٢. بە مەلا قادری بیارەیان ئەوت «مەلای گەورە» و بە کتێبخانەکەشیان ئەوت «کتێبخانەی مەلای گەورە». ئەم قسەیە لەناو خەڵکا بڵاو بووبووەوە. ڕۆژێک دوو کورد بە تامەزرۆیی ئەچن مەلای گەورە ببینن بزانن ئەمە بە ئەندازەی چەند کەس ئەبێ، وا هەموو کەس پێی ئەڵێ مەلای گەورە. بەم نیازە چوونە «بیارە» و چوونە ناو خانەقاوە. کە چوون هەر چاوەچاویان بوو بۆ ئەوە زەلامێکیان بە ئەندازەی فیلێک بەرچاو بکەوێ. هەر بەرچاویان نەئەکەوت، لەگەڵ ئەوەشا «مەلا قادر» دووسێ جار بە بەرچاویانا تێپەڕیبوو، بەڵام هیچی لە خەڵکیتر زیاتر نەبوو؛ گوێیان نەدابوویێ و نەیانناسیبوو. لە ئاخرا ئەپرسن: «ئەرێ برا مەلای گەورە کامەسە؟» ئینجا یەکێک مەلای گەورەیان پیشان ئەدا، کە ئەچن و سەیری ئەکەن واقیان وڕ ئەمێنێ، ئەڵێن: «ئەرێ کوچکت لێ نەوارێ خۆ ئەمە هەروەکوو ئێمە واسە. ئەی بۆچی ئێژن مەلای گەورە! مەلای گەورە؟!».

لەپاشا ئەڵێن دەبا بچین کتێبخانەکە ببینین بزانین ئەو چۆنە؟ ئەچن و کتێبخانەیەکی زۆر گەورەیان بەرچاو ئەکەوێ و کتێبێکی ئێجگار زۆری تێدا ئەبێ. هەروا سەیری ئەکەن، ئینجا یەکێکیان ڕوو ئەکاتە ئەویکەیان و ئەڵێ: «لفتە، ئەزانی ئەم کتێوانە گشتی ئێژن چی؟» ئەویش ئەڵێ: «ئێژن چی؟» گشتی ئێژن «خاس بکە و خراو مەکە؛ دە بێ وەڕێوە، بێ وەڕێوە ئێترا».

٢٣. شەوێک لە نیوەشەوا کابرایەک بە کۆڵانێکا ئەڕواتەوە بۆ ماڵی خۆی، تەماشا ئەکا زەلامێک دیواری ماڵێک ئەکەنێتەوە. کابرا ئەپرسێ: کوڕە کابرای کوردە، ئەوە چی ئەکەی؟ ئەویش ئەڵێ: «دەهۆڵ

لێ ئەدەم». ئەڵێ: ئەی بۆچ دەنگی نایە؟ ئەویش ئەڵێ: «بەیانی گوێت لە دەنگی ئەبێ»!.

٢٤. لە شەڕی (١٣٣٦)ی هیجری کە شەڕی ڕووس و تورك کرا، چەند کەسێ لە عولەما بۆ ئەوە خەڵك بنێرن بۆ شەڕ، چووبوون بۆ ناو عەشیرەتی «مەنگوڕ و مامەش». لە دیواخانی حەماغای مامەش، ڕەئیسی عەشیرەتەکان وەکوو هەمزەئاغای مەنگوڕ و حەمەمین‌ئاغای بڵباس و هی‌تریش کۆ ئەبنەوە. یەکێ لە مەلاکان وەعزیان بۆ ئەخوێنێ، ئەڵێ: ئەمە غەزایە و پێویستە لەسەر موسوڵمان بیکا. هەرکەس بچێ، ئەگەر بکوژرێ شەهیدە، پایەی شەهادەت زۆر گەورەیە؛ خۆ ئەگەر نەشکوژرێ ئەبێ بە غازی، پایەی غازیش دیسان زۆر گەورەیە. کە مەلا لێ‌ئەبێتەوە، کوێخایەکی بڵباس هەڵئەستێ و ئەڵێ: «مامۆستا، ئەگەر خوا ئارەزوو بکا هەرچی ڕووس هەیە بە سەعاتێك ناتوانێ بیانکوژێ؟» مەلا ئەڵێ: بەڵێ ئەتوانێ. کوێخا ئەڵێ: ئینجا خوا کە خۆی پێی ئەکرێ بۆچی خۆی هەموویان ناکوژێ و بۆچ فیتنەکە بە ئێمە ئەگێڕێ؟»

٢٥. خدری میروەیس کابرایەکی جاف بوو. یەکێك لە قسە جوانەکانی ئەوەیە ئەیوت: «لە پەرچ ئەوبەر لە قوڕ ئەو دەر»؛ واتە لەناو بێشەڵانا لە پێشەوە بە، لەناو قوڕا لە دواوە.

٢٦. ساڵێك بوومەلەرزەیەك لە پێنجوێندا کەوت، کابرایەکی ترسنۆك بە پیاوێکی گەورەی وت: «ڕەنگە لە بوومەلەرزەکە زۆر ترسابێتی و لەرزیبێتی». کابرا وتی: «بەڵێ، بەڵام زەوییەکە لە منیش و لە تۆیش زیاتر ترسا و لەرزا».

**٢٧.** ڕۆژێـک سوالّکەرێك چووە مالّێـك، ژنی مالّەکـە هیچی پێ نەبوو بیداتـێ. مێردەکـەی تازە کەوایەکـی گولّسـورمەیـی بـۆ کڕیبوو، کەواکەی داکەند و دای بە سوالّکەرەکە. دوو جار ئاخی هەلّکێشا و وتـی: «زۆرم بەزەیـی بـە هـەژاردا دێتـەوە. نازانـم ئەمانـە بـۆچ ئەبن بە سوالّکەر؟» هەژارەکـەش وتی: «خانم، منیـش وەختێ دەولّەمەند بووم، هەرچیم هەبوو وەکوو تۆ دام بە سوالّکەر هەتا گەیشتم بەم ڕۆژە».

**٢٨.** کابرایەکی کورد ژنێکی هێنا ناوی «لەیلا» بوو. ڕۆژێك شەڕی لەگـەلّ مێردەکـەی کـرد؛ مێـردە دەنگـی نەکـرد. ڕۆژێکیتـر هەندێ شتومەکی شکاند هەر دەنگی نەکرد. جارێکیکە دیسان کاسە و کەوچکەکانـی بەملاوبـەولادا بـلّاو کردەوە و فڕێـی دان. کابرا ئیتر پێی هەلّنەگیرا گەلێ جنێوی دایـێ.

ژنەکـە وتـی: «پیاوەکـە لە بیرت دێ کـە تازە هێنابووتم، بانگت ئەکرد لەیلا لە خۆشیانا گەزگەز بالّات ئەکرد؛ کەچی ئێستاکە جنێوم پێ ئەدەی؟» کابرا وتی: «ژنەکە ئێستاکە تێگەیشتووم کە ئەوسا چەندە شێت بووم».

**٢٩.** کابرایەکی کورد میوانی مالّێك بوو، شـەو لە دوای نان‌خواردن بـە خانەخوێکـەی وت: دەمم تالّە، ئەگەر هەیە شیرینییەکم بۆ پەیدا کە. خانـە خۆێکە وتی: خورمامان هەیە و مێوژیشمان هەیە، کامیان ئارزوو ئەکەی بۆت بێنم؟ کابراش وتی: «خورمژ».

**٣٠.** شێخ‌ڕەزا و وەسمان‌پاشای جاف ئەکەونە شەڕەشیعر. شێخ‌ڕەزا بە شیعر دەست ئەکا بە قسە وتن بە وەسمان‌پاشا. وەسمان‌پاشاش ئەلّێ: «شێخ ڕەزا، شێخ‌ڕەزا من شیعر و میعر نازانم، وە کوردی هەردوو گونم وە قنگت».

**.٣١** کابرایەکی لەیلاخی تووشی کابرایەکی گەڵباخی بوو، لێی پرسی: «برا ناوت چەس؟» وتی «یووسف». ئەمیش پێی وت: «برای عازیز یوڵفس فرە خاسی شوکر، توخوا برا ناو باوکت چەس؟» ئەویش پێی وت: «وە ڕیش باوکتەوە ناوخۆمت خاس زانی، جا نۆرەی ناو باوکمە».

**.٣٢** دوو پیاوی دەوڵەمەند لەسەر ملکێکی بەنرخ کێشەیان ئەکەوێتە بەینەوە، ئەچنە لای مەلایەك بۆ شەرعکردن. یەکێکیان دوو مەن ڕۆن بۆ مەلا ئەبا و ئەڵێ: مامۆستا تۆزێ ئاگادار بە. لەدوای ئەو پیاوەکەیتریان ئێسترێك ئەبا هەر بۆ مەلا، ئەڵێ: مامۆستا تۆزێ وریا بە. سبەینێ کە ئەکەونە شەرعەوە، کابرای خاوەنڕۆن سەیر ئەکا مەلا شەرعی بەلای ئەویتر دا. لە دڵی خۆیا ئەڵێ نەوەك مەلا لێی گۆڕابێ، وابزانێ ئەو کابرایە ڕۆنی بۆ بردووە، ئەڵێ: «مامۆستا، ئەوە داوێنی کەواکەت ڕۆنی پیا ڕژاوە؟» مەلایش سەیرێکی داوێنی ئەکا و ئەڵێ: «نە؛ ئێستر پێی پیا ناوە».

**.٣٣** پیرێژنێکی کورد هەبوو لە ژوورەکەی خۆیا لەبەر قاپییەکە خەریکبوو دووخی ئەڕست. وردەوردە بە دەمیەوە لەنگەرییەك قاوتیشی لە تەنیشت خۆیەوە دانابوو بە لوێچ ئەیکرد بە دەمیا، بەڵام بای ئەهات نەیئەهێشت تۆزێ لێی بچێتە دەمیەوە. کابرایەك بەوێدا تێپەڕی، لێی پرسی: پوورە فەرخی ئەوە چی ئەخۆی؟ وتی: «بەخوا برام تا ئەم بایە لەم کونەوە بێت هیچ!».

**.٣٤** جارێك سەید ئەحمەدی خانەقا لە مەلای کۆیە ئەپرسێ: «مامۆستا دەغڵودانی لای ئێوە چۆنە؟» مەلاش ئەڵێ: «جەنابی سەید، دەغڵ لای ئێمە هەیە و دان لای ئێوە».

**٣٥.** شێخ بابەعەلی تەکیەیی لەبەر هەیوانی مزگەوتەکەی خۆیا دائەنیشێ، فەقێیەکی خەڵکی ئەو کێوە لەوێ ئەخوێنێ. فەقێ ئەچێ بۆ دەستنوێژ. بە بەردەمی شێخا ئەڕوا ئەڵێ: سەلام عەلەیکم. ئەگەڕێتەوە ئەڵێ: سەلام عەلەیکم. خێراخێرا بۆ لایەك ئەچێ و ئەگەڕێتەوە بە سەلام عەلەیکم بابەعەلی وەڕەس ئەکا؛ ئیتر ئەگاتە جەرگی. جارێکیان هەڵئەستێتە سەر ئەژنۆ و لێی زیت ئەبێتەوە ئەڵێ: «ئەرێ برا! هیچ وەکوو بزانی من سەلاملغی تۆم لێرە دانیشتووم. بۆ وازم لێ نایەنی؟»

**٣٦.** کابرایەکی کورد کوڕێکی هەبوو، بە زووخاوی جەرگ و بە هەزار کوێرەوەری کوڕەکەی گەورە کرد. لە پاشا کوڕە لەگەڵ باوکەکەیا چاك دەرنەچوو، جا باوکەکەی ئەیوت: «تا مناڵ بوو لێم بار بوو؛ کە گەورە بوو لێم هار بوو».

**٣٧.** مەلایەك وەعزی ئەدا، لە وەعزەکەدا ئەیوت: ئەگەر پیاو ئەوە بکا ئەچێتە بەهەشت و ئەوە بکا ئەچێتە جەحەننەم. یەکەیەکە هەموو چاکە و خراپەیەکی هەڵئەدا و زۆر پێوە خەریك بوو. دوو کابرای کورد لە وەعزەکەدا بوون، یەکێکیان بەوەکەیانی وت: «بێ وەڕێوە، بێ وەڕێوە. ئەم درێژ دادڕیەی نەگەرەکە، ئەگەر خاس بکەی ئەچیتە بەحەشت و ئەگەر خراو بکەی ئەچیتە جەحەنەم».

**٣٨.** کابرایەك هەبوو گۆزەیەکی دانابوو، هەرکەسێك کە ئەمرد بەردێکی ئەخستە گۆزەکەوە، لە ئاخری ساڵا ئەیبژارد بزانێ ئەو ساڵە چەن کەس مردووە. دۆستێکی هەبوو ڕۆژێك هات بۆلای، سەیری کرد کابرا دیار نییە، لە دراوسێی دووکانەکەی پرسی: ئەرێ فلانکەس چی لێ هات؟ ئەویش وتی: «چووە گۆزەکەوە».

٣٩. کابرایەکی دەباخچی کوڕێکی هەبوو، هەموو جار پێستەی ئەدایە بیباتە سەر کاریزی «دایکی پاشا» بیشواتەوە. کە پێستەکەی ئەدایە چینێکیشی لێ ئەدا و پێی ئەوت: پێستەکە نەدەی بە دەم سەگەوە. خەڵکی پێیان ئەوت: خۆ هێشتا نەیداوە بە دەم سەگەوە بۆچی لێی ئەدەی؟ ئەیوت: «جا کە دای بەدەم سەگەوە، ئیتر لێدان بە کەڵکی چی دێ؟!».

٤٠. کابرایەکی کورد ژنیان بۆ هێنا، برازاواکان هەر پێیان ئەوت برا خۆت حازر کە. بەمە وەڕەزیان کردبوو. ئەویش وتی: «برا بەرە تاشیومە و تفە لە دەممایە، ئیتر چی خۆم حازر کەم؟».

٤١. کابرایەکی پیری دەوڵەمەند کوڕێکی هەبوو، ڕۆژێك کابرا قسەی ئەکرد بۆ خەڵکی ئەیوت: من هیچ ئەولادم نەئەبوو، چوومە سەر دارشەخسەکەی «بانی بنۆك» لێی پاڕامەوە خوا ئەم کوڕەی دامێ. کوڕەکە گوێی لێبوو، ڕووی کرد بەولاوە، بە هاوڕێکانی وت: «بریا منیش ئەو شەخسەم ئەزانی لە کوێیە، بچوومایە لێی بپاڕامایەوە باوکم زوو بمردایە».

٤٢. موفتی زەهاوی، وەکوو موفتی زەهاوی بوو، پیاوێکی کوردی دەشتەکیش بوو. هەموو جار سنگ و بەرۆکی بەدەرەوە بوو. ڕۆژێك لە بەغدا یەکێك لە عەرەبەکان پێی ئەڵێ: «بەخوا ئەمە زۆر عەیبە بۆ تۆ کە بەو جۆرە سنگ و بەرۆکت بەدەرەوە بێ». ئەویش بە سەبرێ جوبە و کەواکەی ئەداتەوە بەسەر سنگیا و ئەڵێ: «ئەگەر عەیب هەر ئەوەیە ئەوا داميۆشی».

٤٣. جارێك موفتی زەهاوی لە بەغدا بە کاروانسەرایەکدا تێئەپەڕێ سەیر ئەکا لەسەر قاپی خانەکەوە نووسراوە: «**لَوْلَا الْأَكْرادُ لَهَلَكَ الْحِمارُ**». ئەمیش لە ژێریا ئەنووسێ: «**لَوْلانَا لَهَلَكْتُمْ**».

٤٤. «خلك»ـی مستەفای پیروەیس شاتری ئەیوت: «خزمی خراپ وەکوو گونی قۆڕ وایە؛ ئەیبڕی ئەتکوژێ، نایبڕی ئابڕووت ئەبا».

٤٥. کامل چادرچی لە بەغدا بۆی گێڕامەوە وتی: لە ساڵی (١٩٤٩) دا بوومەلەرزەیەك لە بەغدا پەیدا بوو. دنیا شەو بوو؛ من نووستبووم ئاگام لێنەبوو؛ بەیانی کە هەستام پێیان وتم. لە هەرکەسم ئەپرسی هەریەکە قسەیەکی ئەکرد؛ یەکێ ئەیوت: تەنیا دوو دەقیقە بوو، یەکێك ئەیوت: پێنج دەقیقە بوو، قسەیەکی ساغم دەست نەکەوت. وتی: پیاوێکی کوردمان لابوو، لەوم پرسی، وتی: تۆزێ سەری داخست و لە پاشا سەری بەرز کردەوە وتی: «جگەرەیەك هەڵگرە، نەفەسێکی لێدە و نەفەسەکە بدەرە دواوە، هەر ئەوەندە بوو». کامل وتی: لە قسەی ئەو کابرایە پوختەتر نەمبیستبوو.

٤٦. ژن و مێردێکی کوردەواری گەنجییان پێکەوە ڕابوارد و زەمانێکی دوور و درێژیان بەسەر برد، هیچ ناخۆشییەك نەکەوتە بەینیانەوە. لە دەوروبەری پیریدا کابرا بوو بە ئاگر و چووە گیانی ژنەوە. ژنە نەیئەوێرا لێو هەڵێنێتەوە، کابرا دەستی ئەکرد بە قسە وتن پێی. ڕۆژێك ژنەکە وتی: «ئەرێ پیاوەکە! من نازانم تۆ بۆچ وات لێهاتووە. جاران من ئەموت: سندان، تۆ ئەتوت: لە دەورت گەڕێم. من ئەموت: قوزەڵقورت، تۆ ئەتوت: بە ساقەی زمانت بم؛ کەچی ئێستا پێت ئەڵێم:

بەقوربان؛ تۆ ئەڵێی: سەگباب. ئەمە بۆچ وات لێ‌هاتووە؟» پیاوەش وتی: «ژنەکە واز بێنە لەسەری مەڕۆ، ئەوی بەینی من و تۆی خۆش ئەکرد نەما و بەسەر چوو».

٤٧. مەجید یەعقووبی لە ساڵی (١٩٣٣)دا موتەسەڕیف بوو لە سولەیمانی. ئەو ساڵە مشکەکوێرە و بەراز لەو وڵاتە زۆر بوو. کاغەزێکی نووسی بۆ مدیریەتی زەراعە لە بەغدا، کە هەندێ دەرمان بنێرن بۆ ئەوەی ئەو مشکانەی پێ بکوژن. ئەم کاغەزەشی زۆر بە پەلەپەل نووسیبوو، بۆ ئەوەی زوو دەرمانەکە بنێرن. مودیریەتیش بە جوابێکی ڕەسمی جوابی دابۆوە و نووسیبووی: «لەم ڕووەوە قسەمان لەگەڵ وەزارەتی ئیقتیساد کردووە، وەزارەتیش قسەی لەگەڵ شەریکەدا کرد لە «لەندەن» بۆ دەرمان. شەریکەکە وتی: وا ئێرسالیەی تازەتان بۆ ئەنێرین». مەجید یەعقووبیش لە جوابی ئەو کاغەزەدا نووسییەوە بۆ مدیریەتی زەراعە و وتی: «ئەمرەکەتانمان گەیاند بە مشکەکان، پێمان‌وتن: لە کونەکانیان نەیەنە دەرەوە تا ئێرسالیەی دەرمانی تازە لە لەندەن دێت و ئەیکەین بە کونەکانتانەوە و ئەتانکوژین؛ بەڵام بۆ بەرازەکان نازانین، هەر عەینی شتیان پێ بڵێین یا دەرمانی ئەوان لە شەریکەیەکی‌تردایە؟ تکا ئەکەین جوابمان بدەنەوە».

٤٨. مەلا عیسای هەرتەل هەبوو، جارێك ئەیوت: «خوڵای گەلێ ئیشی وا ئەکا ئەزی تیا شەرمەزار ئەبم!».

٤٩. دوو کابرای کورد بە دەشتێکا ئەڕۆن، سەیری ئەکەن دڕکوداڵ و کەردڕێکی زۆری لێیە. یەکێکیان بەوی‌کەیان ئەڵێ: «ئەرێ

برا، خوا ئەم گشت هەسان و چەوریەسانەی لە کوێ بوو کە ئەمانە گشت تیژ کاتەوە؟» ئەویتریش ئەڵێ: «برا ئەوە تۆ ییژی چی؟ هەر لەگەڵ وتی: تێژ، تیژ».

٥٠. کابرایەك لە سنە هەبوو «مەولوو»ی ناو بوو. کابرایەکی قسەقوت و گاڵتەچی بوو. ماڵکاولە ئەوەندە زل و ناکلۆکاریش بوو ئەتوت تاوێرە؛ کەچی کوڕێکی هەبوو ئەوەندە بچووك بوو، هەروەخت کە لەگەڵیا ئەڕۆیشت ئەتوت هێلکەیە بەشوێنیەوە. لێیان ئەپرسی: مەولوو ئەمە کوڕی خۆتە؟ ئەیوت: «نازانم، دایکی ئەزانێ».

٥١. حاجی ئەوڕەحمانی کۆیی هەبوو، پیاوێکی دەوڵەمەند بوو، کە دوعای ئەکرد ئەیوت: «خوایە بە گەورەیی خۆت ڕەحم بە ئێمە بکەی، هەژارەکە قەیناکا ڕاهاتووە».

٥٢. شێخ سەعیدی مەسۆ پیاوێکی ئێجگار زەلام و ناکلۆکار بوو، لەوانە بوو لەبەر ئەوە ئەوەندە زل بوو بەوەدا ڕانەئەگەیشت بتوانێ دەستەجلێك بەسەر یەکەوە دروست بکا. ڕۆژێك بە بازاڕی سولەیمانیدا تێپەڕی، منالێك تووشی ئەبێ، منالەکە لە ژێرەوە سەیری ئەکا و لەم لەشە وەبارە زۆر سەرسام ئەمێنێ. لە پاشا ئەڵێ: «خەڵکینە! ئەگەر ئێستە قسەیەك ئەکەم پێم ناڵێن تەماشاکە ئەم هەتیوە هێشتا سەری لە هێلکە نەهێناوەتە دەرەوە، کفر ئەکا، ئەگینە ئەرێ خوایە ئائەمە ئیشە تۆ کردووتە؟ چوار زەلامت خستۆتە سەریەك و ناوت ناوە زەلامێك. ئەمە چۆن ئەبێ؟ کەچی هی وایش هەیە لەبەر بچووکی چووە بە ناخی ئەرزا».

٥٣. کابرایەکی کورد ڕۆژێکی ڕەمەزان نەیتوانی بەڕۆژوو بێت، هەستا چوو لە سووچێکی تاریکی ماڵەکەی خۆیانەوە دەستی کرد بە نان خواردن. کوڕێکی هەبوو بەسەریا چوو، گوێی لە ملچە ملچێك بوو، وتی: ئەوە کێیە؟ وتی: «ڕۆڵە باوکی سەگبابتە، نانی خۆی ئەخوا، لە خەڵك ئەترسێ».

٥٤. دوو کابرای کورد بە ڕێبواری ڕێیان ئەکەوێتە ئەو عەرەبستانە. ئەمانە نە حوشتریان دیبوو، نە دارخورما. تووشی کاروانێکی حوشتر ئەبن، لە زلی و ناکلۆکاری حوشتر زۆر سەریان سوڕ ئەمێنێ. لە پاشا تووشی بێستانێکی دارخورماش ئەبن، دارخورماکان زۆر بەرز ئەبن. یەکێکیان ئەڵێ: «ئەرێ برا ئەمە چییە، خوا بۆچ ئەوەندە دارخورمای بەرز دروستکردووە، پیاو دەستی نایگاتێ؟» ئەوی‌کەشیان ئەڵێ: «برا لە ترسی حوشتر».

٥٥. مەحمووپاشای جاف لە «باخەکۆن» لەدیواخانی شێخی «حسام‌الدین»ـدا پێکەوە دائەنیشن. لەو وەختەدا زابتێکی ئەفەندیش دێتە دیواخان و مەحمووپاشا ئەیناسێ و بە شێخی ئەناسێنێ و ئەڵێ: یا شێخ ئەمە لە مەکتەب خوێندوویەتی و بووە بە زابت. با ئێمەش مناڵەکانمان بخەینە مەکتەب و فێری خوێندەواری ببن.

ئەوان لەم قسەدا ئەبن، ئەفەندییەکە هەڵئەستێ و ئەچێ تۆزێ لەولای ئەوانەوە بە پێوە دەست ئەکا بە میز کردن. شێخ حیسامەددین ئەڵێ: «پاشا ئەمەیە مەکتەبلی، کەوا تۆ ئەوەندە بە تانوپۆیا ئەچی؟!» مەحمووپاشاش ئەڵێ: «یاشێخ! ئەگەر لە مەکتەب نەیخوێندایە میزەکەی ئەکرد بە سەروچاوی ئێمەدا».

٥٦. کابرایەکی کرمانج لە هەولێر بە شانوباڵی مەلا ساڵحی کۆزەپانکەدا دێ ئەڵێ: «مەلا کلکی پێوە بڕسکێ وەکوو مەلا ساڵحی کۆزەپانکە نابێ».

٥٧. لە بەغدا لە مزگەوتێك نوێژی خەوتنانمان بە جەماعەت کرد، پاشان خەڵکەکە بەرەبەرە دەرچوون. ماینەوە سەر چوار کەس. یەکێك لەم چوارە کابرایەك بوو خەڵکی «عەفەر» بوو. هاتە وەختی دوعا کردن دەستی بەرز کردەوە وتی: «خوایە لەم چوارە خۆش بە، ئەوانی‌تر کەیفی خۆتە». لە پاشا پێم وت: بۆچ وات وت، ئەی خەڵکەکەی‌تر؟ وتی: «چاویان دەرێت! بۆچ من پشتماڵەی ئەوانم، بۆیان بپاڕێمەوە».

٥٨. قوتوو جگەرەیەکی داری دەستکردی سنەم هەبوو وێنەی «ئەبوعەلی‌سینا»ی لەسەر هەڵکەنرابوو، لە بنەکەشیەوە نووسرابوو «فەیلەسووفی شەرق». کوڕێکی نەخوێندەواری خەڵکی سنە هاتە لام کە ناوی «باقر» بوو. وێنەی سەر قوتووەکەی چاوپێکەوت، وتی: ئەوە کێیە؟ وتم: ئەوە نووسراوە «فەیلەسووفی شەرق ئەبوعەلی‌سینا». وتی: قوربان فەیلەسووف یانێ چی؟ وتم: «یانێ وردبین و زۆر شارەزا لە هەموو کون و قوشبنێکی حیکمەت و عیلما». تۆزێ سەری داخست و لە پاشا وتی: قوربان جا بێژە «فرەزان» ئیتر ئەمەی بۆ چەس.

٥٩. کابرایەك هەبوو زۆر لە سەگ ئەترسا، تەنانت لە توولەکۆڵەیەکیش هەر ئەترسا. پێیان ئەوت: کابرا ئاخر «تووتك» چییە تۆ لێی ئەترسی؟ ئەیوت: «من لە خۆی ناترسم، لەوە ئەترسم کە «گەماڵ» خەبەر ئەکاتەوە».

٦٠. یەکێ لە پاشاکانی عەجەم لە زەمانی زوودا فەرمانی دابوو هەرچی بەگزادەی هەورامی هەیە بیانگرن و چاویان هەڵکۆڵن. بەگزادەکانیان گرتبوون خستبوونیانە ژوورێکەوە، خۆیشی لەسەر بانێك ڕاوەستابوو سەیری ئەکردن. لە ناکاو لەناویانا کابرایەکی ڕووتەڵەی جل شڕی بەرچاو کەوت. بانگی کرد: بۆم بێنن. کە بردیان لێی پرسی: کورە کابرا! تۆیش بەگزادەیت؟ ئەویش وتی: «قوربان بۆ چاوهەڵکۆڵین بەگزادەم؛ ئەگینا تا ئێستا هەر کۆڵەداریان پێ ئەکێشام». پاشا کە وەڵامەکەی پێ سەیر ئەبێ، بەرەڵای ئەکا.

٦١. دوو کابرا لە زۆرانگرتنا بوون، یەکێکیان ئەوی‌کەیانی دا بە عەرزا. ئەوەی کە سەرکەوتبوو بۆ ئەوەی خۆی هەڵکێشێ، هات بە شانوباڵی ژێرکەوتووەکەدا و وتی: «بەخوا ماڵکاولە بەهێزە؛ تا خستم وەختبوو هەموو جمگەی شانم لەبەریەك دەرچێ». ئەوی ژێرکەوتووەکە هەڵسایەوە و ڕووی کردە خەڵکەکە، وتی: «خەڵکینە! وەڵڵا بڕوا مەکەن، وا مەزانن ئازایی ئەو بوو منی خستووە، لە حیزی خۆم بوو، ئەگینە ئەو لەو پیاوانە نییە».

٦٢. یەکێ لە مسکینەکانی حەماغای سەراو، ئەچێتە لای ئاغا، داوای لنگەگایەکی لێ ئەکا، خۆیشی لنگێکی هەیە بۆ ئەوە جووتەکەی ئەو ساڵەی پەکی نەکەوێ. ئاغەش ئەڵێ: بچن گازەردی بدەنێ. کابرا ئەیەوێ بڵێ: ئاغە ئەگەر گاکە باش نەبێ بە کەڵکم نایە، مەلا «ئەحمەدی لاسوور»یش لە دیواخان ئەبێ خێرا دێ بە شانوباڵی گادا؛ بە جۆرێ باسی ئەکا کابرا هەر خواخوایەتی زوو هەستێ و بە پەلە بچێ وەری‌گرێ، نەوەك ئاغە پەشیمان ببێتەوە. ئەچێ بۆ گاڕان بۆ

وەرگرتنی گازەرد؛ کە چاوی پێ ئەکەوێ تەماشا ئەکا ئەوەندە لاتە بە «لۆس» نەبێ ڕاست نابێتەوە. هەناسەیەك هەڵئەکێشێ و ئەڵێ: «بریا، من گابوومایە و مەلا ئەحمەدی لاسوور باسی بکردمایە».

٦٣. حەسەن بەگی کاك بایز بە بایزاغای دێبوکری ئەڵێ: «بایزاغا! ماڵی ئێوە زۆر بێ پەردەیە، هەرکەس دێت و ئەچێتە ژوورەوە». مەبەستی ئەوە ئەبێ تانووتی لێ بدا. بایزاغاش ئەڵێ: «حەسەن بەگ، ژنەکانمان بە دڵی خۆیان پیاو ئەبیننەوە کوڕی وەکوو من ئەهێنن؛ بەڵام ژنەکانی ئێوە مەیتەرە لەڕێك لە خۆیان ئەنێن، کوڕی وەکوو تۆ ئەهێنن».

٦٤. ژنێکی «بێسەریی» هەبوو «پیزە»ی ناو بوو. چوار کوڕی ئازا و بەناوبانگی هەبوو. ئەمانە بەرەبەرە لە ڕێگری و چەتەیەتییا کوژرابوون. پیاوێکی گەورە لێی ئەپرسێ: «ئائەمانە چین تۆ خستوونتەوە؟» ئەیەوێ بەم قسە تانووتی لێ دا، ئەویش پێی ئەڵێ: «لەباتی ئەوە، ئەوە بە من ئەڵێی، بە باوکتت بوتایە کە دایکی تۆی بناردایەتە لای ئێمە، با لە پیاوەکانی ئێمە بیگرتایە و کوڕی وەکوو کوڕەکانی منی بهێنایە؛ نەوەکوو تۆ کە لەسەر دۆشەك و بە ترسەوە تەنانەت لەگەڵ منیش قسە ئەکەی».



# تاڤگەی ئێلاخ

٦٥. لالە سەرحەد ڕوغزایی ئاشنایەکی سەڕاجی هەبوو زۆری خۆش ئەویست، هەمیشە لە قسەکردنیشا بەربەرەکانێی یەکیان ئەکرد. شەوێك میوانی لالە سەرحەد بوو، بەیانی هێشتا لە خەوا بوو، لالە سەرحەد هەڵیکوتایە سەر جێگاکەی، نووکە شەقێکی تێوەژەند بانگی کرد: «ئا کوڕە ڕاستەوەوە؛ گۆرانە هیزە نیوەڕۆیە». کابرا بەدەم خەوەوە وتی: گەماڵە پیرە، بە میوانیش ئەگەفی؟ لالەیش وتی: «ئا برا تۆ دەنگ! ئێمشەو خەوێکم دیگە، کەسێ وا نەو فاڵەکەیم بۆ بگێڕێتەوە، با وە تۆی بێژم». سەڕاجیش وتی: تۆ بێژی، ئەگەر پچڕپچڕیش بێ بە دەرزی و درەوش پێکەوە گیروبەندی ئەکەم.

ئینجا دەستی کردە خەوگێڕانەوە و وتی: «سەیساق» و «بالانتەران» گوێیان پێوەوێ، گوێی دوژمن کەڕ وێ و چاوی گشت وردە شاتری و گەلایی کوێر وێ! لە خەوما گوێلکە مێچکەیەکمان گوم بووبوو شوێنم هەڵکردبوو، گەییمە ئەو دەشتی «نێرگسەجاڕە». ڕوانیم پیاگێکی ڕیش چەرمووگی نوورانی لەسەر بەردەکەی «مەحمووگاوانی» لێ هەلاژیاگە، گاڵۆکێکی وەتەنشت خۆیا ڕاکێشاگە و بووزگێکی لاوخاسی لە بەردەما وێسیاگە؛ چست و چالاك، مەگەر هەر خۆم لە تافی کوڕێنیما وا وریا بووبێتم. پرسیم برا تۆ کێی و ئەو پیرە کێس؟ وتی: لالە ئەوە بینایی چاوانە و منیش «حەمەد ڕەسوولەڵڵا»م.

لە دڵی خۆما وتم پیاو! وەخوا خاس بوو ئێستا وە کەرامەت سۆراخی گوێلکەکەم بۆ ئەکا. چوومە بەرەوە سڵاوێکم کرد. هیچ نەجمیا، بەڵام وە لالووتێکەوە بۆڵەیەکی لێوە هات، وەکوو جواوی سڵاوەکەی دابمەوە وابوو. تەمام بوو توورە ببم بێژم کاورا سڵاو سڵاوی خوایە تۆ بۆچ خاس جوابم نادەیتەوە؟ وە گاڵۆکەکەت ئەنازی؟ حەمەد ڕەسوولەڵڵا خێرا تێگەیشت، هاتە بەرەوە وتی: قووروان ئەوە لالە سەرحەدە. لالە سەرحەد؟ ئینجا جمیا و چوارمەشقی لێ دانیشت و وتی: لالە وەخێر هاتی، مەڕوانە قسوور، شەو نەخەوتووم، نیازمان بوو بێینە میوانی تۆ. جارێ ئەم دەشتەم لا خۆشوو، وا تۆزێ لێرە حەساینەوە. منیش وتم: وە خێر بێی! فەڕ و بەرەکەتت هاورد.

لەو وەختەدا لام کردەوە، پیێکوڕەیەك لە چەمەوە هات، بانگم کرد، ئا کاورا بێ لاوەلا. کاورا وە هەڵەداوان ڕایکرد هات. وتم بتبینم چۆن ڕائەکەی؟ بچۆرە ماڵ یێمە بێژە وە «خازە» میوانمان تێت. شەکە گێژەکە سەر وڕن. گۆشتی شەکی گێژ فرە خۆشە. پیێکوڕە ڕۆی و منیش ڕوانیمە بەر و بەرپشتێنی بینایی چاوان کیسە و سەویلم نەدی. سەویلەکەی خۆمم دەراورد؛ فرە خۆشەویستە لەلام. لەو ساڵەوە خازەم هاورد و چووبوومە تانجەڕۆ سڵ بکەم، ئەو سەویلەم دۆزیبووەوە. کیسە توتنیش هەر ئەو کیسە بوو کە لە کراسی مناڵی «قەیتوول»ی و خۆیشکەکەی مابووەوە، هەرچەن ئەوانیش پیا هەڵئەمێزان، بەڵام خازە گجارێ ئەیشۆرد. توتنەکەشی کوڕگەل لە کاروانی بەغدایان داوو، هەندێ توتنیان بۆ هاوردم. توتنەکە فرەخۆشوو، مەگەر توتنی بەراوی «قاینەجە» هاوشانی بکردایە. سەویلێ خاسم تێکرد و دامە دەس حەمەد ڕەسوولەڵڵا بۆم بگرێ تا ئاگری بۆ ئەکەمەوە. هەسێ و بەردەکەم دەراورد، گازێ پووشووی

ناو دارم داگیرساند، سەویلم لە دەست سەندەوە و پووشم خستە سەر، قومێکم لێ دا تا خاس داگیرسیا، دامە دەم بینایی چاوان؛ مژێکی لێ دا، فەرمووی: لالە ئەم تووتنەت لەکوێ بوو، فرە خۆشە، بێژە جاخێکم بۆ دابگرن لەتەك خۆما ئەیوەم. وتم وەچاوان.

لەو دەمەدا تەماشامان کرد وا لە دوورەوە بڕە سوارێك دەرکەوتن. کە هاتن من ناسینم. بینایی‌چاوان پرسی: لالە ئەمانە کێن؟ وتم: یا بینایی چاوان! کوڕگەلی تەرخانین، هاتگن بۆ پێشواز. وتی: با بچن بەولاوە فرە بێ‌فەڕن. بەشوێن ئەوانا دەستەیەکی‌تر هاتن. پرسی: ئەمانە کێن؟ وتم: ئەمانە وردەشاترین. دیسان وتی: ئەمانەش بێ‌فەڕن. کاروانێکی‌تر هاتن پرسی: ئەمانە کێن؟ وتم: گەلاڵین. وتی ئەمانە هەر فرە بێ‌فەڕن با چارەیان نەوینم.

ئەوا بینایی‌چاوان خۆی لەو سەرەوە دانیشتگە، حەمەد ڕەسوولەڵڵا لەولایەوە و منیش لەم‌لایەوە. هەروا قسەمان ئەکرد، کەچی تاقمە سوارێکی فەقیانەشۆڕی سەروپێچداری گشت جوانخاس جوانخاس، تۆز ئەکەن و هاتن. بۆرکەوە سوارێك لە پێشیانەوە تەڕاتین ئەکا. بای غەزەو وە تۆزی قولیا ناگات. بینایی چاوان فەرمووی: لالە ئەمانە کێن؟ وتم: ئەمانە کوڕگەلی ڕوغزایین، ئەو سوارەش لە پێشیانەوە «قەیتوول»ـی خزمەتکارتە. تومەز ئەمانە هەموو، کە کاورای پێ‌کوڕە خەوەری بردبوو، گشت هاتوون وە پێشواز.

بینایی چاوان فەرمووی: «ماشەڵڵا، ماشەڵڵا لە خێڵی ڕوغزایی، لە قەیتوولی سوورکەوەسوار! ئا پێ بێژە چکێ نۆما سوورکەوە باخێوێ». منیش وتم: «قیتە! ئا بتوینم خۆم‌ئاسایی وجاخی باوکت ڕوون کەرەوە». قەیتوول ئاوزەنگی پیا هاورد، خێروبێر وێ، نۆما هات وە خۆیا، سەری

سواریێ بوو، کلکی سواریێك، قەیتوولیش لە ناوەڕاستیا وەك حەمەد ڕەسوولەڵلا سواری بوراق بووبێ واوو.

لەو سەردەمەدا سەیری قەیتوولم ئەکرد حەمەدڕەسوولەڵلا سەری نابووە بناگوێی بینایی چاوان. تێگەیشتم کە گەرەکیە وە بینایی چاوان بێژێ داوای نۆماکەی لە قەیتوول بۆ بکا. وتم: کاکە قسەی خۆت مەدۆڕێنە، قەیتوول نەگریس و تووڕە و کەللە شەقە، لێت تووڕە ئەوێ، میوان نەوی خوایش وی، نایدا. بینایی چاوان فەرمووی: محەمەد ئەم نۆمایە هەر بۆ قەیتوول خاسە و هەر لەو دێت. من ئێژم وە ڕەییسی عەنزە چارەوێیەکی عەرەوی فرە خاس بۆ تۆ بنێرێ.

سا ئێمە لەم حەیسەوبەیسەدا بووین، تێفکریم وەك قەتارەی قوڵەنگ سەر یەك نیشتوێ هەر پێکوڕەیەك سینییەك، یا سەلەیەك وەسەر سەرەوە نان هات، بەڵام چە نانێك؟ پڵاو گشت وەك مەلای سەرچەرمگ، تەشوی ترشی حەسەن‌وەگی لە تەکا وە قاورمەی شەکە گێژا دەورا دەور دریاگە. پیاگ ئەشیا بێژێ نان بو خوا دروس کریاگە...

نان دانرا... خولەی ئەلی‌کەوکوژ وەخۆی و زوڕنایەوە پەیدا بوو. بێ‌وە کەس پێ بێژێ پێکی زوڕنای لێ خۆش کرد و فیقاندی وە زوڕنادا، ئەوانەی نانیان هاوردوو کەوتنە ژەندن، کاورای دەهۆڵژەنی قلیاسانی وە فرکانی دەهۆڵی گەیاند، لە تەقەی دەهۆڵ و زوڕنا لە گشت لایەکەوە کەنیشك و شۆڕەژنی جاف گلێر بوونەوە. بووە ڕەشبەڵەکێك بۆ حەمەپاشایش ئەو زەماوەنە نەکریاوو. جا براکە بزانە چەن خۆش بوو، وە دەنگی دەهۆڵ و زوڕناوە ئەو نانە نۆشی گیان کریا.

حەمەد ڕەسوولەڵلا فەرمووی: «شنینە»؛ نەمزانی چی ئێژێ، بینایی چاوان فەرمووی: «دۆ»ی گەرەکە. مەشکە دۆ هات، کاسەیان بۆ

پڕ کرد، کەوچکی نەگەرەکو، هەروا کاسەی نا وە سەرەوە ئۆخەیچی کرد. منیش وتم: نۆشی گیانت وێ!

هەروا لە دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا مکایلی و سەدانی گلێر بوونەوە. بینایی چاوان پرسی: لالە ئەمانە کێن؟ عەرزم کرد: قوروان مکایەڵین لە تەك ئێمەدا ناکۆکن. فەرمووی ڕایانکێشن بۆ جەحەنەم. لە دەنگی زیرەی ئەوان خەوەرم بووەوە.

کاتێ لالە سەرحەد ئەم خەوەی گێڕایەوە، سەڕاج وتی: لالە تۆ یێژی ئەم گشت تەحامەیان هاورد، خۆ من هێمان لە ماڵی تۆ چەشکەی برنجم نەکردگە. خازە هەر یێژێ برنج نەکوتیاگە، چۆن بەو دەمودەستە کوتریا و لێ نریا؟ منیش ئیمشەو خوا وە خێری بنووسێ خەوێکم دیگە.

لالە سەرحەد وتی: ئا برا بێژە بزانم تۆ چیت دیگە؟ سەڕاج وتی:

لە خەوما من زینێکم بۆ چارەوێیە فلقەکەی تۆ دووریوو، پارەت نەدابوومێ، هاتم بە گژتا، تۆیش دەستت لێدابوومە شیر و سوباشی؛ حەمەساڵح بەگی قائیمقامی هەڵەبجە گرتنی و بردینیە دیوان. پرسی: ئەرێ گەماڵە پیرەی بێکەڵبە گەفیگە، ئەم پیاوە زینی بۆ دووریوی پارەت بۆچ نەداوەتێ؟ تۆ وتت: میرم ها لە ماڵما بەخێوی ئەکەم پارەی چی بدەمێ؟ ئەمری کرد: هەردووکمانیان ڕاکێشا، منیان خستە چاڵی پیسایی ئەدەبخانەوە، تۆیان هاویشتە چاڵی هەنگوینەوە؛ لەشمانی تێوەچوو.

لالە سەرحەد هەڵیدایە وتی: «ئائاوە گۆڕت وێ، خاس تیا گەوزای!».

سەڕاج وتی: ئەرێ وەڵڵا تیا قورس بووبووم. لالە سەرحەد بە کەیفی بوو. کەوتە تیتاڵی، وتی: خۆڕایی نییە بانگێشتنم بۆ بینایی چاوان کردگە.

سەڕاج وتی: ئەوساکەش تۆ پێکەنیت، میر قینی هەڵسا ئەمری کرد: مەواشیر بدە لێیان و بێژە ئەشێ یەکتر بلێسنەوە. من دەستم کرد وە

لێسانەوەی تۆ؛ فرە خۆش بوو. تۆیش دەستت کرد وە لێسانەوەی من. قیزت هاتەوە و بەسەریا ڕشایتەوە، ئەوەیشیان بە زۆر هەر پی لستیتەوە.

لالە سەرحەد دەستی کرد بە جنێودان و بە دەمیشیەوە هێڵنجی دەدا و وتی: «دەویت باوکە! ئەوە خەونە تۆ دیگتە؟» سەڕاجیش وتی: «ئەی گەماڵە پیرەی بێکەڵبە! ئەی خەوەکەی تۆ خەوە دیگتە؟ قلیانت بۆ خوا لە کیسە تووتنی میزاوی تێکرد و بۆ چارەویە فلقێك کە بە دزیەتی چنگتان کەوتووە قسەی خوا و دڵی پێغەمبەرت شکاند؟».

**٦٦.** حەمەبەگی ڕەسوول بەگی موغاغ، گێڕایەوە وتی: کابرایەکی شێنکی، «قوچاغلی» ناوبوو کە پێیان ئەوت «قوچە» و پیاوی «مەخول» هەمەوەن بوو. هەرچەن بهاتایە بۆ سولەیمانی لە ماڵی ئێمە میوان ئەبوو. ئێمەش منداڵ بوین، بە شەو ئەچووین بۆلای ئەو، باسی جەردەیی بۆ ئەگێڕاینەوە. شەوێك وتی:

«جارێك لەگەڵ ساڵحی ئەحمەدنازێ و دوو سواریکە چووین بۆ بەری کۆیە. کاروانێکمان ڕووت کردەوە سێ ئێسترمان بە بارە برنجەوە هێنا. ئەو شەوە هەتا ڕۆژ، بەبێ وچان هاتین گەیشتینە ناوچەی «شێخ بزەینی».

زۆرمان برسی بوو، ئاواییەکی دە دوانزە ماڵیمان لێ دەرکەوت. یەکێ لە هاوڕێکانمان وتی: با بچین لەم ماڵانە نانێك بخوێن. ساڵح وتی: وا دیارە ئەم ماڵانە فەقیرن، ئەچینە دێیەکی‌تر. کابرا وتی: بابە! خۆ ئێمە تاڵانیان ناکەین، یەکێ دوو نان ئەخۆین و ئەڕۆین؛ بە کوزی دایکیانەوە. بەم قسەیە نەختێ پێکەنین.

چووین تا نزیك ئاوایی، لەوێ زەلامێك ئەسووڕایەوە، لێمان پرسی:

برا پیاوماقووڵی ئەم دێیە کێیە؟ وتی: من و کاکم. لێمان پرسی: تۆ چی ئەکەی لێرە؟ وتی «تەپاڵە» ئەچنمەوە. وتمان ئەی کاکت لە ماڵە بچین ببین بە میوانی؟ وتی: نەوەڵڵا، شوانی گوێرەکەیە، وا لەو کەژە. ئیتر لووس و باریك بە سکی برسی بەجێمان هێشت.

دێیەکی‌تر نزیك هەبوو هاتینە ئەوێ. زەلامێك لە قەراخ ئاوایی وەستابوو، لێمان پرسی: ئەم دێیە هی کێیە؟ وتی: هی منە. وتمان: ئەی تۆ چی ئەکەیت لێرە؟ وتی: فلانی، مسکێنەکان سەگی زۆریان هەیە، چاوەڕێم یەکێك بێت ڕەوانەم بکات. کە وامانزانی ناچار ئەوێشمان بەجێهێشت.

دێیەکی‌تر دیاربوو کە سەیرمان کرد وا شایی و ڕەشبەڵەکە و بووە بە هەرا. وتمان: دیارە لێرە شلپەیە، چووین خۆمانمان کرد بە ماڵێکی گەورەدا. بەڕاستی زۆر بە تفاق بوون. ژنێکی تەڕپیری کەمەرە لە پشت پوێلەدار، مێخەکبەن لە مل، سێ چوار دانی لە پێشەوە کەوتبوو. لە شاییەکەدا تەماشامان کرد لە جیاتی دەهۆڵ و زوڕنا دوو کوڕی هەرزەکاری دەنگخۆش گۆرانییان ئەوت. خەڵکەکەیش ژن و پیاو هەڵئەپەڕین، بەڵام گۆرانییەکەیان هەر ئەوەبوو ئەیانوت:

**لە بۆی مێخەك و بۆی سمڵ ئەبزوێنێ مردوو لە گڵ**
**کەمەرە و لوولە و پوێلەکەی ملوێنکی زێڕە وا لە مل**

لەسەریەك لەسەریەك ئەیانوتەوە. ساڵح لە ژنەکەی پرسی: ئەوە چییە ئەم کوڕانە هەر ئەمە ئەزانن وا شتی‌تر ناڵێن؟ ژنە تەڕپیرە وتی:

«بەقوربانت بم چووزانم؟ ئەوە ئەو هەتیوە حیزانە ئەم گۆرانییە هەر بە ملوانکەکەی منا هەڵئەدەن و مەبەستیان من و مێخەك و سملەکەی منە».

**٦٧.** کابرایەك بوو وەستاسادقی ناو بوو، حەسیری دروست ئەکرد. ئەم وەستا سادقە مێبازێکی ناقۆڵا و جانەوەر بوو. لەگەڵ ئەوەش زۆر قومارباز و فێڵباز بوو.

ڕۆژێك بە کۆڵانا ئەسووڕایەوە، تووشی ژنێك هات ئەوەندە جوان بوو، باسی بە کەس ناکرێ؛ ئەگەر مێوژە ڕەشکەی بخواردایە لە سای گەردەنیەوە دیار بوو. وەستا «سادق» کە تەماشای کرد، بە جارێ ئاگری تێ بەر بوو بۆی. دوای کەوت، ئەم کۆڵان و ئەو کۆڵان و کۆڵان هەتا کردیە ماڵێکا. پرسیاری کرد... وتیان: ئەمە ژنی فلانکەسی بازرگانە.

وەستا دەستبەجێ چووە دووکانی کابرای بازرگان، سەلامی لێ کرد و دانیشت. وەکوو کەسێ کە زۆر ئاشنایەتی بووبێ، دەستی کرد بە ئەحواڵپرسینی. هەرچەن پێویستیشی نەبوو، دەستەسرێك و هەندێ کووتاڵی‌تری لێ کڕی. هیچ سەودای نەکرد، هەر شتێ بازرگان بیفەرمووایە، گورج پارەکەی ئەدایە.

لەبەر ئەوە حەسیری ئەکرد، ئەو کەسانەی کە پووشەڵبان ئەفرۆشن و ئەوانەی حەسیریان ئەکڕی، هەر شتێکیان پێویست بوایە لە چیت و کووتاڵ ئەیهێنان بۆلای بازرگان و شتومەکی بۆ ئەکڕین. لە ماوەی یەك دوو حەفتەدا ئاشنایەتییەکی تەواوی لەگەڵ بازرگان پەیدا کرد.

ڕۆژێك بازرگان بە ناوی دراوسێی دووکانیەوە چووە سەر دووکانی وەستا سادق. وەستا خێرا ناردی چا و بەفراو و میوەیان هێنا و ماریفەتێکی زیاد لە ئەندازەی لەگەڵا نواند. بۆ ڕۆژی دوایی بازرگانی بۆ قاوەڵتی بانگ کردە ماڵی خۆیان و ئەویش ئەمی بانگ کردەوە. ئیتر بوون بە دۆستێکی زۆر خۆشەویست. ڕۆژێکی‌تر دیسان بازرگانی بانگ کردەوە بۆ ماڵەوە و بە ژنەکەی خۆی وت: مەسینە و لەگەن بێنێ دەستی

بازرگان بشوا و شەرمی لێ نەکا... میرزا هەرچەندە وتی نابێ، وەستا وتی: ئەوە چی ئەفەرمووی؟ ئێمە تازە یەك ماڵین شەرم و شکۆ نابێ لە بەینمانا بمێنێ.

لە پاش دوو سێ ڕۆژ وەستا سادق چووە ماڵی بازرگان و ئەویش بە ژنەکەی خۆی وت کە ئاو بکا بە دەست وەستادا و نابێ شەرمی لێ بکا و پێی وت: ئێمە وەکوو برا وەهاینە.

دەی دەی، وایان لێهات، وەستا سادق، میرزا لە ماڵ بوایە و نەبوایە ئەچوو سەربەست دائەنیشت. چەند ڕۆژێکی پێ چوو، کە ئیتر هیچ شەرم و پەردە لە بەینا نەما، ڕۆژێك کەس لەوێ نەبوو وەستا سادق ڕووی کردە میرزاژن و وتی: فڵانی من ڕاستی بڵێم دڵم چووە لێت و بۆت سووتاوم و هۆشم نەماوە؛ بۆ خاتری خوا چارێکم بکە.

ژنەکە خۆی لە خۆیا ئافرەتێکی داوێنپاك و بەئەدەب بوو، هەرچەند وتی: وەستا تۆ برای منی و لەگەڵ مێردەکەم وەکوو برا وانە، ئەمە کاری کردن نییە و خوا قەبووڵی نییە، نەچوو بەگوێی وەستادا. ناچار ژنە هەر ئەوەندی پێ کرا وتی باشە، شەوێ لە دیواخانەکەمان خۆت بشارەوە منیش نیوەشەو دێمە لات.

شەو وەکوو جاران وەستا سادق دانیشت و وەختی نووستن هەڵسا ڕۆیشت؛ چوو لە هۆدەی سەر دالآن ـ کە دیواخانی چۆڵ بوو ـ خۆی شاردەوە. ژنەکە زانی کە لەوێدایە، لە دڵی خۆیا وتی: ئەگەر ئەچمە لای ئەم سەگبابە نابێ، وە ئەگەر بە مێردەکەم ئەڵێم کە وەستا «سادق» وا خائینە لەگەڵت و ئێستەش لە دیواخانەکە خۆی داگرتووە، هەر نابێ و ناشیرینە. هەستا بەبۆنەی دەستنوێژەوە چووە حەوشە و بە هەڕاکردن هاتەوە لای مێردەکەی و وتی: پیاوەکە ئێستە لە حەوشە بووم گوێم لە

دەنگی کۆکە بوو لە هۆدەی سەر دالانەکە.

میرزا خەنجەرەکەی بە ڕووتی گرت بە دەستەوە و وتی: دەسا تۆیش فانۆسەکەم بۆ هەڵگرە. ژنەکە فانۆسی هەڵگرت و چوون. میرزا بانگی کرد: کێیە ئەوە؟ وەستا سادق زانی کە وا هاتوونەتە سەری، وتی: «پانزە، شانزە، حەڤدە، هەژدە...». میرزا دەنگی ناسی وتی: وەستا سادق ئەوە چی ئەکەی؟ وەستا سادق وتی: «بەخوا میرزا، ئیمڕۆ سەیرم کرد ئەم هۆدە حەسیری نەبوو، منیش هاتم، ئیستاکە وتم فرسەتە با ئاگایان لێ نەبێ ئەچم ئەیپێوم و حەسیرێکی جوانی بۆ دروست ئەکەم». میرزا وتی: بابە ئەوە چی ئەڵێیت؟ پێی ناوێ. وەستا وتی: «قابیل نییە بەخوا ئەیکەم» و لێی دا ڕۆیشت.

سبەینێ هاتەوە سەر ژنەکە و وتی: بۆچی ئێمشەو میرزا زانی من بووم؟ ژنە وتی: نازانم، توخوا وەستا سادق واز لەو فیکرە بێنە، گوناحە، تۆ برای منی. وتی: «خانم بەخوا چار نییە، دڵم لێت چووە و ئەبێ گەمەم لەگەڵ بکەیت». وتی: کەوایە ئێمشە و بچۆرە تەوێڵەکە.

شەو دیسان وەستا سادق هات، وەختی نووستن هەڵسا و خۆی هاویشتە تەوێڵەکەوە. ژنەکە دیسان فیکری کردەوە و نەیوێرا بە مێردەکەی بڵێ کە حاڵەکە وایە. وەختی نووستن وتی: «مێردەکە بەخوا چوومە خوارەوە پیاوێك لە تەوێڵەکە ئەکۆکی». دیسان میرزا خەنجەرەکەی هەڵگرت و ژنەکە فانۆسی گرت بە دەستەوە هاتنە بەر تەوێڵە. بانگی کرد: زەلام کێیە لەو تەوێڵەیە؟ وەستا سادق بە دەنگێکی هێواش وتی: «وس وس، ئێوە بڕۆن بنوون هەقتان نەبێ». میرزا وتی: وەستا ئەوە چی ئەکەی لەوێ؟ وتی: «میرزا ئیمڕۆ دوو سێ هەمەوەن دانیشتبوون ئەیانوت کەس ماینی چاکی نییە، میرزا نەبێ. ئێمشەو بچین ماینەکە

بدزیـن. ئـەوا منیـش هاتـووم لێرە نۆبـەت ئەگرم، با بێـن، ئەو وەختە یان ئەوان من ئەکوژن، یان من ئەوان ئەکوژم». میرزا ناچار بوو دانیشت لە تەوێڵەکەدا تا ڕۆژ بووەوە، هیچ نەبوو. وتی: «میرزا من پێم وتبوون کە کەس ناتوانێ دزی لە ماڵی میرزا بکا».

وەختی نیوەڕۆ چووەوە بۆ لای ژنە و دیسان سەری خستەوە سەری، ژنە وتی: پیاوی چاك بە، واز بێنە خوا ڕەوای هەقی نییە. وەستا وتی: نابێ. ژنە وتی: کەواتە بڵێم چی: ئیمشەو من لەبەر قاپیی هۆدەکەی خۆمان لە گوێئاگردانەکە ئەنووم، مێردەکەم لەلای سـەرەوە ئەنوێ، شـەو وەختی نووستن وەرە لام. وەستا وتی: باشە.

شـەو ژنەکـە خـۆی چـوو لـەلای سـەرەوە نووسـت و مێردەکـەی لـە گوێئاگردانەکـەدا نوانـد. نیوەشـەو وەسـتا هـات و چـووە سـەر جێگەکە دەسـتی بـرد بـۆ ناولنگـی میـرزا و میـرزا بەخەبـەر هات و دەسـتی گرت و وتـی: ئەمـە چییـە؟ وەسـتا سـادق وتـی: «"الحمـدلله، الحمـد لله"، یا ڕەببـی شـوکر». میـرزا وتـی: ئەمـە چییـە؟ وەسـتا وتـی: «فڵانـی دەنـگ مەکە. ئیمڕۆ لەگەڵ حەمەی نادر و مارفی ئەخۆلا باسـی جەنابتان کرا. ئـەوان وتیـان: بەخـوا میرزا قـۆڕە، منیش وتم: بەخوا قـۆڕ نییە، تەنانەت سێبەسـێ تەڵاقیشـم لەسـەر خوارد. ئێسـتا کە دڵم زۆر لە غایەلەدا بوو، نەوەك تەڵاقم کەوتبێ، هاتم پێم نا بە جەرگی خۆما و ئەوا تاقیم کردەوە. باشبوو شوکر تۆ قۆڕ نیت و منیش تەڵاقەکەم نەکەوتووە». ئەم قسەیەی کرد و ڕۆیـشت.

سبەینێ چووەوە لای ژنە و وتی: فڵانی هەرچی بوو هەتا ئێستا ڕابورد، ئێتر لە ئێعتباری ئێستاکەوە تۆ خوشکی من و منیش لەسەر دەستی تۆدا تۆبە بێ، چونکە ئەزانم تۆ ئافرەتێکی داوێنپاك و شیرپاکیت.

**٦٨.** حاکمێکی پێشوو کابرایەکی لە بناری کفری لێ یاخی ئەبێ و هەرچەندە ئەکا بۆی ناکەوێتە ڕەت. هەر لەشکرێ ئەنێرێتە سەری، ئەو بە لایەکی‌تر بۆی دەرئەچێ. ئاخری چاری نامێنێ دێنێ سێسەد، چوارسەد سوار و تفەنگچی سوار ئەکا و خۆی لەگەڵیان ئەچێت؛ شەو و ڕۆژ ئەیکوتن بەبێ وچان تا ئەچنە بناری کفری و ئەو شوێنە کە چەتەکانی لێیە. لە نیوەشەوێکا ئەگەنە ئەوێ.

حاکم یاساغی ئەکا کە کەس نە ئاگر بکاتەوە، نە تەقە بکا، نە دەنگی لێوە بێت. ئەمانەش بۆ ئەوە کە بەبێ دەنگ و سەنگ هەر بەو شەوە ئابڵۆقەی چەتەکان بدەن و لە بەیانییا بەبێ قسە بیانگرن. هەموو سەنگەر دائەمەزرێنن، حاکمیش سێ شەوە نەنووستوە، زۆری خەو دێت، سەر ئەکاتە سەر بەردێك و بە کابرای نۆبەتچی ئەڵێ: تۆ وریا بە و هیچ دەنگ مەکەن، من وەنەوزێك ئەدەم. کە چاوی ئەچێتە خەو بایێکی لێ ئەبێتەوە: کابرایەکی‌تری نۆبەتچی کە دوورتر ئەبێ، نازانێ ئەمە پاشایە ئەڵێ: «بە کێرم». نۆبەتچییەکەی لای پاشا پێی ئەڵێ: «کوڕە کەرانباوگاو تۆ نابێ تۆزێ شەرمت بێ؟ ئاخر تۆ نازانی ئەوە پاشا بوو؟» ئەویش ئەڵێ: کورە کەرانباوگاو خۆتی، من چووزانم کێ بووە؟

لەم هەرا و هوریای ئەمانە پاشا بەخەبەر دێت ئەپرسێ: ئەوە چییە؟ نۆبەتچییەکەی ژوور سەری قسەکەی پێ ئەڵێ. ئەویش ئەڵێ: «وس بن وس بن، مەیکەن بە هەرا با چەتەکان نەوەك بزانن و بڕۆن». ئەم هەڕەشەیەی ئەو هیچ کەڵکی نابێ. ئیش لە ئیش ئەترازێ و نۆبەتچییەکان دەست ئەدەنە تفەنگ لە یەك و ئەبێ بە تەقە. چەتەکان بە ئاگا دێن و ئەزانن ئەگەر فریای خۆیان نەکەون گیراون، بۆی دەرئەچن و خۆیان ڕزگار ئەکەن. ئیتر ئەمان ئەو هەموو عەزیەت

و شەونوخونی و پارێزەیان بە ترێکی پاشادا ڕۆیشت.

٦٩. ئەگێڕنەوە لە زەمانی سوڵتان بایەزیدا لە ئەستەمبوڵ وەزیرێك ڕایسپاردبوو ئێسترێکی چاکی بۆ بکڕن کە بە سواری پێی بچێ بۆ «مابەین» و بێتەوە. ئەم وەزیرە هەموو جار ئەیوت: شەیتان هەر نییە، هەرکەسێ بڵێ هەیە درۆ ئەکا. شەیتان چوو خۆی کرد بە ئێستر و لە قەرسیلی کابرایەکی فەقیر دەستی کرد بە قەرسیل خواردن. کابرا گرتی و بردیە ماڵەوە، هەرچەن پرسیاری کرد، ئیتر خاوەنی نەبوو، بردیانە بازاڕ، وا ڕێکەوت پیاوی وەزیرە کە هاتبوو ئێستر بکڕێ؛ لێی کڕی.

وەزیر دوو سێ ڕۆژ سواری بوو، تەماشای کرد ئەم ئێسترە ڕەوتێکی خۆشی هەیە، فنجانی قاوە نالەنگێنێ و زۆر هێمنە، جووتە ناهاوێ، گاز ناگرێ. ئیتر وەزیر لە خۆشی ئێستر پێی نەئەکەوتە زەوی. ڕۆژێك بە سواری لە مابەینی هومایۆن گەڕایەوە بۆ ماڵەوە.

بۆرییە ئاوێك ـ کە لە دیوارێك قایم کرابوو ـ لوولەیەکی بچکۆلە بە سەرەکەیەوە بوو، ئێستر دەمی بۆ لوولە ئاوەکە درێژ کرد. وەزیر زانی کە تینوویەتی، دابەزی لغاوی لەسەر داگرت و ئاوی بۆرییەی بەردا. ئێستر دەمی خستە ناو ئاو و باریك بووەوە و بە زین و بەرگەوە چووە ناو لوولەکەیەوە. وەزیر بانگی کرد کرێکار بێت ئەم بۆرییە لەم دیوارە تێك بدا. کرێکار دەستیان کرد بە دیوار تێکدان.

خاوەنی دیوار چوو شکاتی کرد، چەن جاندرمەیەك هاتن و لە وەزیریان پرسی: بۆچی خانووی خەڵکی وێران ئەکەی؟ وەزیر وتی: ئێسترەکەم چووەتە ئەم بۆرییە ئاوەوە. وتیان: جەنابی وەزیر خۆ تۆ ئەقڵت هەیە، ئێستر بەو زەلامییە، بۆیە بەو بچووکییە چلۆن ئەچێتە

ناوی؟ خۆ ئەم بۆرییە ترۆزییەکەی عەرەبستان نییە. وەزیر هەر لەسەر قسەکەی خۆی بوو، وتی: بە چاوی خۆم چاوم پێ‌کەوت چوو بە کونی بۆرییەکەدا. لە ئاخرا کۆمەڵێك لە پزیشکان کۆ بوونەوە ڕاپۆرتیان دا کە وەزیر شێت بووە و خستیانە تیمارخانەی شێتانەوە.

هەژارە ماوەیەکی زۆر لە تیمارخانە مایەوە، ئاخری دۆست و برادەری هاتن وتیان: باوکم تۆ واز لەو قسەیە بێنە با ڕزگارت بێ. ئەمجا کابرا بە ناچاری وتی: بابە درۆم کرد. بە هەر تکا و پاڕانەوەیەك بوو لە تیمارخانە هاتە دەرەوە.

ڕۆژێك بەو کۆڵانەدا بۆرییەکەی لێ‌بوو ڕابورد، تەماشای کرد ئەوا ئێسترەکە هەردوو گوێی لە کونی بۆرییەکەوە هێناوەتە دەرەوە. وتی: «چ بکەم؟ چاوێکم لە گوێچکەکانتە و چاوێکیشم لە گۆشەی تیمارخانەکەیە».

**٧٠.** هەتیوێکی کەچەڵەی ڕووتەڵە هەبوو ناوی «سێتە» و گاوانی «کانی‌مانگا» بوو. هەموو ڕۆژێك نانێکی بە خێری شەیتان ئەدا بە هەژارێك. ڕۆژێك شەیتان لەسەر کانییەکەی «کانی‌شەیتان» هاتە لای وتی: «هەموو دنیا دوژمنی منن، تۆ بۆچی خێرم بۆ ئەکەی؟» گاوان وتی: چونکە خەڵکی هەموو دوژمنی تۆن، منیش لە ڕقی خەڵك، تۆم خۆشئەوێ. شەیتانیش دەستی کرد بە باخەڵیا بلوێرێکی دەرهێنا و دای بە گاوان و ئیتر دوعاخوازی لێ کرد و ڕۆیشت.

گاوان وتی: با نەختێ بلوێر لێدەم. لەگەڵ فیقەی بلوێر بە جارێ گاگەل کۆ بوونەوە دەستیان کرد بە هەڵپەڕین. مانگای پیرێژنێك سەر چۆپی ئەکێشا کەوت و قاچێکی شکا.

ئێوارە پیرێژن کە مانگای بە قاچی شکاو بۆ هاتەوە، دەستبەجێ بە

ڕاکردن چوو بۆلای حاکم شکاتی کرد. حاکم سێتەی بانگ کرد و وتی: «کوڕە بۆچی قاچی مانگای ئەم پیرێژنەت شکاندووە؟» وتی: قوربان من بلوێرم لێ ئەدا گاگەلەکە هەموو هەڵئەپەڕین. مانگای ئەم پیرێژنە لە سەرخۆشی سەرچۆپیدا کەوت و قاچی شکا.

حاکم وتی: کوڕە هەتیوە کەچەڵەی نەگبەتە چلۆن مانگا هەڵئەپەڕێ؟ وتی: «قوربان بە بلوێری من هەڵئەپەڕێ». وتی: «ئا بزانم چلۆن بلوێرێك لێ ئەدەی؟» سێتە بلوێری لە پشتی کردەوە، لەگەڵ دەستی کرد بە بلوێر لێدان، حاکم هەڵسا دەستی کرد بە هەڵپەڕین. وتی: «پیرێژن ناتکەوێ، پیرێژن ناتکەوێ». پیرێژنیش دوو دەستەسڕی گرت بە دەستەوە و دەستی کرد بە سێپێیی و وتی: «قوربان! بیشمکەوێ هەر نامەوێ، بیشمکەوێ هەر نامەوێ».

**٧١.** ئەڵێ کابرایەکی کورد جووتێ گا و کەرێکی هەبوو. هەموو ڕۆژێ گایەکانی ئەبرد بۆ جووت. ڕۆژێك یەکێ لە گاجووتەکان چووە لای کەرەکە وتی: لە ڕێی خوادا تەگبیرێکم بۆ بکە، خۆ من ئەوەندە جووتیان پێ کردم پسام. کەرەکە وتی: ئێوارە کە کایان بۆ هێنای و کزنیان دایتێ، مەیخۆ؛ ئینجا خاوەنەکەمان وا ئەزانێ نەخۆشی ئیتر جووتت پێ ناکا.

لەسەر تەگبیری کەرەکە گاجووت ئێوارە نە کای خوارد و نە کزن. کابرای خاوەنی وتی: ئەگەر جووتەکەم پەکی بکەوێ ماڵویران ئەبم؛ چاك وایە ئیمڕۆ کەرەکە بەرم لەگەڵ گاجووتی پێ بکەم هەتا گاکە چاك ئەبێتەوە. ئینجا کەری دایە بەر و بردی.

ئێوارە کە لە جووت هاتنەوە کەرەکە وتی: ئەمە من چیم کرد بە خۆم؟

ئەگەر چارێك نەدۆزمەوە تیاچووم. هەستا چووە لای گاجووتەکە وتی: فڵانی، لەبەر قاری تۆ دەردی خۆمم لە بیر چۆتەوە. پرسی: بۆچی؟ وتی: «ئاغەکەمان ئیمڕۆ لەگەڵ گاسێنێك قسەی ئەکرد ئەیوت: گایەکەم نەخۆشە ئەگەر چاك نەبووەوە سبەینێ وەرە لێم بکڕە سەری ببڕە». گاجووتی هەژار کە ئەمەی بیست ئێوارە دەستی کرد بە کا و ئالێك خواردن بەم جۆرە کەری قومارباز خۆی لە جووت ڕزگار کرد و سەری گای خستەوە ژێر نێڵ.

٧٢. ڕۆژێك کابرایەکی کورد لە هەیوان دانیشتبوو گۆشتەمریشکی سوورەوەکراو و هێلکەی کوڵاو و کولێرەبەڕۆنی ئەخوارد. کابریەکی سواڵکەر لەو وەختەدا هاتە حەوشە بانگی کرد: «برسیمە ئەوە چی ئەخۆن لە ڕێی خوادا بەشم بدەن». کابرای خاوەنماڵ گورج ڕانێکی مریشك و هێلکەیەك و کولێرەیەکی دایە دەست ژنەکەی، وتی بۆی بەرە. ژنەکە بۆی برد و دایە و گەڕایەوە. کە مێردەکەی تەماشای ژنەکەی کرد ئەوا فرمێسك بە چاویا دێتە خوارەوە و ئەڵێ: «یارەببی "الحمد لله"».

کابرا پرسی: کچێ بۆچی ئەگری؟ وتی: بەخوا ئەو سواڵکەرە وەختی خۆی مێردی من بوو؛ زۆر دەوڵەمەند بوو. ئێستا کە دیم سواڵ ئەکا بەزەییم پیا هاتەوە و هەقی بەسەرمەوەیە بۆیە ئەگریم. لێی پرسی: ئەوە بۆچی «الحمدلله»ت کرد؟ وتی: ئەمەش حەکایەتێکی لەسەرە. کابرا وتی: توخوا ئەگەر پێم نەڵێی؟

ژنەکە وتی: «مێردەکە! جارێك ئەم سواڵکەرە کە مێردم بوو وەکوو ئەمڕۆی تۆ دانیشتبوو نانی ئەخوارد. سواڵکەرێ هات هاواری کرد:

برسیمە، ئەوە چی ئەخۆی بەشم بدە. مێردەکەم نەیدایە. فەقیرەکەش نەڕۆیشت هەر داوای ئەکرد. ئاخری هەڵسا پەلێکی فەقیرەکەی گرت بە پاڵەپەستۆ کردیە دەرەوە و درگای داخست و هاتەوە دەستی کرد بە نانخواردن. فەقیرەکە بە ڕاکردن چووە سەر بانەکە و بازی دایە خوارەوە و دیسان هاواری کرد: چی ئەخۆی بەشم بدە زۆرم برسییە. منیش تکام لێکرد: خێرت ئەگا بەشی بدە. کابرا وەکوو هیچی نەدایە دارێکی هەڵگرت سێ داریشی لێ دا و دووبارە کردیەوە دەرەوە. ئێنجا منیش ئەوەی ئەو ڕۆژەی ئەوم بیر کەوتەوە لەگەڵ ئەمەی ئێستەی تۆدا کەوا تۆ ئەوەندە دڵت چاکە و بەشی ئەوت دا. شوکر لەسەر ئەوە ئەکەم کە تۆ ئەوەندە ڕژد نیت.

کابرای مێردی وتی: ئەم سواڵکەرە فلانی کوڕی فلانە کە ماڵی لە فلانە جێ بوو؟ وتی: بەڵێ. وتی: «دەسا ژنەکە ئەو سواڵکەرە کە تۆ گێڕاتەوە من بووم کە هاتم پاڕامەوە هیچی نەدامێ و دەری‌کردم و لەبەر برسێتی چوومە سەر بان خۆم خستە خوارەوە دیسان هیچی نەدامێ و سێ داریشی لێ دام».

**.٧٣** کابرایەکی کوردی خەڵکی «قەڵاچوالان» هەبوو زۆر بەدبەخت بوو. ئەو هەژارە هەر لە ماڵ بهاتایەتە دەرەوە ئیتر دوچاری دەردیسەری و چورتمێك ئەبوو. ڕۆژێك خزمێکی هات وتی: «مردووت مرێ! تۆ ئەمە چییە هەر لە ماڵەوە دانیشتووی؟ نە ئەچیتە ماڵ خزمێك، نە سەرێکی بازاڕ ئەدەی، نە دەرودەشتێك ئەکەی؛ وەکوو پشیلەی گوێ‌ئاگردان کەوتووی». وتی: برا چ بکەم ئەوەندە بەدبەختم هەر لە ماڵ چوومە دەرەوە ئیتر تووشی زەرەر و زیانێك ئەبم، ئێنجا کەوابوو

هەر لە ماڵەوە دانیشم باشە.

خزمەکەی وتی: ئەمەی تۆ ئەیڵێی هەمووی فیکر و خەیاڵی شێتییە. ئەمڕۆ وەرە لەگەڵ من، سەعاتێ ئەگەڕێین ئەگەر تووشی بەڵایەك بوویت ڕاستە، ئەگەر نەبووی ئەوا واهیمەیە گرتووتی، هیچیتر نییە. کابرا وتی: بڵێم چی؟ باشە، لەگەڵت دێم.

هاتن هاتن، تا گەیشتنە بەردەم سەرای حوکومەتییەوە. تەماشایان کرد کەوا ئەسپێك بەرەڵا بووە؛ بە تاو هات بۆ ناو بازاڕ. کابرایەکی خزمەتکار بانگی کرد: «خەڵکینە ئەسپی دارۆغەیە مەیەڵن بچێتە بازاڕەوە». کابرای بەدبەخت بەردێکی بچکۆڵەی هەڵگرت و هاویشتی بۆ ئەسپەکە بەڵکی بگەڕێتەوە بۆ سەرا و نەچێتە بازاڕەوە خەڵکەکە بکا بە ژێرەوە؛ کەچی بەردەکە کەوت لە چاوێکی ئەسپەکە و چاوێکی کوێر کرد.

خەڵکی کۆبووە و ئەسپەکەیان گرتەوە. کابرای مەیتەری دارۆغە پەلاماری کابرای بەدبەختی دا و وتی: «سەگباب تۆ ئەسپی دارۆغەت بۆچی بەم دەردە برد؟ یاڵڵا با بڕۆین بۆلای قازی. شەرت بێ هەر ئێستە ئەسپەکەت پێ ببژێرم».

هێنای... نەختێ هاتن بەملاوە، کابرایەکی شارباژێڕی کەرێکی بە بارەدارەوە لەناو قوڕا کەوتبوو، بانگی ئەکرد: خەڵکینە! [خوا] خێرتان بنووسێ وەرن ئەم کەرەم لەگەڵ ڕاست بکەنەوە. هیچکەس گوێی نەدایە. کابرا وتی: بەخوا من ئەم خێرە ئەکەم، چوو کلکی کەری گرت و وتی: «یائەڵڵا». کلکی کەر لە بندا پچڕا. خاوەن کەرە وتی: «خوا بتگرێ تۆ ئەم کەرەی منت بۆچی بەم دەردە برد؟ وەڵڵا منیش کەرەکەت پێ ئەبژێرم». ئەوا شکاتکەر بوون بە دوو.

کابرا وتی: وا چاکە هەڵێم ئەگینە ئەمانە بە پەنم ئەبەن؛ تەماشای کرد

ماڵێکی خۆش تاکێکی قاپییەکەی پێوە دراوە تاکێکی کراوەتەوە. تەکانی دا خۆی لەدەست مەیتەر ڕاپسکان و فڕکەی کرد بۆ ماڵەکە. مەگەر ژنی خاوەن ماڵەکە زکی پڕ بوو لە پشت ئەو تاکە قاپییەکەوە کە پێوە درابوو سەیری کۆڵانی ئەکرد، کابرا وەها بە توند قاپی کردەوە درا لە زکی ژنەکە و دەستبەجێ کەوت و مناڵەکەی لە بار چوو. کابرای خاوەن خانوو وتی: «دەری نەکەن ئەو سەگبابە!». کابرا بە پەیژەدا سەرکەوتە سەر بان، پێنج شەش کەس بە دوایەوە. تەماشای کرد خانووێکی زۆر بەرزە، ئەوا لە حەوشەکەیدا جێگایەك داخراوە وتی: وا چاکە باز بدەمە سەر ئەو نوێنانە، ئەگەر ملم شکا ئەوا ڕزگارم ئەبێ، ئەگەر خۆ هیچیشم لێ نەهات دیسان دەرباز ئەبم، چونکە ئەمانەی بە شوێنمەوە ناوێرن باز بدەنە خوارەوە. ناوی خوای هێنا، تف لە شەیتان دوور لە ڕەحمان، بازی دایە سەر جێگاکە. مەگەر کابرایەك نەخۆشە لەناو نوێنەکانا نوستبوو. کە بازی دا کەوت بەسەر ورگیا، ئەویش دەسبەجێ گیانی دەرچوو. خێزانی ئەو ماڵەش کەوتنە دوای. ها لێرە، ها لەوێ ئاخری گرتیان باڵیان بەست و هێنایان بۆ سەرا.

قازی لە هۆدەی خۆی نەبوو، هۆدەیەکی بچکۆڵە هەبوو بۆ حەسانەوە تەرخان کرابوو لەوێ بوو. ئەمانە کە هاتن یەکێ برا کوژراو، یەکی ژن منداڵ لە بار براو، یەکێ ئەسپ کوێر کراو، یەکێ کلکی کەر پچڕاو؛ کردیان بە هەرا. قاپییەوانەکە وتی: کوڕە هەرا و قرەقرِ مەکەن جەنابی قازی لە ژوورەوە دەوری دەلائیل ئەکاتەوە.

کابرای بەدبەخت پەنجەرەیەکی بچکۆلە لە دیوارەکەدا بوو، لە پەنجەرەکەوە تەماشای کرد ئەوا قازی هەتیوێکی لووسی گرتۆتە بەرکار خەریکە لەگەڵی. کابرا بە دەنگێکی قایم وتی: «من هیچ ناترسم،

قازی ئەوا لەسەر بەرماڵ دانیشتووە بە شەرع ئیش ئەکا. چاویشم لێیە «دَلائِلُ الخَیْرات» ئەخوێنێ. کەوابوو هەرچی داد و عەدل بێ، ئەو ئەوە ئەکا».

قازی ئاورێکی بۆ کونەکە دایەوە کابرای ناسی. زۆری پێ نەچوو هاتە دەرەوە چوو لەسەر کورسی حوکمکردن دانیشت. خەڵکەکە چوونە ژوورەوە. کابرا کە برا کوژراو بوو، قازی لێی پرسی شکاتت چییە لەم کابرایە؟ وتی: قوربان! برایەکم نەخۆش بوو؛ لەماڵەوە لە حەوشە لە ژێر لێفێکدا کەوتبوو. ئەم کابرایە بازی داوەتە سەر زگی، براکەم مردووە داوای خوێنی برام ئەکەم. ڕووی کرد لە کابرای بەدبەخت و وتی: تۆ ئەڵێی چی؟ ئەویش وتی: «جەنابی قازی ئەفەنی من قسە و مودافعەم هەر ئەمەیە بۆ خاتری ئەو دەلائیلولخەیراتە کە تیلاوەتت ئەفەرموو و من چاوم لێبوو، بە عەداڵەت لەگەڵم بپزورەوە». قازی هێندێ فیکری کردەوە، وتی بە برا کوژراو: «پێویستە ئەم کابرایە بنێرین لەو جێگایە کە براکەت لێی کەوتبوو، لەوێ ڕاکشێ. تۆش لەسەر بانەوە باز بدەرە سەر زگی، بەم جۆرە بیکوژەرەوە». کابرا وتی: قوربان تۆ چی ئەفەرمووی؟ ئەگەر من لەو بانەوە خۆم بەردەمە خوارەوە ملم ئەبێ بە ئەسپۆن، نازانم ئەم سەگبابە چۆن ئەستۆی نەشکاوە؟ قازی فەرمووی: «ڕۆڵە لە مەجەللەدا وا ئەفەرموێ و ئێستەش تۆ حەقت هەر ئەمەیە». کابرا وتی: بەخوا من ئەم حەقەم ناوێ و لێی دا ڕۆیشت.

کابرا کە ژنی منداڵی لە بار چوو بوو، هاتە پێشەوە وتی: جەنابی قازی ئەفەنی ژنەکەم زگی پڕ بوو، لە دالاندا لە پشت قاپییەوە ڕاوستاوە، تەماشای کردووە ئەم کابرایە لە پڕ هاتووە قاپییەکەی بە جۆرێك داوە بە سنگ و زکیا دەستبەجێ کوڕێکی لە بار چووە. ئێستە داوای خوێنی

ئەو کوڕە ئەکەم.

کابرا دیسان وتی: «قوربان جەنابی قازی بە قوربانی ئەو دەلائیلولخەیراتە بم کە چاوم لێ بوو موتاڵات ئەفەرموو، هەر بە حەق».

قازی تۆزێ بیری کردەوە و ڕووی کردە کابرای مێردی ژنە وتی: «باوکم بە قانوون ئەبێ ژنەکە بدەین بەم کابرایە بچێ لەگەڵی خەریك بێ هەتا زکی پڕ ئەکاتەوە، ئەو وەختە بتداتەوە». کابرا وتی: قازی ئەفەنی ئەمە ناکەم. قازی فەرمووی: کوڕم حەقت هەر ئەوەیە بە شەرع و بە قانوون. ئەم کابرایەش بۆی دەرچوو.

ئەمجا خزمەتکاری دارۆغە هات وتی: قازی ئەفەنی ئەسپی دارۆغە بەربووبوو، ڕووی کردە بازاڕ. منیش بانگم کرد مەیەڵن. ئەم کابرایە بەردێکی هاویشت چاوێکی ئەسپەکەی کوێر کرد. ئەسپەکە نرخی سەد لیرە بوو، ئێستاکە دە لیرە ناکا. شکاتی بژاردنی ئەم پارەیە ئەکەم.

قازی وتی: کابرا تۆ ئەڵێی چی؟ کابرا دیسان هەر وتی: «قازی ئەفەنی بیکە بە خاتری دەلائیلولخەیراتەکە ئەگەر بە عەداڵەت لەگەڵم نەکەی». قازی لە دڵی خۆیا هەندێکی‌تر فیکری کردەوە ڕووی کردە خزمەتکاری دارۆغە و وتی: «پێویستە ئەسپەکە بکەین بە دوو لەتەوە، لەتە ساغەکەی بنێرین بۆ بازاڕ چەندی کرد، هەقی ئەو لەتە ـ کە چاوەکەی کوێر بووەـ لیێ ئەستێنین». خزمەتکارەکە وتی: «قوربان خۆ ئەسپەکە ئێستەش دە لیرە ئەکا، ئەگەر بیکەین بە دوو کەرتەوە هیچ ناکا؛ ئەمە چلۆن ئەبێ؟» قازی فەرموی: ڕۆڵە حەقی تۆ هەر ئەمەیە و لە مەجەللەدا وا ئەفەرموێ. کابرای خزمەتکار ملێکی بادا و شانی حیز کرد و ڕۆیشت.

کابرای کلکی کەر پچڕاو کە ئەمەی دی ڕانەوەستا لیێی دا ڕۆیشت. قازی بانگی کرد: وەرە کوڕە تۆش شکاتت هەبوو؟ وتی نەخێر قوربان

هیچ شکاتێکم نییە. وتی: ئەی ئەو کلکی کەرەت بۆچ بە دەستەوەیە؟ وتی: «قوربان ئەچم بۆلای قەرەج بێژنگ دروست ئەکەم» و لێی دا ڕۆیشت. کابرای بەدبەختیش بە دوعای خێر کردن بۆ قازی هاتە دەرەوە.

٧٤. قازی «هەواسان» لەگەڵ هەتیوێکی زۆر جوان سەروساخت دائەخا. هەرچەن ئامۆژگاری ئەکەن کە شوورەییە دەست لە یەخەی ئەم کوڕە بکەرەوە با ئابڕووت نەچێ، ئەم قسانە کاری تێ ناکا.

شەوێك پێکەوە ئەنوون، پادشا ئاگادار ئەکەن. ئەویش بەیانی زوو ئەچێتە سەر جێگاکەی. تەماشا ئەکا قازی کوڕێکی جوانی لە باوەشایە و خەنجەر لە کێلانا. بە هێواشی خەبەری ئەکەنەوە. قازی سەر بەرز ئەکاتەوە سەیر ئەکا ئیش لە ئیش ترازاوە؛ ئەڵێ: ڕۆژ هەڵهاتووە؟ ئەڵێن بەڵێ. ئەڵێ لە کام لاوە؟ ئەڵێن: وەکوو جاران لە ڕۆژهەڵاتەوە. ئەڵێ: کەواتە هێشتا قاپی تەوبە دانەخراوە؛ خوایە تۆبەبێ لەم ئیشە نابەجێیەم.

پادشا ئەڵێ ئەم قسانە کەڵکت ناگرێ، ئەبێ لەسەر ئەو کۆشکە بتخەمە خوارەوە پارچە پارچە ببیت بۆ ئەوەی هی‌تر چاوی بترسێ و کەسی‌تر جارێکی‌تر شتی وا نەکا. قازی ئەڵێ: «پادشاهم هی وەکوو من زۆرە، یەکێکی‌تر بخەرە خوارەوە با من چاوم بترسێ». پادشا پێی پێ‌ئەکەنێ و لێی خۆش ئەبێ.

٧٥. پیرێژنێکی پەڕپووت تاقە کوڕێکی هەبوو ناوی «هەباسێ» بوو. هەباسێ هەموو جار، ئەچووە دیواخانی ئاغا و ئەهاتەوە. دایکی لێی ئەپرسی: «ئەرێ ڕۆڵە هەباسە، لە دیواخان چە باسە؟» ئەویش ئەیوت: هیچ نییە دایە.

هەباسێ کوڕێکی هاوڕێی هەبوو، ڕۆژێك پێکەوە هاتنەوە بۆ ماڵەوە.

دایکی دیسان لێی پرسی: «ئەرێ ڕۆڵە هەباسە لە دیواخان چە باسە؟»
ئەویش وتی: هیچ نییە دایە.

کە هاتنە دەرەوە هاوڕێکەی لێی پرسی: ئەوە دایکت ئەم قسەیە بۆچ ئەکا؟ وتی: نازانم، هەموو ڕۆژێ کە ئەچمەوە ئەم پرسیارەم لێ ئەکا. کوڕە وتی: ئەوە تۆ نایزانی من تەگبیرێکت بۆ ئەکەم: سبەینێ کە چوویتەوە لێی پرسیت، بڵێ: دایە ئاغا لە دیواخان بڕیاری داوە ژنی بێ مێرد نەمێنێتەوە، تەنانەت پیرێژنێکیش کە هیچی لە بارا نەبێت، هەر ئەوەندە بتوانێ دوو هۆقە خوێ بکاتە هەمانەیەکەوە، ئەبێ بە مێرد بدرێ. بچۆ ئەمەی پێ بڵێ و وەڵامەکەم بۆ بێنەوە.

سبەینێ هەباسێ کە چووەوە دیسان دایکی پرسی: ئەرێ ڕۆڵە هەباسە، لە دیواخان چە باسە؟ ئەویش وتی: دایە شتێکی وا نییە تەنها ئەوە نەبێ و قسەکەی بۆ گێڕایەوە. وتی: ئا توخوا ڕۆڵە دوو هۆقە خوێم بۆ بکەرە ئەو هەمانەیەوە، بزانم ئەتوانم هەڵیگرم. کوڕە هەستا خوێی بۆ کردە هەمانەوە، پیرێژن بە نقەنق پێوە نیشت و هەڵیگرت. وتی: لام وایە ڕۆڵە کەڵکم پێوە هەیە. ئەویش وتی باشە.

کەوتنە سبەینێ، هەباسێ لەگەڵ کوڕەکەی هاوڕێیدا هاتنەوە بۆ ماڵەوە. کوڕەکە وتی: داپیرە، لە شەرعی خوا و پێغەمبەرە مێرد کردن. ئێستەش وا لە سەر قسەی ئاغا ئەبێ ژنی بێمێرد نەمێنێتەوە. ئێمەش مێردێکمان بۆ تۆ دۆزیوەتەوە ئەبێ مێردی پێ بکەی. پیرێژن وتی: باشە بەقوربانت بم! مادام ڕووم لێ ئەنێی دڵت ناشکێنم کەیفی خۆتە. کوڕەش ئەڵێ: دە باشە خوا موبارەکی کا. تۆ خۆت ڕێکخە تا ئێمە خەبەر بە ماڵی زاوا ئەدەین.

پیرێژنە دەست ئەکا بە خۆ ڕێکخستن و تاسولووسدانی خۆی. سبەینێ

کوڕەکە و هەباسە دێنەوە و گوێدرێژێك دێنن. کوڕە دێتە ژوورەوە ئەڵێ: داپیرە هەستە با بڕۆین. ئەویش ئەڵێ ئاخر من مارە نەکراوم چۆن بچین؟ ئەڵێ مەلا و شاهید و هەموو شت لە ماڵی زاوادا دانیشتوون چاوەڕێمان ئەکەن، لەوێ مارەت ئەبڕن. پیرێژنە دێتە دەرەوە سواری کەرەکەی ئەکەن و کابرا بە دووزەلە لێدان پێش ئەکەوێ و هەباسەش ئەکەوێتە شوێنی. ئەیبەن هەتا ئەگەنە بەر کونەورچێك، لەوێ ئەیبەنە ژوورەوە، پێی ئەڵێن تۆ لێرە دانیشە تا ئێستە مێردەکەت دێت بۆ لات، ئێمە ئەچین. هەباسێ بە وەکالەتی تۆ مارەت ئەبڕێ.

لەوێ دائەنێن و خۆیانی لێ دائەگرن. زۆری پێ ناچێ ورچە بە بۆڕەبۆڕ دێتەوە و ئەچێتە کونەکەی خۆیەوە. سەیر ئەکا وا نێچیرێکی بۆ دانراوە. ئەچێتە سەری و بە قەپاڵ بەرئەبێتە سەر و گوێلاکی پیرێژنە.

پیرێژنیش لای وا ئەبێ ئەمە مێردەکەیەتی. چونکە تاریك بوو چاوی لێ نەبوو هەر ئەیوت: چۆن وا ئەبێ؟ باوکی هەباسێ ماچ ماچۆکی ئەکرد، قەت قەپۆکی نەئەگرد. ورچە پیرێژن هیلاك ئەکا و لەوانە ئەبێ بیخوا کوڕەکان لێی ڕائەپەڕن و ورچە ئەکوژن و پیرێژنی لە دەست ڕزگار ئەکەن. کە ئەیهێننەوە نیوە گیانێکی تێدا ماوە. ئینجا هەباسێ پێی ئەڵێ: «ها دایە ئەو ئەشکەوتە چی تیایە؟» ئەویش ئەیوت: «هەباسە، نە دەنگ هەیە و نە باسە، سەرم لەم کارە کاسە».

**٧٦.** حسێن خانی حاکمی «سورداش» ـ کە ئێستایش شوێن قەڵاکەی لە گردی بەینی سورداشی ئەمدیو و ئەودیوا ماوە و خۆیشی لە سورداش نێژراوە ـ حاکمێکی بە زەبروزەنگ و نان بدە و زرنگ ئەبێ. ڕۆژێك کابرایەکی «سورقاوشان»ـی کۆڵێکی لە نۆبەرەی

خەیار بۆ دێنێ و بەو بەرەوژوورەدا سەرئەکەوێ تا ئەگاتە بەر سەرا. قاپیوان ڕێ نادا بچێتە ژوورەوە، ئەڵێ برۆ دوو ڕۆژیتر وەرەوە. ئەویش ئەڵێ لە ڕێی خوادا خەیارەکان سیس ئەبن و تا ئەوسایە لەلایەکیتریشەوە بۆی دێت، من بەخششم بەرناکەوێ. قاپیوان ئەڵێ: ئەگەر بەخششەکەت ئەدەی بە من، ڕێت ئەدەم. کابرا ئەڵێ: چواریەکێکی بۆ تۆ و ئەویتری بۆ من؛ دەس ئەکەن بە سەروخوار کردن، لە ئاخرا بە نیوەیی ڕێ ئەکەون. خەیار ئەبا؛ خان ئەڵێ: «دە تمەن»ـی بدەنێ؛ کابرا نایەوێ. خانیش توورە ئەبێ ئەڵێ: مادام بەخششی منی ناوێ دە داری لێ دەن. سێ داری لێ ئەدەن هاوار ئەکا بوەستن، قسەم هەیە. خان فەرمووی چییە؟ ئەڵێ: «قوربان! کە خەیارم هێنا، قاپیوان نەیهێشت بێمە خزمەتت، وتی: هەرچی بەخشش وەرئەگری بۆ من بێ ئینجا ڕێت ئەدەم، لە پاشا هاتە سەر سێیەك و دوایی بوو بە نیوەیی. ئێستا سێ دارم خوارد، ئەوا سێیەکەکە؛ من بە سێیەك کرە ئەکەم، ئەویتری بۆ قاپیوان بێ.

قاپیوان بانگ ئەکەن سێ داری لێ ئەدەن، ئەڵێ: «قوربان! بە سێیەك ڕازیم، لە لووتی خۆم و باوکیشم دێتەوە». خان پێئەکەنێ، پەنجا تمەن ئەدا بە کابرا و قاپیوانیش جارێ هەر تۆپە جاوەکەی بۆ ئەمێنێتەوە.



# گەنجی درەخشان

**٧٧.** لە سەرگوزەشتی کوردانەیە، ئەڵێ: کابرایەکی جۆڵا ژنێکی جوانی هەبوو؛ ژنەکە ئەیویست حاشای لێ بکا، بەڵام مێردەکەی تەڵاقی نەئەدا.

بە ڕێکەوت حاکمی ئەو شارە خەوێکی دیبوو، جارچی جاڕی دا کە پادشا خەوی دیوە و نایشی گێڕێتەوە. هەرکەس بێت و بڵێ تۆ ئەو خەوەت دیوە و تەعبیری بۆ لێ بداتەوە، خەڵاتێکی زۆری ئەکا. ژنی جۆڵا ئەمەی بە هەل زانی و وتی: خەبەری لێ ئەدەم کە خەو ئەزانێ لە پاشا نایشی زانێ، پادشا ئەیکوژێ و من ڕزگارم ئەبێ لە دەستی. هەستا چووە لای پادشا و وتی: قوربان! مێردەکەی من ئەگەر کەسێ لە وڵاتێکی تریش خەون ببینێ، لێرە ئەو ئەزانێ و تەعبیریشی زۆر چاك لێك ئەداتەوە. بەڵام دەخیل کارێکی وا مەکە بزانێ من خەبەرم لێ داوە ئەگینا دەمکوژێ.

پادشا دەستبەجێ ناردی جۆڵایان کێش کرد. وتی: جۆڵا! خەوم دیوە پێم بڵێ چیم دیوە و تەعبیریشی چییە؟ جۆڵا وتی: قوربان! ئەمە ئیشی عالم و مەشایخە، من جۆڵام؛ جۆڵا ئەم جۆرە شتانە لە کوێ ئەزانێ؟ جۆڵا هەرچەندە داد و بێدادی کرد کەڵکی نەبوو، ئاخری پادشا ئەمری کرد ڕایانخست بە دار ئەوەندەیان لێدا هەتا لە زمان کەوت. ئەمجا هاواری کرد پادشاهم شەوێك مۆڵەتم بدە ئەگەر عەرزم نەکردی بمکوژە.

پادشا بەرەڵای کرد کە سبەینێ بێت و پێی بڵێ.

جۆڵا چووە شاخی «کەرەفتوو» لە بەردەمی ئەشکەوتەکەدا دانیشت و دەستی کرد بە گریان بۆ حاڵی خۆی. وەختی عەسر ئەژدەهایەك لە ئەشکەوتەکە سەری هێنایە دەرێ وتی: ئەوە بۆچی ئەگری؟ جۆڵا کارەساتی خۆی بۆ گێڕایەوە. ئەژدەها وتی: جۆڵا! ئەگەر پێت بڵێم ئەو خەڵات و بەراتە کە وەریئەگری، نیوەی ئەدەی بە من؟ جۆڵا وتی: بەقوربانت بم هەزار جار! ئەژدەها وتی: دە هەستە بچۆ بە پادشا بڵێ: «لە خەوتا لەجیاتی باران مەیموون ئەباری و حەوشەی ماڵەکەت پڕ بووبوو لە مەیموون». ئەویش ئەڵێ وابوو. ئینجا مەعناکەی ئەوەیە کە ئیمساڵ خێر و بەرەکەت زۆر ئەبێ و خەزێنەت پڕ ئەبێ لە پارە.

ئیتر جۆڵا چووە لای پادشا و بەم جۆرە پێی وت. پادشا ئەمری کرد گەنج و جەواهیرێکی زۆریان دایە جۆڵا. جۆڵاش هەموو خەزنەکەی بردەوە بۆ ماڵەوە لە دڵی خۆیدا لێکی دایەوە من بۆچی لەم خەڵاتە بەشی ئەژدەها بدەم؟ خۆ مار دوژمنە، وا چاکە بچم بیکوژم. تیروکەوانێکی هەڵگرت و چووە بەردەمی ئەشکەوت. مارەکە سەری هێنایە دەرەوە. جۆڵا تیری خستە کەوان بیهاوێ، مار کشایەوە دوا و نەکوژرا.

جۆڵا هاتەوە دەوڵەمەند بووبوو. مەسەلی کوردییە ئەڵێ: «کاسەی پڕ ئاشتی ماڵە»، ژنەکە ئیتر ملی بۆ ڕاکێشا.

لە دوای یەك دوو مانگیکە پادشا دیسان خەوی دی و جۆڵایان هێنا و فەرمووی: ئیمشەویش خەوێکی سەیرم دیوە پێم بڵێ. جۆڵا وتی: قوربان بەخوا نایزانم. پادشا وتی: من ئەمانە نازانم ئەتکوژم. بە کورتی نەختێکی تریان چەرمەسەری دا، دیسان مۆڵەتی خواست و چووەوە بەردەمی ئەشکەوت زۆر گریا و پاڕایەوە. مارەکە سەری هێنایە دەرەوە پرسی: جۆڵا چە باسە؟

وتی: دەخیل ئەژدەها، من کردم تۆ مەیکە، حاڵێکی وا هەیە ئەمجارەش فریام کەوە.

ئەژدەها وتی: تۆ پیاوێکی خراپی؛ وەکوو لە خەڵاتەکە بەشم نادەی ئەتەوێ بشمکوژی. جۆڵا وتی: ناماقووڵیم کرد، بمبخشە. ئەژدەها وتی: بچۆ بڵێ پادشاهم لە خەوتا دووربینێت بە دەستەوە بوو، تەماشای دنیات پێ ئەکرد. تەعبیریشی ئەوەیە کە چەن وڵاتی‌تر ئەگری و ئەیخەیتە سەر وڵاتی خۆت.

جۆڵا هات بەم چەشنە بۆ پادشای گێڕایەوە، ئەمجارە دوو ئەوەندەی جاری پێشوو خەڵاتی وەرگرت. دیسان لە دڵی خۆیا وتی: بۆچی بەشی ئەژدەها بدەم؟ بەخوا نایدەم.

لە دوای یەك دوو مانگی‌تر هەمیسان پادشا ناردی بە شوێن جۆڵادا وتی: جۆڵا خەوێکی‌تریشم دیوە. جۆڵا دیسان مۆڵەتی خواست و چووەوە بەردەمی ئەشکەوت، هەندێکی چاك قۆڕاندی. ئەژدەها سەری هێنا وتی: دەی جۆڵا ئەمجا چیت ئەوێ؟ جۆڵا ئەحواڵی خۆی بۆ گێڕایەوە. ئەژدەها وتی: بچۆ بڵێ «پادشاهم لە خەوتا سواری کەر بووبووی گوریسێکت بە دەستەوە بوو». ئەویش ئەڵێ: وایە. بڵێ: «حکوومەتەکەت زۆر بەهێز ئەبێ و گەلێ دەوڵەمەندتر ئەبی».

جۆڵا چووە لای پادشا و کارەساتی پێ وت. ئەمجارە لە هەردوو جارەکە زیاتر بەخششی وەرگرت.

جۆڵا لێکی دایەوە وتی: من زۆر بێ‌وەفام. وا چاکە خەڵاتی ئەم جارەم هەموو بەرم بۆ ئەژدەها. ئەو هەموو جەواهیر و ئاڵتوونەی دا بە کۆڵیا و چووە بەردەمی ئەشکەوت. مارەکە لێی پرسی: جۆڵا چییە؟ جۆڵا وتی: بەقوربانت بم! ئەمجارە هەرچم وەرگرتووە هەمووم بۆ تۆ هێناوە.

ئەژدەها وتی: «جۆڵا! من مارم، مار گەنج و جەواهیری بۆچییە؟ جۆڵا هەرچیت کردووە لێت ناگرم و لەم پیاوەتییەشت مەمنوون نابم؛ چونکە ئەوە هەموو کارەساتی ڕۆژگارە. ئەوەڵ جار زەمان وابوو کە چاکەت لەگەڵ هەرکەسێ بکردایە پاداشتی بە خراپە ئەدایەوە؛ دووهەم جار زەمان وابوو ئەگەر لە بەرامبەر چاکەدا چاکی نەبوایە خراپەش نەدەبوو؛ ئێستاش زەمان چاك بووە، ئەگەر چاکە لەگەڵ هەرکەسێ بکرێ کۆشش ئەکا بۆ ئەوە دوو چەندانە تۆڵەی بداتەوە».

**٧٨.** لە زەمانی پێشوو لەو کوردەوارییە شەڕە گا و شەڕە کەڵەشێر و شەڕە سەگ و شتی وا باو بووە؛ بەو بۆنەوە داستانی کوردی ئەڵێ: ڕۆژێك پادشایەك لەگەڵ وەزیرەکەی هەریەکێ گایەکی شەڕانییان ئەبێ. لەسەر گرەوێکی قورس شەڕیان پێ ئەکەن.

گای پادشا گای وەزیر ئەبەزێنێ و پادشا گرەوەکە لە وەزیر ئەستێنێ. کابرایەکی ڕووتەڵەی کورد ـ جووتیار ئەبێ ـ ئێوارە کە دێتەوە گایەکی کەوتووی لەڕی تووك ڕووتاوەی شاخ چەوت و چەوێڵی لە تەوێڵەدا ئەبێ، ئەچێ ئەڵێ: «گا ڕووت، خوا بتگرێ نە گێرە ئەکەی، نە جووت ئەکەی، نە بارم بۆ هەڵئەگری، هەر خۆت بە مردوو خستووە. کا ئەخۆی و هیچی‌تر». دوو سێ داری لێ ئەدا.

گا لەڕ ئەڵێ: ئاغا بۆچی لێم ئەدەی؟ ئاغاکەی ئەڵێ: کە تۆ ئیشێکم بۆ نەکەی بە کەڵکی چی دێیت؟ ئەمڕۆ گای پادشا و گای وەزیر شەڕیان پێ ئەکردن، گای پادشا پارەیەکی زۆری بۆ خاوەنی بردەوە. خۆ تۆ بە کەڵکی هیچ نایەی. گا ڕووت ئەڵێ: ئاغا هەر ئێستاکە لەگەڵ پادشا گرەو بکە، ئەگەر سبەینێ گای پادشام بەزان و گرەوەکەم بردەوە خزمەتم بکە.

ئەگەر من بەزام و دۆڕاندت، سەرم ببڕە و گۆشتەکەم بدە بە سەگ.

کابرای جووتیار دەستبەجێ ئەچێتە دیوانی پادشا، ئەڵێ: قوربان! من گایەکم هەیە شەڕی پێ ئەکەم. پادشا ئەڵێ لەسەر گرەو نەبێ شەڕ بە گای خۆم ناکەم. جووتیار ئەڵێ: منیش ئەمەوێ لەسەر گرەو بێت و لە دووسەد لیرەش کەمتر نەبێ. ئینجا هەردووکیان ڕێ ئەکەون کە یەکێ دووسەد لیرە بدەنە دەست پیاوێك، بەیانی گای هەرکەس سەرکەوت چوارسەد لیرەکەی بدرێتێ.

جووتیار دێتەوە ئەچێتە لای گا ڕووت ئەڵێ: دەخیلت بم گا ڕووت، دووسەد لیرەم قەرز کردووە، دامناوە بۆ گرەوی شەڕی تۆ، بەیانی ڕووزەرد و ماڵوێرانم نەکەی. [گا ڕووت ئەڵێ:] ئاغا ئەمر بکە دوو زەلام هەریەکێ سەبەتەیەکی زلە بە دەستەوە بگرن و لە پشتمەوە بیهێنن. کابرای جووتیار بە قسەی ئەکا. گا ڕووت هەر پەتی لە مل دائەماڵن، ئیتر پەلامار ئەدا. گای پادشا لەگەڵ چاوی بە گا ڕووت ئەکەوێ بەرەو دوا ئەبێتەوە و هەڵدێ. گاڕووت لە دواوە پێنج شەش قۆچ لە پاشەڵی هەڵئەدا. گای پادشا ببڕای ببڕای ئاوڕ ناداتەوە.

ئیتر کابرای جووتیار چوارسەد لیرەکە وەرئەگرێ و گا ڕووت پێش خۆی ئەدا و دێتەماڵەوە. ئینجا ئەپرسێ: گاڕووت پێم بڵێ چی بوو کەوا ئەو گا زەلامە نەیتوانی خۆی بۆ تۆ ڕابگرێ؟ گاڕووت وتی: «ئەوەی ڕاستی بێ ئاغە، من و ئەو گایە گوێرەکەی ماڵێك بووین. شەوێك من کام بۆ تێکرابوو، بەڵام هیچیان بۆ ئەو تێنەکرد و زۆری برسی بوو. لە نیوەشەوا لێم پاڕایەوە وتی: ئیمشەو تێرم بکە، شەرت بێ سبەی‌شەو سەبەتەیەکت کا بدەمێ. منیش وتم: ئەگەر سبەی‌شەو نەتدامێ چی؟ وتی: شەرت ئەکەم چەن شەو دوا بکەوێ، هەر شەوێ سەبەتەیەکت

قەرزار بم. ئینجا ئەمە شەش حەو ساڵە قەرزارمە. ئەمڕۆ کە چووین و لە دوورەوە منی ناسییەوە چاویشی بە سەبەتەکان کەوت، وایزانی بۆ قەرزەکە چووم و ئەو هەموو قەرزەشی پێ نادرێتەوە، لە بەرم هەڵات؛ ئەگینا ئەگەر بە شەڕ بوایە قەت من زەوتی ئەوم ئەکرد؟ ئەوە لە ترسی قەرزاری ڕایکرد، نەوەك لە ترسی زۆر و باهۆی من».

**٧٩.** حۆلی بیابان کە پێی ئەڵێن «غوول» (ئەمە سەرگوزەشتی کوردییە) فێر بووبوو بەهاران کە ئەچوو بۆ کوێستان، هەوارگەیەکی ئەخستە شاری «هەمەدان»؛ پاییزان کە ئەگەڕایەوە بۆ گەرمیان، دیسان لای ئەدایەوە هەمەدان. ئەگەرچی زیانێکی نەبوو، بەڵام لەبەر ئەوە کە بەقەد حەفتا هەشتا گوریس بخەیتە سەر یەك درێژ بوو، منداڵ و ژن کە چاویان پێ ئەکەوت ئەترسان و زۆریان زراویان ئەتەقی؛ خەڵکەکە بێزار بووبوون. ڕۆژێك پیاوێکی ئاقڵیان تەگبیری بۆ کردن کە ئەگەر قەرزاری بکەن، ئیتر نایەتەوە بە هەمەدانا.

چەند پیاوێك چوونە خزمەتی و وتیان: ئاخر نابێ تۆ بەم زلی و درێژییە بە ڕووتوقووتی ئەسووڕێتەوە، جوان نییە. وتی: بڵێم چی، خۆ من هیچم نییە کە جلی پێ بکڕم. وتیان: ئێمە جلت بە قەرز بۆ ئەکەین، ساڵێکی‌تر قەرزەکەمان بدەرەوە. غوول وتی: هەزار جار کوا ئێوە ئەوەم لەگەڵ بکەن؟ ئینجا هاتن هەموو شاری هەمەدان هەر ماڵێ تۆپێ جاویان گرد کردەوە، کراس و دەرپێ و کورتەکێکیان بۆ دروست کرد. ئیتر ساڵی دوایی غوول هات بچێ بۆ کوێستان، دوو ڕۆژە ڕێگە لە دەوری هەمەدانەوە بە چوار چەنگۆڵە ئەڕۆیشت نەوەکوو خەڵکی هەمەدان چاویان پێ‌بکەوێ و داوای قەرزەکەی لێ بکەنەوە.

**٨٠.** کابرایەکی کورد هەبوو ماڵ و سامانێکی زۆری هەبوو. لەگەڵ ئەم سامانەیا تاقە کوڕێکی هەبوو، بە هەموو جۆرە نازدارییەك ئەم کوڕەی بەخێو کرد و زۆر دڵی پێ خۆش بوو. دنیا تا سەر بۆ کەس نییە؛ باوکەکە بەهاری جوانی هاتە خەزانی پیری و گوڵی تەمەنی لە باخی ژیانا هاتە وەرین. کوڕەکەی بانگ کرد و وتی: «ڕۆڵە! من سامانێکی زۆرم بۆ کۆکردویتەوە. ئەوا ئەمە ئاخر چاوپێکەوتنێکە کە تۆ ئەم باوکەی خۆت چاوپێئەکەوێ. گوڵی هیوام لە دنیادا تۆ بووی، بۆیە ئەو هەموو ڕەنجەم دا تا ئەم سامانەم بۆ کۆ کردیتەوە، بۆ ئەوە من لە سێبەری تۆدا و تۆ لە سێبەری ئەو سامانەدا بحەسینەوە. ئەوا من ئەڕۆم، نەحەسامەوە؛ بۆ ئەوە تۆ بحەسیتەوە. سێ ئامۆژگاریت ئەکەم، لە قسەی ئەم باوکی خۆتە دەرمەچۆ، ئەم ئامۆژگارییانە بەجێبێنە:

یەکەم، تا ماوی تیواز ( قومار) مەکە، ئەگەر هەر زۆر ئارەزووت کرد بیکەیت، بچۆ بگەڕێ بزانە وەستای هەموو قوماربازەکان کامەیە لەگەڵ ئەودا بیکە.

دووهەم، تا ماوی مەی (عەرەق) مەخۆرەوە، ئەگەر خۆ خۆتت پێ ڕاگیر نەکرا ویستت بیخۆیتەوە، بچۆرە مەیخانە بیخۆرەوە.

سێهەم، هەرگیز مەچۆرە لای ژنی جوندە (قەحبە) ئەگەر هەر هەڵیانخڕانیت و ویستت بچیت، لە ئاخروئۆخری شەودا بچۆرە جوندەخانە (قەحبەخانە) لەوێ ئیشی خۆت ببینە. ئەمانە ئەندەرزی منن بۆ تۆ لە قسەم دەرمەچۆ».

باوکە مرد و ماوەیەکی پێچوو، کوڕوکاڵ هاتن و دەوری کوڕیان دا، وتیان دنیا ئەمەی پێ ناوێ و هەموو کەس ئەبێ بمرێ. پیاویش ئەگەر لە دنیادا ماڵ و دەوڵەتی بوو، ئاهەنگ و بەزمی لەسەر نەکا چ

کەڵکێکی هەیە؟ خۆ تۆ گۆشەگیریت نەگرتووە لە دنیادا، بۆچ ئەوەندە خۆت ئەپارێزی؟ دنیا بۆیە خۆشە، پیاو قوماری تێدا بکا؛ بۆیە خۆشە کە خەمەکەی بە بادەی مەی بڕەوێنێتەوە، لەگەڵ نازداران و گوڵەندامانا ڕابوێرێ. ئەم باوەڕە کۆنەیە چییە تۆ کەوتویتە سەری؟ هەستە، هەستە با بڕۆین تۆزێ لە لەزەتی دنیا تێبگەی.

هەرچەندە کوڕە هاواری کرد و هەرچەندە وتی: ئاخر باوکم پەندی داداوم کە ئیشی خراپە نەکەم، کەڵکی نەبوو. وتیان: ئا تۆ هەستە با بچین دەستێ قومار بکەین، ئەو وەختە ئەگەر تا ماوی وازت لێ هێنا ئێمە هیچمان نەزانیوە. بێئەقڵ! قومار ڕۆژبەڕۆژ پیاو دەوڵەمەندتر ئەکا، باوکت ئەگەر لێی بزانیایە و بیکردایە ئەو سامانەی ئێستەی ئەبوو بە دوو ئەوەندە.

بەم جۆرە قسانە کوڕەیان لە خشتە برد و وتی: «باشە، بەڵام ئەوەندە هەیە من کە لێرەدا قسەکەی باوکم ئەشکێنم، لەوەدا نایشکێنم کە پێی وتم: ئەگەر تیوازت کرد لەگەڵ گەورەتر تیوازبازەکانا بیکە. با بچین بزانین کێ لە هەموو کەس قومارباززترە و وەستای قومارباڕانە من لەگەڵ ئەودا ئەیکەم». وتیان: باشە.

لێیان دا ڕۆیشتن لەم شار بۆ ئەو شار و لەم وڵات بۆ ئەو وڵات، پرسیاریان لە وەستای قومارباڕان ئەکرد، هەتا لە ئاخرا ناو و نیشانیان دانێ کە لە فڵانەشوێن یەکێك هەیە و لە دنیادا لەوە قومارباززتر ئیتر نییە؛ چوون دۆزییانەوە.

کوڕە لەگەڵ هاوڕێکانیا چوون، سەیری کرد، سەریان کرد بە کەلاوەیەکی وێرانەی پەڕپووتا. کە چوونە ژوورەوە پیاوێك دانیشتووە پیسوپۆخڵ، گڵێمە شڕێکی خستۆتە ژێری، گۆگرد بە خۆیەوە بنێ بۆسۆی

لێ هەڵناسێ، لەبەر ڕووتی و پەرێشانی.

وتیان: ئەمە وەستای هەموو قوماربازەکانی دنیایە و لەم وەستاتر ئیتر نییە. کوڕە سەیرێکی فەساڵ و دیمەنی کابرای کرد و وتی: ئەمەیە کە باندەسی لە قومار کردنا نییە؟ وتیان: بەڵێ، تۆ چاوت لەو حاڵوباڵەی نەبێ، ئەوە زەمان هێناویە بەسەریا؛ ئەگینا ئەمە ئەوەندە دەوڵەمەند بوو، کەس لە ژوور ئەمەوە نەبوو.

کوڕە وتی: «براینە! ئەوپەڕی ئەوەیە کە منیش لە پێناوی قومارا سەرکەوتم و بووم بە وەستایەك وەکوو ئەم وەستایە. لە ئاخرا ئەبێ حاڵوباڵیشم ببێ بە حاڵوباڵی ئەو، وە ئەمە پاشەڕۆژی پیاوی وەستای قوماربازان بێ، ئەی ئەبێ پاشەڕۆژی پیاوی شاگرد قومارباز چی بێ؟ کەواتە لە کوێوە هاتووین با بە شوێنەکەی خۆمانا بگەڕێینەوە. دەرزێکی باشم وەرگرت؛ بۆم دەرکەوت کە پاشەڕۆژی قومار کردن چییە». هەرچەندە دۆستەکانی هاواریان لێ کرد، کەڵکی نەگرت و گەڕانەوە.

سا ڕۆژگار هێنای و بردی، دیسان کوڕگەل و دۆست و برادەر دەورەیان دایەوە وتیان: مردووت مرێ، ئەڵێی پشیلەی گوێئاگردانی، لە گوێئاگردانەکە بەولاوە هیچیتر نازانی. دە هەستە بۆ ئەوەندە ڕژدی؟ تۆ ئەم هەموو سامان و ماڵەت هەیە، ئاخر ئەبێ جارجار پێکە عەرەقێکی بۆ بخۆیتەوە؛ بە لانی کەمەوە بۆ ئەوە تۆزێ لە پەژارە دوور کەویتەوە. ئەوەشت پێ ئەڵێین جارجار بە خواردنەوەی پێکە عەرەقێك سامانەکەت دوایی نایە. دە هەستە ئیتر ڕژدی مەکە.

کوڕە وتی: «بەگوێتان ئەکەم، بەڵام باوکم پێی وتووم ئەگەر خواردتەوە بچۆرە مەیخانە. ئێستەش من لەوێدا نەبێ ناخۆمەوە». وتیان: باشە، دەوا بڵێ.

هەستان تێکڕا ڕوویان کردە مەیخانەیەك. کە چوونە ژوورەوە کوڕە سەیری کرد ئەوا یەکێك لە لایەکەوە کەوتووە و دەمی چەقیوەتە خۆڵ و خاکەکە، یەکێکی‌تر خۆی لە خۆیەوە هەستاوە لەو ناوەدا سەما ئەکا، دووی‌تر لەولاوە بەربوونەتە سەروگوێلاکی یەك و لە یەکتری ئەدەن. یەکێکی‌تر دەنگێکی زۆر ناسازی پێوەیە فووی پیا کردووە مێشکی ئەو عالەمەی بردووە. بە کورتی هەریەکە لە سازێ لێ ئەدا. کوڕە پرسی: ئەم هەرا و زەنایە چییە؟ هاوڕێکانی وتیان: ئاخر ئەوە ئەمانە عەرقیان خواردۆتەوە، سەرخۆش بوون و کەیف و ئاهەنگ ئەکەن. کوڕە وتی: «دەك موبارەك نەبێ! ئەمەیە بەری مەی خواردنەوە و ئەمەیە ئاهەنگ و ڕابواردن؟ من پارەش بدەم و ئاواشم بەسەر بێت؟ هەستن کاکە، من شتی وا ناکەم و وا خۆم گەوج ناکەم». هەرچەندە هاواریان کرد، وتیان: ئەمە شتێکی وا نییە، کەڵکی نەگرت و گەڕانەوە.

زۆری نەخایاند دەستە دۆستێکی‌تری لێ پەیدا بوو، هەموو کوڕە کوڕەی گەڕەك بوون. هاتن وتیان: ماڵ‌وێران ئەمە تۆ شێتیت، گەوجیت، چیت؟ ئێجگار بێ‌نەفسیش بەم جۆرە؟ خۆ تۆ شێخی سەنعان نیت وا خۆتت کوشتووە؟ دە هەستە با بچین چاوێکت بە دنیا بکەوێ، تەماشایەکی ئەو ناسك و نازدارانە بکە کە هەموو ئەڵێی پەرین و لە بەرگی عینسانان. تۆزێ لەگەڵیان ڕابوێرە، جا ئەو وەختە ئەزانی کە بەری دنیا چەند خۆشە و ئەو ماوەیە تۆ هەموو عومری خۆتت بە خۆڕایی دۆڕاندووە. دە هەستە، هەستە لەسەر ئەم عەقڵە کۆنەیە بێرە خوارەوە، با تۆزێ لە دنیا تێ‌بگەی. لە دڵی خۆیا وتی: لە سێ پەندەکەی باوکم هەر ئەمەیان ماوە؛ ئەوانم بە گوێ نەکرد و قسەم شکاند، ئەمەیان هەر ئەبێ بە گوێی بکەم و دەست نابەم بۆ ئەم ئیشەیان.

کوڕوکاڵ هەرچەند لەگەڵی خەریك بوون، کەڵکی نەگرت و لەگەڵیان نەچوو. ئەوان زۆریان وت و ئەم کەمی بیست. بەم جۆرە لەگەڵی خەریك بوون و هەر جارە لەو قسە غەرامییانە کە پیاو ئەبزوێنێ بۆیان ئەگێڕایەوە و جارجاریش تانووتیان لێ ئەدا. تا لە ئاخرا وایان لێ کرد کە مل بێنێتە ژێر بار و لەگەڵیان بچێت. لێرەدا ئامۆژگارییەکەی باوکی کەوتەوە فیکر و وتی: بە لایەنی کەمەوە مادام هەر ئەچم با بەپێی ئامۆژگارییەکەی ئەو بچم. ڕووی تێ کردن، وتی: برا دێم لەگەڵتان، بەڵام ئەبێ بیخەینە ئاخروئۆخری شەو، با کەس نەمانبینێ. وتیان: باشە، تۆ چۆن ئەڵێیت با وابێ؛ هەر لەگەڵمان بێیت و تۆزێ بۆ خۆت خۆشی دنیا ببینیت. ئەوەشی وت کە: ئەبێ بچینە ماڵی ئافرەتێك کە لەوە جوانتر نەبێت. وتیان: ئەوە لەسەر ئێمە تۆ کارت بەوەوە نەبێ.

شەوێ داهات و سێبەشی ڕۆیشت. ئەمانیش هەڵسان لێیان دا ڕۆیشتن. کوڕگەل شارەزا بوون، چوونە ماڵێکی ناسراو کە زۆر جوان بوو. تەقەیان دا لە قاپی. ژنە نووستبوو خۆی لەناو جێگا هەستا و هات قاپی بۆ کردنەوە. کوڕە کتوپڕ «نڕناش»ـێکی بەرچاو کەوت. ئافرەتێکی پیسی ڕەنگ زەردی گژنی نووری جوانی لە ناوچاو بڕاو. سەر کولم و لێوەکانی کە بە ڕۆژ سووری ئەکردن دەرمانەکەیان لێ ببوەوە، کولم و لێوێکی پیس و ناشیرین شوێنی گرتبوون. لەش و هەندام و سەروبەچکی کە بە ڕۆژ بەهۆی دەوا و دەرمانەوە کردبوونی بە چەپکەگوڵ، ئێستا وەکوو گووژاڵکیان لێ‌هاتبوو. بە کورتی: دیمەنێکی هاتە بەرچاو، گەلێ ناشیرینتر لە دیمەنی خاتوو مەیموون.

وتی: ئەمەیە ئەو پەلك سەوزە کە ئەتانوت لە جوانییا شەوقی لە مانگ سەندووە. وتیان: ئەوە تۆ بە ڕۆژ چاوت پێ نەکەوتووە؛ ئێستا

لە هەموو ئیش بۆتەوە و نووستووە، لەناو جێگەی خەوا هەستاوە، دیارە هەموو کەس کە لە خەو ڕاست بێتەوە هەر وایە. وتی: «کاکینە! نووری جوانی ناگۆڕێ. پیاوێ کە خۆی بە پیاو بزانێ نایەت شوێنی ئەم جۆرە شتانە بکەوێ. ئەمە لەسەر قسەی ئێوە ناسك و نازدارترەکەیانە، ئەی ئاخۆ ئەبێ ئەوان چۆن بن؟ ئێستا تێگەیشتم کە باوکی من فەیلەسووف بووە، کە ئەم ڕاوێژانەی بۆ کردم. ئەوا هەرسێ پلەکەم تاقی کردەوە، تێگەیشتم کە بە شوێنکەوتنی ئەو شتانە بێجگە لە پەشیمانی و نەگبەتی هیچی‌تر دەستگیری پیاو نابێ و ئەنجامی هەموویان خەسارەتمەندییە».

ئەمەی وت و وتی: خواتان لەگەڵ و بە شوێنەکەی خۆیا گەڕایەوە.

**٨١.** ساڵێك لە «کەرکووك» لە مزگەوتی «مەنارەنەخشینە» یەکێك لە فەقێکان بۆ نوێژی نیوەڕۆ ئەچێ بۆ دەستنوێژ شتن. کە ئەچێتە عابخانەکە سەیر ئەکا پریاسکێکی گەورە لەسەر دیواری ئاودەستەکەیە. هەڵیئەگرێ، ئەڵێ هەتا خاوەنی پەیدا ئەبێ، گوناحە نەوەك دەست یەکێك بکەوێت نەیداتەوە. هەر ئەوەندە ئەزانێ لیرەیە و لیرەیەکی زۆریشە؛ ئیتر نایکاتەوە بزانێ چەند لیرەیە. نوێژەکەی ئەکا و ئەچێتە حوجرە.

لە دەمی عەسرا تەماشا ئەکا وا کابرایەکی زلە بە هەناسەبڕکێ هات و ڕەنگی لە ڕوو براوە و شپرزە بووە، خۆی کرد بە ئاودەستەکەدا و هاتەوە دەرەوە، بە چەپۆك بەربووە سەروگوێلاکی خۆی و دەستی کرد بە گریان و هاوار هاوار. خەڵکی خوا لێی کۆ بوونەوە وتیان: ئەوە چییە؟ چیت لێ قەوماوە؟ وتی: «خەڵکینە بۆ خاتری خوا ماڵم کاول بوو؛ من توجارم و غەریبم، خەڵکی «حەلەب»م. بۆ جەلەب‌کڕین هاتبووم بۆ ئەم وڵاتە،

هەزار لیرەم پێ‌بوو. هاتمە سەر ئەم ئاودەستە دەست بە ئاو بگەیەنم هەزار لیرەکەم لە سەر دیوارەکە دانا لە بیرم چوو، ئێستا کە چوومە بازاڕ، کەوتەوە فیکرم و بۆی هاتمەوە، سەیر ئەکەم نەماوە». ئەمەی وت و وەکوو بارانی بەهار ئاو بە چاوانیا ئەهاتە خوارەوە.

فەقێکە فیکری کردەوە و وتی: ئەم پیاوە غەریبە و ئەم پارەیەش ئێستا بۆ من حەرامە با پێی بدەمەوە، ڕەنگبێ دەست بەرێ لیرەیەکم بداتێ، ئەیدەم بە کەوایەك. ئەو لیرە حەڵاڵە هەزار لیرەی حەرام دێنێ. وتی: باوکم مەگری، پارەکەت ئەوەتا لای من. هەڵسا چوو بۆی هێنایەوە. کابرا کە تەماشای کرد ئەو گرێیەی لێی داوە گرێیەکەی نەکراوەتەوە. پارەکەی وەرگرت و لێی دا ڕۆیشت.

بۆ ئێوارە هاتەوە بانگی فەقێکەی کرد، دەستی برد تاقە پوولێکی دایە. وتی: «فەقێ! ئەو پوولە بەرە گووشە شەکرێك بکڕە و خۆتی پێ بخنکێنە». فەقێ وتی: مەعنای چییە؟ وتی: «مەعنای ئەوەیە من هەزار لیرەم دەستکەوێ، ئەیدەمەوە؟!». فەقێ وتی: برا من لەبەر خوا کردوومە، لەبەر پارە نەمکردووە. وتی: پێت ئەڵێم بچۆ گووشە شەکرێك بکڕە و خۆتی پێ بخنکێنە.

فەقێ بە دەم فەقێتییەوە ئەگەڕا، ڕێی کەوتە حەلەب. چوو لە مزگەوتێك لەلای مەلایەکی باش بە فەقێیەتی دامەزرا؛ خەریکی عیبادەت و خوێندن بوو. کۆشکێکی زۆر گەورە دراوسێی مزگەوت بوو. خاوەن کۆشکەکە ڕۆژێك هەرسێ تەڵاقی ئەکەوێ، دێتە لای مەلاکە بۆی چاك بکاتەوە. مەلاش ئەڵێ ئەم تەڵاقە چاك نابێتەوە مەگەر بە مارەبەجاش نەبێ. کابراش قەبووڵی ناکا چونکە توجارێکی گەورەی حەلەب ئەبێ پێی ناخۆشە ئەم ناوەی بکەوێتە شوێن. ئەچێ هەموو

دنیا ئەسووڕێتەوە چاری تەڵاقەکەی ناکرێ و ناتوانێ دەست لە ژنەکەشی هەڵبگرێ. چار ناچار دێتەوە لای مەلای گەڕەکەکەی خۆیان ئەڵێ: بۆم چاك کەرەوە، بەڵام نابێ کەس پێ بزانێ. مەلاش ئەڵێ هەرکەس بێت هەر ئەزانرێت، منێ فەقێیەکی غەریبی کەسنەناسی خەڵکی ئەو وڵاتی کوردستانەم لەلایە، پیاوێکی زۆر بەدینیشە. دێنین ژنەکە لەو مارە ئەکەین، شەوێك لەلای بێ و بۆ بەیانی تەڵاقی ئەدا، بەم جۆرە ڕەنگبێ کەس پێ نەزانێ. کابرا بەم تەگبیرە ڕازی ئەبێ.

ئینجا مەلا فەقێکە بانگ ئەکا ئەڵێ: «ڕۆڵە، پیاوێکی گەڕەکەکەی خۆمان تەڵاقی کەوتووە، ئێستا ئەمانەوێ بە تەحلیل چاکی بکەینەوە، لە تۆمان باشتر و ڕەزا سووکتر نەدیوەتەوە. من ژنەکەت لێ مارە ئەکەم و سەد لیرەشت لە کابرا بۆ وەرئەگرم، ئیمشەو لەلای ئەبی و بەیانی تەڵاقی ئەدەی، با کەسیش بەم کەینوبەینە نەزانێ». فەقێ بەم معامەلەیە ڕازی ئەبێ.

ئەکەوێتە ئێوارە، مەلا مجەورەکە و خۆی ئەبن بە شاهێد و ژنەکە لە فەقێ مارە ئەکا. مێردی ژنەکەش لەوێ ئەبێ؛ پیاوێکی بە دیمەن و بۆشناخ ئەبێ. مەلا بە فەقێکە ئەڵێ: ئەمە مێردی ژنەکەیە، کە کەوتە بەیانی سەد لیرەکەت بۆ دێنێ.

فەقێکە تەماشای کابرا ئەکا، ئەبینێ ئەمە کابراکەیە کە لە کەرکووك کیسە پارەکەی لێ بەجێماوە، لە پاشا پوولێکی دایێ وتی: خۆتی پێ بخنکێنە. زۆر سەری سووڕما، بەڵام کابرا ئەم ناناسێتەوە. ژنەکەش کە لەوێ ئەبێ، چاوی بە فەقێ ئەکەوێ سەیر ئەکا پیاوێکی لاوچاك و شۆخوشەنگە، ئەچێتە دڵیەوە. خێرا ئەنێری دەستێ جلی نایابی بۆ ئەبەن بۆ حەمام و بە فەقێش ئەڵێن بچۆرە حەمام. فەقێ ئەچێتە

حەمام خۆی تاس و لووس ئەدا و دەستەجلێ لەبەر ئەکا و ئەچێتە لای ژنە، وەکوو پادشازادەیەك بچێتە ژوورەوە ئاوا ئەبێ. ئەو شەوە لەگەڵ ژنەدا ڕائەبوێرێ و ژنە فەقێی بە تەواوی ئەچێتە دڵەوە.

لە بەری بەیانا فەقێ هەناسەیەك هەڵئەکێشێ، ژنە ئەڵێ: بۆچی ئەو هەناسەت هەڵکێشا؟ فەقێ ئەڵێ هیچ، خەیاڵێك بوو کردمەوە. ژنە ئەڵێ: نابێ، ئەبێ پێم بڵێیت. ئەڵێ: «فلانی ئەم کابرای مێردی تۆوە ساڵێك هاتە کەرکووك؛ وڵاتی ئێمە. هەزار لیرەی لەسەر دیواری عابخانەی مزگەوتێك لەبیر چوو، من دۆزیمەوە و پێم دایەوە. لە پاشا دەستی برد پوولێکی دامێ و وتی: بچۆ بیدە بە گووشە شەکرێك و خۆتی پێ بخنکێنە، وتم: بۆچی؟ وتی: یەکێ هەزار لیرەی دەستکەوێ ئەیداتەوە؟ ئەو وەختە وا و ئێستەش وەها». ژنە وتی هەروا؟ وتی: بەڵێ. وتی: «کەواتە ئەم ماڵ و کۆشك و دەوڵەتە کە تۆ ئەیبینی هیچی هی ئەو نییە، هەمووی هی خۆمە. وە ئێستا منیش بە شەرع ژنی تۆم و تۆیشم ئەوێ. تۆ ئیتر من تەڵاق مەدە، بەیانی کە هات بۆ ئێرە تۆیش دەست بەرە پوولێکی بۆ فڕێ دە، بڵێ: بیدە بە گووشە شەکرێك خۆتی پێ بخنکێنە. بەم جۆرە تۆڵەی خۆتی لێ بکەرەوە». فەقێ وتی: جا بە ڕاستتە؟ وتی: ئا.

بەیانی هەر لەگەڵ مەلا بانگدانا کابرای کۆنە مێرد هەڵسا چوو بۆ مزگەوت و چاوەڕێی ئەوەی ئەکرد فەقێ بێتەوە بۆ مزگەوت و ژنەکە تەڵاق بدا. فەقێ هەر دیار نەبوو؛ هەتاو کەوت فەقێ نەبوو؛ کابرا چووە لای مامۆستاکەی. مامۆستا مجەورەکەی نارد بەشوێنیا. ئەمیش وتی: «ماڵی خۆمە و ئێستا ئارەزوو ناکەم بێمە دەرەوە».

کابرا ئاگری تێبەربوو، هات بۆ ماڵەکەی خۆی. خانم وتی: قاپی

لێداخەن، مەیەڵن بێتە ژوورەوە. کابرا سەیری کرد قاپی لێ داخراوە، هەر لە دوورەوە بانگی فەقێی کرد وتی: هەڵسە وەرە ئیشم پێتە. فەقێ هیچ جوابی نەدایەوە. لە ئاخرا فەقێ لە پەنجەرەی کۆشکەکەوە پوولێکی بۆ فڕێ دا و وتی: «ئەو پوولە بەرە بیدە بە گووشە شەکرێك و خۆتی پێ بخنکێنە». کابرا کە ئەمەی بیست پەنجەی خۆی برد بە دەما و کەوتە فیکری کە ئەمە فەقێکەی کەرکووکە کە وەختی خۆی ئەم جەورێکی وای لەگەڵ نواند. بانگی کرد: «فەقێ من کردم تۆ نەیکەی». وتی: هەر ئەوەتا پێت ئەڵێم، بچۆ ئەو پوولە بەرە گووشە شەکرێکی پێ بکڕە خۆتی پێ بخنکێنە. ئیتر جارێکی‌تر سەری نەکردەوە بەو قاپییەدا و فەقێ کەوت بەسەر ئەو خەزنە و ماڵەدا.

٨٢. پیاوێك هەبوو لە شاری «سنە» زۆر دەوڵەمەند بوو. تەنها تاقە کوڕێکی هەبوو ئەویشی زۆر خۆش‌ئەویست، هەرشتێکی ئەکرد بێ‌دڵی نەئەکرد. کوڕەکەش لە پارە خەرجکردن و ئاهەنگگرتن ـ خوا هەقە ـ درێغی نەئەکرد؛ هەر ڕۆژێ دەستەیەکی کۆ ئەکردەوە ئەیبردن بۆ سەیران و گەڕان؛ بە هەموو جۆر پارەی بۆ خەرج ئەکردن. هەر شەوە کۆمەڵێکی‌تری کۆ ئەکردەوە ئەیهێنایە ماڵەوە، هەموو چەشنە خواردنێکی بۆ دروست ئەکردن و بە چاکتر خزمەت، خزمەتی ئەکردن.

هەرچەندە باوکەکەی پێی ئەوت: ڕۆڵە، تۆ ئەم ماڵ و پارەیە بۆچی وا ئەدەی بە دار و بەردا؟ ئەیوت: «بابە ئەمانە هەموو هاوڕێ و دۆست و برادەری منن. پارەیەك لە ڕێگەی دۆست و برادەرا نەبێ، بۆچی چاکە؟» باوکی ئەیوت: «ڕۆڵە، دۆست ئەوەیە بۆ ڕۆژی تەنگانە بە کەڵك بێ، نەك لە ڕۆژی پاروو داگرتنا هاوشان بێ. من ئەمە حەفتا ساڵم عومرە،

چواریەکێکی تۆ دۆست و ڕەفێقم نییە. نازانم تۆ هێشتا تازە خەتی سەوز بە لێوتەوە ئاڵاوە، [چۆن] ئەم هەموو دۆست و برادەرەت پێکەوە ناوە».

کوڕە ئەم قسانەی هیچ نەئەچوو بە گوێیدا. ڕۆژبەڕۆژ زیاتر تەخشان و پەخشانی ئەکرد و هەموو جاریش ئەیوت بە باوکەکەی: «تۆ نەتزانیوە چۆن دۆست ڕاگری؛ ئەمانە کە من هەمە هەموو دۆستی ڕۆژی لێقەومانن».

باوکە ئیتر لە وزەیا نەما و دڵیشی نەئەهات دڵی کوڕەکەی بڕەنجێنێ. ئەوا ئەم کوڕەش بەم جۆرە بینی پێوە بنێ، دوو ساڵیتری پێ ناچێ، پوولێکی بە دەستەوە نایەڵێ و هەچ ئامۆژگارییەکیشی ئەکا وەکوو نەخشی سەر ئاو وایە. ئاخری ڕۆژێك پێی وت: «ڕۆڵە، لەم عومری حەفتا ساڵیدا ـ کە پێم تێناوە ـ تەنها دۆست و نیوێکم هەیە؛ تۆیش وا بەم بیست ساڵ عومرە، زیاتر لە سەد دۆست و برادەرت هەیە. وەرە با تاقییان بکەینەوە بزانین چۆنن؟» کوڕە وتی: باشە.

کەوتە پاش نوێژی خەوتنان، باوکەکە هێنای مەڕێکی سەر بڕی. هەروا بە خوێنەکەیەوە خستیە تابووتێکەوە و مەوجێکی دا بەسەریا. بە کوڕەکەی وت: هەستە با بڕۆین بۆ ماڵی برادەرەکانت. کوڕە شوێنی کەوت... گەیشتنە بەر قاپی یەکێ لە برادەرەکان، تەقەیان دا لە قاپی. کابرای برادەری هاتە دەرگا و وتی: کێیە؟ کوڕەش وتی: منم. دەرگاکەی لێ کردەوە. ئای فلانکەس ئەوە تۆی! یاخوا بە خێر بێن، دەفەرموو وەرنە ژوورەوە.

باوکەکە وتی: «وەختی هاتنە ژوورەوە نییە، ئیشێکی خراپ قەوماوە». برادەر وتی: خێر بێ، چییە؟ وتی: «وەڵڵا فلانی! حەمە ئەم ئێوارەیە قەزاوقەدەر پیاوێکی کوشتووە. ئێستا لاشەکەمان هێناوەتە ماڵی خۆمان

و نەمانهێشتووە کەس پێ‌بزانێ؛ بە دەستیەوە داماوین. لە پاشا حەمە وتی: بابە ئەمەی پێ ناوێ فلانکەس ڕەفێقمە، ئەچین پێی ئەڵێین، ئەویش بێت لەگەڵمان پێکەوە لاشەکە ئەبەین بۆ سەر قەبران، تا نەکەوتۆتە بەیانی ئەینێژین. ئەوە ئێستا ئێمەش هاتووین. جا لەگەڵمان وەرە بەڵکوو ڕزگارمان بێت».

کوڕەی برادەر هەر ئەمەی بیست ناوچاوێکی دا بە یەکا و وتی: «ئەتانەوێ تووشی گۆبەندێکم بکەن؟ نە دیم و نە هیچیش. بڕۆن خواتان لەگەڵ!» ئیتر دەرگای داخست و چووە ژوورەوە.

باوکەکە وتی بە کوڕەکەی: ڕۆڵە قەیدی نییە، با بچین بۆلای یەکێکی‌تریان. چوون و لەگەڵ ئەویشا هەروەکوو خۆیان گەڕانەوە. ئەو شەوە تا بەیانی بە هەموو برادەرەکانا گەڕان، یەکیان نەبوو بڵێت باشە لەگەڵتان دێم؛ هەموو قاپییان داخستەوە و چوونە ژوورەوە و وتیان: «تەماتانە تووشی گۆبەندێکمان بکەن؟»

کەوتە شەوی دوایی باوکەکە وتی: ڕۆڵە کەسی‌تر ماوە لە دۆست و برادەرەکانت؟ وتی: ناوەڵا کەس نەماوە هەموویان چووین. ئینجا باوکەکە وتی: «دە ڕۆڵە، وەرە من لەم عومرە پان و درێژە کە کردوومە تەنها برادەر و نیوێکم هەیە با بچین ئەوانیش تاقی بکەینەوە». کوڕە وتی: باشە.

پاش نوێژی خەوتنان هەڵسان چوونەماڵی نیوە برادەرەکە، تەقەیان دا لە دەرگا. خاوەن‌ماڵ هات وتی: کێیە؟ کابرا وتی: منم دەرگا بکەرەوە. کە دەرگای کردەوە وتی: «ها فلانی یا خوا بەخێر بێن! ئەوە چۆن بووە وا بەم نیوەشەوەدا تەشریفتان هێناوە؟ فەرموونە ژوورەوە». کابرا وتی: «فلانی وەختی هاتنە ژوورەوە نییە، حەمەی خزمەتکارت قەزاوقەدەر ئەم ئێوارەیە پیاوێکی کوشتووە؛ هێناومانەتە حەوشەکەی خۆمان کەس

پێی نەزانیوە بە دەستیەوە داماوین. ئێستاکە هیچ چارم نەدۆزییەوە ئەوە نەبێ کە هاتین بە شوێن تۆدا بێیت لەگەڵمان بچین بۆ سەر قەبران و لە کۆڵی بکەینەوە و لەم بەڵایە ڕزگارمان ببێ تا کەس نەیزانیوە».

کابرا تۆزێ فکری کردەوە و لە پاشا وتی: «فلانی ئێستا تازە درەنگە ئەترسم تووشی هەرایەك ببین. من وای بە چاك ئەزانم بچین تەرمەکە بێنینە ئێرە لەم حەوشەی ئێمەدا چاڵێکی بۆ هەڵئەکەنین ئەیخەینە چاڵەکەوە دایئەپۆشین و ڕزگارمان ئەبێ».

باوکەکە وتی: نابێ هەر ئەبێ بیبەین بۆ سەر قەبران لەوێ بینێژین. لە پاش قسە کردنێکی زۆر پیاوەکە زانی باوکەکە بەو جۆرە ڕازی نابێ، وتی: «بە خوا فلانی ناوێرم لەگەڵتان بێم بۆ سەر قەبران. ئەگەر ئەتەوێ ئەیهێنینە ئێرە لای من ئەیشارینەوە، ئەگەر ناشتەوێ ناتوانم بێم بۆ سەر قەبران؛ ئەزانم ئەکەوینە گیری حوکمەت». باوکەکە وتی: سەر قەبران نەبێ منیش ناتوانم بیهێنمە ئێرە و هەڵسان هاتنە دەرەوە.

ڕووی کردە کوڕەکەی وتی: ڕۆڵە ئەمە نیوە ڕەفێقەکەم بوو. ئینجا با بچین بۆلای ڕەفێقەکەم.

شەو زۆر درەنگ بوو، بەری بەیان بوو، چوونە بەر ماڵی ڕەفیق و لە دەرگایان دا. کابرای ڕەفیق لەگەڵ ماڵ و منالیا لەناو جێگەدا نووستبوون، گوێی لە تەقەی قاپی بوو هەر وا بەبێ ئەوە خۆی کۆکاتەوە هات وتی: کێیە؟ باوکەکە وتی: منم. خێرا قاپی بۆ کردەوە وتی: «ئای فلانی ئەوە خێرە چی قەوماوە وا بەم نیوە شەوە تەشریفتان هێناوە؟ دە فەرموونە ژوورەوە فەرموون». باوکە وتی: وەختی هاتنە ژوورەوە نییە شەو درەنگە، ئیمڕۆ حەمەی خزمەتکارت قەزاوقەدەر پیاوێکی کوشتووە، ئێستا ئەوەتا لە حەوشەکەی خۆمانە، هاتووین بە شوێن تۆدا لەگەڵمان بێیت بچین

بیبەین بۆ سەر قەبران بینێژین تا ڕۆژ نەبۆتەوە و کەس نەیزانیوە.

کابرا وتی: وەرنە ژوورەوە پێتان ئەڵێم. ئەمانیش چوونە ژوورەوە. ئنجا کابرا چوو خۆی پۆشتە کردەوە، بەبێ ئەوەی ئەمان بزانن سێ کوڕی هەبوو لە خەو هەڵیساندن، هەموو تفەنگ و فیشەکیان دا لە خۆیان و هاتەوە لای میوانەکان.

پیاوەکە ڕووی کردە باوکەکە و وتی: «تۆ پیاوێکی خراپی، شتێکی وا ئەوەی ئەهێنا کە تۆ ئاوا بۆی بکەویتە پەلە و ناڕەحەتییەوە؟ ئەبوایە هەر لەماڵەوە منداڵێکت بناردایە خەبەری پێ بدامایە و هیچی‌تر. ئێستەش ئێوە ئەبێ لەم شوێنە نەبزوون، من ئەوا خۆم و هەرسێ کوڕەکەم ئەچین تەرمەکە ئەبەین بۆ سەر قەبران و ئەینێژین. ئەگەر ئاسمان بێتە ڕێمان ئەیهێنینە خوارەوە. تا ئێمە هەر چوارمان نەکوژرێین ناهێڵین خوێن لە لووتی بەرەی ئێوە بێتە خوارەوە» و لێیان دا ڕۆیشتن.

کە ئەوان دەرچوون باوك و کوڕەکەش هەڵسان دوور و نزیك چوون بە شوێنیانا. سەیریان کرد ئەوا ئەوان چوونە ماڵەوە، دوو کەسیان تابووتەکەیان هەڵگرت، یەکێکیان بە تفەنگەوە کەوتە پێش و یەکێکیشیان کەوتە پاشیان، هەر بەو شەوە تەرمیان برد بۆ سەر قەبران و چاڵیان بۆ هەڵکەند. لەو وەختەدا کە ویستیان بیخەنە چاڵەکەوە، باوکەکە چوو ناوچەوانی ڕەفیقەکەی خۆی ماچ کرد و وتی: «بەسە ئیتر بۆم دەرکەوت. ئەم تەرمەش هیچ نییە، مەڕە کوشتوومەتەوە. ئەمە ویستم دەرزێك بەم کوڕەی خۆم بڵێم و هەموو کارەساتەکەی بۆ گێڕایەوە». ئینجا ڕووی کردە کوڕەکەی خۆی و وتی: «ڕۆڵە! ئیتر ئایا بۆت دەرکەوت کە دۆست و برادەر کامەیە و کامە نییە؟!».

کوڕە وتی: «بابە، هەموو شتێکم وەرگرت، ئەگەر پیاو بم ئیتر

ئەزانم کێ دۆستە و کێ پاروو خۆرە». وتی: «ڕۆڵە، دۆست و هاوڕێ ئەوەیە لە وەختی لێقەوماوانا فریات کەوێ؛ ئەگینا لە وەختی شێنەییدا دوژمنیش هەر دۆستە. دۆست ئەوەیە گیانی خۆی لە پێناوتا بدۆڕێنێ، نەوەك هەر لە ڕۆژی خۆشییا بە دەورتا بێ. ئەوە نیوە دۆستەکەی من بوو کە توانی لاشەکە لە ماڵەکەی خۆیا بشارێتەوە. بەڵام کە هاتە سەر خەتەری گیانی نەیتوانی بمانپەڕێنێتەوە. دۆستی تەواویش ئەوەبوو کە چاوت پێکەوت، گیان و ماڵی خۆی و کوڕی دانا لە پێناو منا. جا ئایا دۆستەکانی تۆش ئاوا بوون کە هەموو جار هاوارم لێ ئەکردی و بەگوێت نەئەکردم؟!».

**٨٣.** دەوری پێشوو دەوری بازگەردانی بوو؛ باز بنیشتایە بەسەر هەرکەسێکەوە ئەبوو بە پادشا. دوو پیاوی کورد لەو وڵاتی کوردەوارییە هەر لە تافی مناڵی و هەرزەکارییەوە ڕۆژگاریان پێکەوە ڕابواردوو. پاییز داهاتبوو لە جووت و کێشە و سەپانی بووبوونەوە، ئەچوون بۆ شار شتومەکی زستانە بکڕن بۆ خۆیان و ماڵ و مناڵیان. گەیشتنە سەر کانییەکەی «کانیماران» لەوێ تۆزێ دانیشتن بۆ حەسانەوە و کەوتنە دەمەتەقێ. بیستبوویان کە لە شار بازگەردانە؛ هەروا بە دەم قسەوە، قسەیان هاتە سەر ئەوە کە یەکێکیان بەوی‌کەیانی وت: «ئەرێ ئەگەر ئێستا ئێمە چووینە ئەم شارە و باز هات بەسەر تۆوە نیشتەوە و بوویت بە پادشا چی ئەکەیت؟» وتی: «وەڵا ئەوی چاکە و دادپەرستییە ئەوە ئەکەم. هەر شتێ خوا حەزی لێ نەکا، ئەوە لا ئەبەم و هەر شتێ خوا پێی خۆش بێ، ئەوە ئەکەم لەگەڵ مەردم و توودەی وڵاتا».

ئینجا ئەو لەوی پرسی وتی: ئەی ئەگەر باز نیشت بەسەر تۆوەوە

و تۆ بوویت بە پادشا چی ئەکەی؟ وتی: «وەڵا برا ئەوی ڕاستی بێ، لە خراپە بەولاوە هیچی‌تر ناکەم. ئەوی ستەم و جەورە ئەوە بڵاو ئەکەمەوە، ئەوی خوا حەزی لێ نەکا ئەوە ئەکەم لەگەڵ خەڵکا». وتی: کورە چۆن شتی وا ئەبێ؟ وتی: دڵی من ئەوەی ئەوێ، ئەگەر بووم بە پادشا لەوەی کە وتوومە لێی لانادەم، ئەگەر نەشبووم ئەوا هیچ. بەم جۆرە هەردووکیان پەیمانیان بەست و هەستان لێیان دا ڕۆیشتن.

کە چوون لە قەراخ شار حەشاماتێکی زۆر کۆبۆتەوە و باز بە عاسمانەوە ئەسووڕێتەوە، ئەمانیش چوون لە گۆشەیەکەوە بۆ خۆیان ڕاوەستان. باز هات و چوو و گەڕا، لە ئاخرا خول‌خول هات نیشت بەسەر ئەوەیانەوە کە وتبووی من لە خراپە بەولاوە هیچی‌تر ناکەم. جوان و پوخت بردیان و لەسەر تەخت دایاننا و بوو بە پادشا.

ئیتر ئەمیش بەرەبەرە و وردەوردە دەستی دا بە ئەنجامگەیاندنی ئەو بیر و باوەڕانەی کە هەیبوو لە زۆر و ستەم و لە جەور و خراپەی هەموو خەڵکی وڵات و قەڵەمڕەو بەتەنگ هاتن. ئەویش ڕۆژبەڕۆژ خراپەکانی هەر ڕوو لە زیادی بوو؛ وای لێ‌هات بە هیچ جۆر بەزەیی لەلا نەما و وەکوو گاکوژ کەوتە ناو ئەو عالەمەوە.

ڕۆژێك ئیشێکی فرەناشیرین و ستەمکارانەی داهێنا و دای بە شانی هەموو ئەهلی وڵاتەکەدا، وتی: ئەبێ ئەم ئیشە بکەن. کردنی ئیشەکە لە وزەی ئەهلی وڵاتەکەدا نەبوو، کۆ بوونەوە کەوتنە قسە لێوە کردنی. کەوتنە ئەوە کە بەڵکوو ئیشێکی وا بکەن پادشا ئەم ستەمە ناهەموارەیان لەسەر لابا.

لە هەر ڕێگەیەکەوە بۆی ئەچوون، کەڵکی نەبوو؛ ئاخر قسەیان هاتە سەر ئەوە وتیان: پادشا لە وەختی خۆیا هاوڕێیەکی هەبووە. بچین

بەڵکوو بیدۆزینەوە و بینێرینە لای ئەو تکای لێ بکا و بە تکاکەی ئەو ئەم ستەمەمان لەسەر هەڵبگرێ.

چوون و بە هەرجۆر بوو کابرایان دۆزییەوە و پێیان وت: کابراش وتی باوکم، من ئێستە پیاوێکی سەپانی هەژارم و ئەو پادشایەکی گەورەیە، نە ئەمناسێ و نە ڕێگەشم ئەدەن بچمە لای. بە هەر زۆر و خواهێشتێك بوو کابرایان سازکرد و هەڵسا چوو. کە چووە بەر بارەگا ڕایسپارد بە پادشا بڵێن: فڵانکەسێك هاتووە بۆلای، ئایا دەرفەت هەیە چاوی پێ بکەوی؟ پادشا هەر کە گوێی لە ناوی فڵانکەس بوو، هەستا و تا بەردەرگای حەوشە چوو بە پێشوازییەوە. لەگەڵ ئەوەدا کە ئەو جلێکی شڕودڕیشی لەبەر بوو، باوەشی کردە ملی و ئەملاوئەولای ماچ کرد و بردیە ژوورەوە و لە تەنیشت تەختەکەی خۆی داینا. پادشا زۆر سەرزەنشتی کرد، کە بۆچی ئەم ماوە دوور و درێژە دیار نەبووە؟ بۆچی ئەبێ دۆستایەتی و ڕەفاقەتی کۆنی لە فیکر چووبێتەوە.

کابرای هاوڕێ پێی وت: برام، تۆ ئێستە پادشای وڵاتێکی زلیت، من هەر کابرا سەپانەکەی جارانم. کێ من ئەناسێ و کێ ڕێگەی من ئەدا کە بگەمە لای تۆ؟ تۆ پادشا و من سەپان، ئەمە هەر ڕێك ناکەوێ و ئابڕووی تۆش نابەم.

پادشا لەمە زۆر دڵی تەنگ بوو، وتی: «برام من و تۆ هەر هاوڕێکەی جارانین. وەنەبێ من خۆمم لێ گۆڕابێ، زەمان منی کردووە بە پادشا، بەڵام دۆستایەتییەکەم لەگەڵ تۆدا هەر سەپانەکەی جارانین».

گەلێك لەم قسانە و لەم گلەیی و بناشتەیان کرد و پاشان کابرا ڕووی کردە پادشا و وتی: کەواتە ئێستە من بۆ ئیشێك هاتوومەتە لای تۆ. پاشا وتی: فەرموو. وتی: «تۆ لەو وەختەوە بوویت بە پادشا تا ئێستا

گەلێ ستەم و جەورت لەگەڵ ئەم خەڵکەدا نواندووە و هەمووشیان لێ وەرگرتوویت. ئێستا ئیشێکی‌تری زۆر زلەت داوە بە سەریانا کە لە وزەی کەسیانا نییە و ستەمێکی زۆر ناهەموارە. من هاتوومەتە لات بۆ تکای ئەوە کە ئەم تاقە ستەمەیان لەبەر ئەو دۆستایەتییە کە لە بەینمانا هەیە لەسەر لابەری».

پادشا تۆزێ سەری داخست و لە پاشا سەری بەرز کردەوە وتی: «کاکە برا! کە من و تۆ ئەهاتین بۆ ئەم شارە و لەسەر کانییەکە دانیشتین و هەندێ قسەمان کرد ئەو قسانەت لە فیکر ماوە؟» وتی: «بەڵێ». وتی: چی بوون؟ وتی: «من وتم: ئەگەر ببم بە پادشا لە چاکە بەولاوە هیچی‌تر ناکەم، وە تۆیش وتت: ئەگەر من ببم بە پادشا لە خراپە بەولاوە هیچی‌تر ناکەم». وتی: کەسی‌تر لە بەینمانا بوو؟ وتی: بێجگە لە خوا کەسی‌تر نەبوو. وتی: خۆ خوا زۆر چاك گوێی لە قسەکەمان بوو؟ وتی: بەڵێ. وتی: «ئەوە بوو، بەڕێ کەوتین و هاتین. پاشان من بووم بە پادشا، وە وایش ئەزانم کە خوا کردمی، وە بۆ ئەوەشی کردووم کە ئیشی خراپە و جەور و ستەم بکەم لەگەڵ ئەم خەڵکەدا. چونکە ئەگەر بیویستایە چاکەیان لەگەڵ بکرێ ئەهات تۆی ئەکرد بە پادشایان. دیارە کە منی کردووە وا ئەگەیەنێ ئەمانە خراپن، هەر شایانی خراپەن. ئەگەر چاك بوونایە، شایانی چاکە ئەبوون، ئەو وەختە تۆ ئەبووی بە پادشایان. کەواتە هیچ لەم ڕوەوە ڕووم لێ مەنێ و ناتوانم لەم ستەمە کە خستوومە سەر شانیان دەست هەڵبگرم. هەروەخت کە شایانی ستەم نەبوون و پاك بوونەوە، بێ‌شك بزانە کە خوا من لەسەریان لائەبا و یەکێکی وەك تۆ ئەکا بە پادشایان».

کابرای هاوڕێ کە ئەم قسانەی بیست ئیتر هەڵسا ماڵاوایی لێ کرد،

بە شوێنەکەی خۆیا گەڕایەوە.

**٨٤.** کابرایەك لە خانەدانێکی زۆر گەورە ماڵ و ملْکێکی فراوانی بە میراتی بۆ مابووەوە، بەڵام نەیئەتوانی بەخێوی بکا و بیهێنێتە بەرهەم. ڕۆژێك لە دیواخان دانیشتبوون لەگەڵ کوڕە گەورەکەی ئەم قسانەیان دەکرد: ڕووی کردە کوڕەکەی وتی: «ملْکانەی پێنج شەش دێمان کە لەلای مسکێنەکانە، هەتا ئێستە چەند جارم پێ وتی بچۆ وەری گرە، بۆچی نەچووی؟» کوڕە وتی: «هێشتا نەچووم، دووسێ ڕۆژی دیکە ئەچم وەری ئەگرم، قەیچی ئەکا؟»

باوك: «ئەی دێی "کانیپان"ـمان داوە بە کوێخا بەکر بە ئیجارە، دوو مانگە لە پسوولەکەی تێپەڕیوە، بۆچی نەچووی پارەکەی وەربگری؟ هیچمان نییە خەرجی کەین دە بچۆ وەری بگرە».

کوڕ: جارێ نەمکرپیوە، پەلەت چییە بە شێنەیی ئەیکرم. ئینجا باوکە ـ بابەعەلی تەکیەیی لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو ڕووی تێ کرد ـ وتی: «بەخوا یاشێخ، وەجاخم کوێرە». بابەعەلیش پێی وت: «بەخوا ئاغا! ناشوکری نەبێ باوکی ڕەحمەتیشت هەر وەجاخی کوێر بوو».



# ڕشتەی مرواری

٨٥. یەکێ لە شێخەکانی «کەسنەزان» ئەچێتە ماڵی «خدروەیس» سەرۆکی خێڵی «ئاڵی‌بەگی». کابرای شێخە ئێجگار زۆربڵێ و لەگەڵ ئەوەش فرە ناشیرین و بێ‌فەڕ ئەبێ. لە دوای گەڕانەوەی «خدروەیس» باسی ئەکا و ئەڵێ: «شێخی چی؟ شێخ شڕ ددانێ، گای ماسیاگ چاوێ، گون سەر شەکە نێرێ، مس قوپیاگ دەمێ، جاش گەمە کەر لووتی، تووك بن گون ڕیشێ!».

٨٦. لە دەوروبەری «موسڵ» دوو گوند هەبوون یەکێکیان کوردی تیا دائەنیشت، یەکێکیان عەرەب. عەرەبەکان ماڵاتەکەیان کردبووە ناو کشتوکاڵی کوردەکانەوە. کوردەکان چوونە لای مەلاکەی خۆیان کاغەزێکیان بۆ بنووسێ بۆ عەرەبەکان کە جارێکی‌کە ئیشی وا نەکەنەوە. ئەویش ئەم کاغەزەی بۆ نووسین: «عەرەبەکان! إلى إختيار و مُختار قَرِيَتِكُم، قد دَخَلَ في زَراعَتِنا گا و گۆلَكَكُم، لولا پير و ڕيش سپِيَكُم، لقَطَعنا دەمولووتی گاوانُكُم».

٨٧. یەکێ لە بەرازخۆرەکان ئەمرێت. مەلاکەیان ئەچێتە سەر گۆڕەکەی تەڵقینی ئەدا، ئەڵێ: «حەقلی حەقان حەق لێ نەدا، مەنسوور هەلاج چەك لێ نەدا، گاکۆل داود شاخ لێ نەدا سەگەل سوننی قەپ لێ نەدا».

**٨٨.** ڕۆژێـك لـە دێیەكی بڵباسـەتی مەلاكـەیان نەخـۆش بـوو. ڕیش‌سپییەكیان هەبوو زۆر پیاوێكی بە دین و لە خواترس بـوو، هەمـوو دەمـێ حـازری جومعـە و جەماعەت بوو؛ چووە سـەر بانی مزگەوت لەباتی مەلا دەستی كرد بە بانگ دان: [تا] «أشهد أن لا إله إلّا الله» لەبـەری بـوو، لـەوە بـە دواوە لـە بیری چۆوە. هـات هات، چووە سەر بانەكەی خۆیان لە كلاوڕۆژنەكەوە بانگی ژنەكەی خۆی كرد وتی: «ئەستێلێ، ئەستێلێ!» ژنـە وتی: «هۆ هۆ» وتی: «ئـەرێ كچەكە نێوی ئامۆزاكەی خولای چی بوو؟» وتی: «چلۆن لە بیرت چووەوە؟ حەمەدی كاك ڕێسوان». وتـی: «ئـەرێ وەڵڵا ڕەحمەت لە بابـت! وەبیرم هاتەوە». فڕكەی كردەوە سەر بانی مزگەوتەكە و بانگەكەی بەم جۆرە تەواو كرد و پاشـان وتـی: «بۆ دایـك و بابـی خولای حەمـەدی ڕێسوان، ئیمامی مزگەوتان، هەموو تایفە و خزمان، ڕیش‌سپییانی بن ئاشان، پیاوماقوولی گوندیمان، شوان و گاوانی دەشتیمان، پیرێژنی بەركەندوان، پیرەمێردی دەستە دووان، خازە و بازەی ماڵێمان فاحیتە».

**٨٩.** كابرایێ مەرگەیی لە مەلایەك ئەپرسێ ئەڵێ: «توخوا مامۆستا هەر دەڵێن پردی سیراتێ هەیە ئەوە چۆنە؟» مەلایش ئەڵێ: «مـام هۆمـەر كتێبـان دەفەرموێ: پـردی سیرات لـە مەشـرەقان هـەتا مەغریبان درێژە، لە موو باریكتر و لە شیر تیژترە؛ بە قەدەر سەد كێوی لـە سـەریەك دانـێ هێنـدە بـەرزە، جەحەنەمیش لە ژێریدایە، یەعنی پردەكە بە سەر جەحەنەمێدا ڕاكشێنراوە».

مـام هۆمـەر كـە ئەمـەی بیسـت ئەڵـێ: «مامۆستا ئەبـێ بە سـەریدا بڕۆین؟». مامۆستا فەرمووی: بەڵێ، كتێبان وا دەفەرموێ، دەبێ هەموومان

بە سەریدا بڕۆین. ئەویش وتی: «مامۆستا، پێی ناوێ؛ بە گۆڕە بابم ڕمبە لە بنیەوە هەڵدەستێنم»؛ (واتە ئەکەومە ناوی).

٩٠. کوڕە کوێخایەکی کورد ئەیخوێند؛ مەلاکە فێری حیسابی کردبوو. ئێوارەیەك باوکی لێی ئەپرسێ: ڕۆڵە فێری حیساب بووی بۆ باوکت؟ وتی: بەڵێ. باوك وتی: ئادەی بزانم. وتی: هەستوون دەوار یەکە؛ چاکڵەی گوریس دووە؛ سێ پای مەشکە سێیە؛ دوو چاکڵە بە قنگی یەکەوە، چوارە؛ کوچەڵە پێنجە؛ دەستەی دووی جووتیار شەشە؛ لنگەوژوور حەوتە؛ لنگەوخوار کەوتوو هەشتە؛ سەر مێکوتەی ناو ئاو نۆیە؛ هەستوونێك کوچەڵەی لە پێشەوە دانرابێ، دەیە».

٩١. کابرایەکی هەورامی وتی: «ئیمڕۆ هەنی فرەم واردەن[1]». کابرای هاوڕێی وتی: «جە کۆگە یانەت وێران بۆ؟[2]» وتی: «جە ماڵو سانی؛ سان جە باڵەخانەکە مەواردش، توێکڵەکەش فڕێ مەدا، زۆرابو خزمەتکاری مەکڕانەوە، منیج کڕناو کڕناوم کەردەن[3]»؛ (هەنی: شووتییە).

٩٢. کابرایەکی کورد کچێکی هەبوو. بەیانییەك زوو کچە لە خەو هەڵسا و ڕووی کردە دایکی وتی: دایە ئای ئێمشەو خەوێکی چەند خۆشم دی. دایکی وتی: «یاخوا سفەت «قُل هُوَ اللّٰه» وێ، ناوێ

---

١. [ئەسڵی زمانە هەورامییەکە بەم جۆرەیە: «ئارۆ هەنی فرەم واردەن». (هەڵەگر)].

٢. [ئەسڵی زمانە هەورامییەکە بەم جۆرەیە: «چکۆ؟ یانەت وێران بۆ؟». (هەڵەگر)].

٣. [ئەسڵی زمانە هەورامییەکە بەم جۆرەیە: «جە یانەو سانی؛ سان جە باڵەخانەکەنە وەرێش، تۆکڵەکەش فرە دێ، زۆرابی خزمەتکارش کرنێشۆ، منیج کرپاکەو زۆرابیم کرنانۆ». (هەڵەگر)].

«لا إله إلّا اللَّه» وێ و بۆ حەمەد «رَسولَ اللَّه» وێ! ئادەی ڕۆڵە بیگێڕەوە».
وتی: «دایە لە خەوما شتێك تیاما ئەهات و ئەچوو، ئەوەندە خۆش بوو ئەوەندە خۆش بوو، لە هەنگوین و ڕۆنەکەی ماڵی لالەم فرە خۆشتر بوو».

ژنە بانگی کردە مێردەکەی وتی: بێرەوە کچەکەمان خەوێکی فرە خاسی دیگە ماشەڵڵا! باوکی لە کچەی پرسی: چیت دیوە؟ وتی: بابە لە خەوما شتێك تیاما ئەهات و ئەچوو، ئەوەندە خۆش بوو، لە هەنگوین و ڕۆنەکەی ماڵی لالەم فرە خۆشتر بوو. باوکی وتی: چەتیو ئەوە کێر نەبووبێ؟

وتی: بابە دەنگ مەکە، بۆچی وا ئەزانی کێرم نەدیگە؟ باوکی وتی ئادەی بزانم چۆنە؟ وتی: «بابە، کێر-کێری فەتەی مامە-سوورێکی مل دابڕیاگی بەرچەناکە تاشریاگە. گشت جار لەلای ڕان ئەینیا دەر. ینجا باوە ڤرڤنگ ڤرڤنگ، تیرەتیف تیرەتیف مانگا لە کێفەوە بە قۆڕەقۆڕ ئەهاتەوە. مەشکە لە کەیبانوو شێت ئەبوو، ژڵەژە ئەکەوتە ئی وی یی. ئیتر خۆش بوو، های خۆش بووا!».

**٩٣.** حسێن بەگی حەسەن بەگی جاف، گێڕایەوە وتی: ساڵێك لەسەر بەردەنوێژەکانی «کانی پانکە» نوێژم ئەکرد. هەندێ کوڕکارەی جاف هاتنە ئەوێ، یەکێکیان پرسی: ئەرێ کوڕینە دەنگوباسی حوکمەتەکان چییە؟ کابرایەکی بۆزەڵە هەڵی دایە وتی: «برا من پێت بێژم؛ ئەو حوکمەتە فیلبازە کە لاقێکی لە میسر دانیاگە، قاچێکی لە ئێران، دارێکیشی بە دەستەوەیە لە هیندستان هێزی خۆی خستگەسەری، ئەوا هێندە هەڕەیەکی هاورد دارەکەی بریەوە بە لادا کەوت، ئێرانیش قاچێکی شکاند. ئەوا لە میسریش خەریکە قاچەکەی تری ئەشکێنێ. تەنها لاشەکەی ماگە لای ئێمە، مەگەر سپلۆت بیخوا».

٩٤. دەوری زوو کابرایەکی هەجیجی دێتە بناری شارەزوور ڕەقەیەك لە قەراخی چەمی «دەلێن» ئەدۆزێتەوە؛ گورج هەڵیئەگرێ ئەیخاتە ناو هەمانەکەوە کە لە کۆڵیایە، ئەیباتەوە بە دیاری بۆ فەریدوون بەگ. ئەویش نازانێ ئەمە چییە، پێنج شەش پیاوی ڕیش سپی گرد ئەکاتەوە ئەڵێ: «مەلێك پەریم ئاوردەن، ئادەی بزاندێ چێشەن؟». کە تەماشا ئەکەن، یەکێکیان ئەڵێ: «ئەمە سەقاقوشە، گوللەیان لێ داوە باڵی هەڵپڕووکاوە». یەکێکی تریان ئەڵێ: «نا، وا نییە، ئەمە ماسی دێمە». یەکێکی تر ئەڵێ: «نەخێر؛ ئینە بازەن من خاسش مەشناسوو». یەکێکی تر ئەڵێ: «نەخێر؛ ئینە نە قازەن و نە بازەن، ئینە بولبولی خۆش ئاوازەن، لە سەرچڵان مەنیشۆ، پکڵی پکڵی مەواچۆ».

کابرایەکی شارەزوری بۆ «توو» کڕین چووبوو بۆ ئەوێ، پێیان ئەڵێ: بابە ئەمە ڕەقەیە و لە شارەزور زۆرە؛ فڕێی دەن.

٩٥. ئەوڕەحمان پاشای بابان کتێبێکی شانامەی دڕاوی پەڕپووتی ئەبێ، مەلایەکی سەحاف بانگ ئەکا ئەڵێ: ئەم کتێبەم زۆر چاك بۆ چاك بکەرەوە. مەلا کتێبەکە ئەبا و لە دوای چەند ڕۆژێك ئەیهێنێتەوە. پاشا کە تەماشای کتێب ئەکا ئەو پەڕانەی کە لە جێی خۆیا نەمابوو، هەمووی خستۆتەوە جێی خۆی و ئەو جێیانەی کە دڕابوون مەلا لەسەر کاغەزێکی جوان نووسیویەتۆ و پینەی کردووە و بە جزوبەن کراوی و بەرگێکی باشەوە هێناویەتەوە.

پاشا زۆری پێ خۆش ئەبێ و ئەفەرمووێ: مەلا، چیت ئەوێ داوا بکە. مەلا ئەڵێ: قوربان ڕەزێکی ترێم هەیە لە دێی «قوولەڕەش»، بفەرموو ڕەزانەم لێ نەسێنن. ئیتر دوعاگۆت ئەبم. پاشا ئەمر ئەکا

فەرمانی قوولەڕەشی بدەنێ بە خاك و بەراوەوە با بۆ مەلا بێ.

مەلا فەرمانەکە وەرئەگرێ و ئەڕوا. لە دوای ساڵێك دێتەوە خزمەت پاشا ئەڵێ: «قوربان خوا ڕاوەستاوت کا! هاتووم دێی قوولەڕەشتان پێ بدەمەوە، هەر ئەوەندەم مەرحەمەت لەگەڵ بکە ڕەزەکەم ڕەزانەی نەبێ. پاشا ئەپرسێ بۆچی؟ مەلا ئەڵێ: «قوربان ساڵانی پێشوو کە خاوەن دێ نەبووین، هەموو وەختێ نانی جۆمان ئەخوارد بە وشکی، یان بە دۆوە و لەناو حەفتەیەکدا جارێك شۆربامان لێ ئەنا، وەیا نان و دۆشاومان ئەخوارد. ئێستا ژن و منداڵ هەموو ڕۆژ پڵاو و گۆشتیان لێم ئەوێ و داوای جلی جوانم لێ ئەکەن. ئەویش تەماشا ئەکەم دەری ناهێنێ، لەبەر ئەوە ئەمەوێ بچینەوە دۆخەکەی جاران».

پاشا ئەفەرمووێ: مادام ماڵ و منداڵت فێری خواردنی خۆش و جلی چاك بووبن، تازە ناتوانن لەسەری لا بچن. «ئەولاغا»ی وەزیری بانگ ئەکا ئەڵێ: «سێ دێ، کە بێخاوەن بێ بدۆزەرەوە بیخەرە سەر قوولەڕەشی مەلا». ئەولاغا سەیری دەفتەر ئەکا «تەڕەمار» و «زوڕناسەر» و «تەقتەق» بێ خاوەنن، ئەچێ فەرمان ئەنووسێ ئەڵێ: «نامانە سەر قوولەڕەشی مەلا، تەڕەمار و زوڕناسەر و تەقتەق».

**٩٦.** کابرایەکی کورد دنیا زستان بوو، ڕێی کەوتە دێیەك. تەماشای کرد ماڵێك دووکەڵی لێ هەڵئەستێ، وتی: بچمە ئەم ماڵە لە هەمووی باشترە. کە چوو سەیری کرد ئەم ماڵە، ماڵە جۆلایە؛ ماڵە جۆلاش نەختێ پاکوپوخت و بە سەروبەرن. پیاوەکە خەریکی جۆلاییە و ژنەکەش تەنووری داخستووە نان ئەکا.

چوو دانیشت. کابرای جۆلا سەیری کرد ژنەکەی شەرمی بە دەرەوەیە.

لە پێ چاڵەکەدا «مەکۆك»ەکەی ئەهێنا و ئەبرد، ویستی ژنەکەی تێبگەیەنێ کە خۆی داپۆشێ، ئەیوت: «هەپۆش مەپۆش، وی کون داپۆش». ژنە تێنەگەیشت. کابرا پشکڵە سووتاوێکی بۆ فڕێ دا. پشقڵ بۆ نەچوو نەکەوتە کونی شەرمی ژنەوە. ژنە داچەڵەکی و شەرع شەرمی بۆ نییە تڕێکی کەند. ئینجا کابرای مێردی ئەیوت: «هەتەر مەتەر، ئەم لەو بەتەر».

**٩٧.** کوڕە کەچەڵێك پیاوی پیاوێك ئەبێ. شەوێك ئاغا لە ماڵ نابێ، خێزانی ماڵ، ئەبێ بە ئاغەژن و کچی ئاغە و کارەکەرێك. شەوێ کوڕەکەچەڵ ئاگری بەر هەڵیئەگرێ و ناوێرێ دەنگیش بکا. فیکر ئەکاتەوە ئەڵێ: «بەدەم خەوەوە ئەڵێم: ئاغەژن بێم؟ ئەگەر تووڕە بوو ئەڵێم نووستووم ئاگام لێ نەبووە؛ ئەگەر خۆ وتیشی وەرە، ئەوە هیچ».

خەوی لە خۆی خست و بەدەم خەوەکەوە بە بزرکاوی وتی: «ئاغەژن بێم؟» هیچ دەنگ نەبوو؛ جارێکیتر وتیەوە، دیسان دەنگ نەبوو؛ جاری سێهەم کە وتیەوە ئاغەژن وتی: «دەك عەمرت نەمێنی! دەنگت هەیە و ڕەنگت نییە». کوڕەکەچەڵ گوێی نەدایە، وتی: نەوەك تاقیم کاتەوە، پاشان لێم تووڕە بێ.

ئاغەژن کە زانی کوڕەکەچەڵ هەر دیار نییە ئینجا وتی: «کوڕەکەچەڵی خاوەن تەلای دەستەوشارا! کە شووشی سووری یاقووتت لە کانی کانیی جوانیدا شاردۆتەوە، ئایا هیچ ئاگات لێیە کە گەنجێکی بێ ڕەنجی دوڕ و مرواری و یاقووت لە هومەی تەلایی خوسرەوانیدا چاوەچاویەتی بۆ ئەو شووشە، کە بێجگە لە گوڵاوی ژیانی گیانان هیچیتری تێدا نییە. بێگومان ئەوانەی بەهرەداری سەرچاوەی ئەقڵ و فامن، شووشی

سووری یاقووت لە خەزنەی مرواریدا نەبێ لە هیچی‌ترا هەڵناگرن».

کچەکە گوێی لەم قسەیە بوو وتی: «ڕاستە خەزنەی دوڕ و مرواریدە، بەڵام ئەوانەی سەڕافی گەوهەرشناسن، ئایا هیچ ئاگایان لەوە هەیە کە ئاقڵانی مەیدانی جەواهێرفرۆشی دوڕی سادەی بێ‌گەردی مینایی، گوڵی سووری نەژاکاوی باخی تەنیایی، ناگۆڕنەوە بە دوڕێك کە دەستی وەستای زەڕنگەر بە قولاپی قولاپدۆزی شەو، کاری تیا کردبێ؟ دوڕێکی یەمانی، بە نگینێکی سولەیمانی ئەگەر بە سمی ئاهووانی خوتەن و بە میسکی غەزالانی خەتایی مۆر کرابێ، ئایا شای نەوجوانان و ئاقڵی ڕۆژگاران ئەیدا بە دوڕێ کە کون کرابی؟!».

کارەکەر کە گوێی لەمانە بوو هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی: «ئێمەش خوایەکمان هەیە».

٩٨. لە قسەی هەورامی ئەمەیە کە ئەڵێ: «واتیم پەنە، واچیش پەنە، واتت پەنە، واتیش پەنە، واچەم پەنە، واتش چێش؟»

٩٩. سەیدی چۆڕ چوار لاپەڕە مەعنای لەم سێ نیوە شیعرە کوردییە داوەتەوە. شیعرەکە ئەمەیە:

**لەم بەر ئاوەکە لەو بەر ئاوەکە زەنگیانە لە مل زوڵف خاوەکە**

**کەوشەکەی نەکەند دای لە ئاوەکە**

١٠٠. کوێخاژنی لەیلاخی زۆر بە سەروبەر و کەیبانووی لێ‌هاتوون؛ تفاقی ماڵ و ماڵاتیان هەتا بڵێیت تەواوە، لە کاتی شایی وە یا شیوەنا پێش ژنانی ئاوایی ئەکەون و ئەچن بۆ ئەو شایی و شیوەنە. کە دوو ژنە کوێخا لە شوێنێك یەکیان گرت بەم جۆرە خۆشی و دشی لە یەك ئەکەن: «ماڵ، مناڵ، سەگ دەرماڵ، کۆرپەی باوەش، بەخەڵ خەف

شەو، گشتیان خاسن شوکر».

١٠١. دوو ژن پێکەوە هەویریان ئەشێلا، هەروا بە دەم قسەوە یەکێکیان لەوی کەیانی پرسی: چەن شووت کردووە؟ وتی:

**ئیسـك و میسـك و مسـتەفا حافـە و جەمشـید و بولوەفـا**
**هەباس و هەیاس و میرتەوراس گۆرانـە هیـزەی مێشـك کاس**
**نـۆ لەم هـۆزی، نۆ لـەو هۆزی یەك لەبەر هەتاو خۆی ئەدۆزی**
**چنگـم لـە هەویـرە هەر هێنـدەم لـە بیرە**

١٠٢. ئەمیرتەیمووری گورکانی لە پەلامارەکەیا بۆسەر بەغدا و ئەو ناوە، لە کوردەواریدا ڕۆژێك لە ڕاو ئەبێ، تووشی شوانێکی کورد ئەبێ، لێی پرسی: ئەرێ کابرا! ئەو «سەرکارە» کە ئەمیرتەیمور ناردوویەتە سەرتان چۆنە لەگەڵتان؟ کابراش ئەڵێ: «فڵانی، قسەی لێوە مەکە چ سەگ و سەگبابێکە». ئەڵێ: ئەی ئەمیرتەیموور خۆی چۆنە؟ ئەڵێ: «ئەو گەلێ سەگ و سەگبابترە؛ ئەگەر ئەو چاك بوایە ئەمیش چاك ئەبوو».

ئینجا ئەمیرتەیموور ئەڵێ: کابرا تۆ من ئەناسی؟ ئەڵێ: ناوەڵڵا. ئەڵێ: من ئەمیرتەیموورم. کابرای شوانە ناوکی ئەکەوێ، ئەڵێ: «ئەی بم وە سیقەت تۆ من ئەناسی؟» ئەڵێ: نەء. ئەڵێ: «من کەرەشێتی کوڕی کەرەشێتم، شێتیی من لە هەموو کوردەواریدا گەلێ بەناوبانگترە لە ئاقڵی تۆ لە هەموو وڵاتی خۆتا، سەرەڕای شێتییەکەشم هەموو ڕۆژێ جارێك دەست ئەکەم بە چەنە لێدان و وڕێنە کردن، سەری خۆم ئەبەم بە ڕیشی بابما». ئەمیرتەیموور دەست ئەکا بە پێکەنین و ئەڵێ: خەڵاتی کەن.

١٠٣. «حەمەئاغای بڵباس» بڕیاری دابوو لە ئاواییەکەیا هەرکەس نوێـژ نـەکا جەریمـەی بخاتـە سـەر. کابرایەکـی بڵبـاس ناچـار هەڵسا و لـە ترسانا دەستی کـرد بە نوێژ کـردن و بەم جۆرە نیەتی هێنا: «نوێـژی دەکـەم، نوێـژی دەکـەم، نوێـژی دوور و درێـژی دەکـەم، لۆ حەمەئاغای بڵباسیکەم، کوڕی مرێ، کچی مرێ ، هەڵڵاهو ئەکبەر».

١٠٤. شەوی پانزەی مانگی شەعبان بە دەستووری کوردەواری پێی ئەڵێن «شەوی بەرات» و ئەو شەوە نیمچە جەژنێکە. منالان هەر لە پاش نوێژی شێوانەوە کۆ ئەبنەوە و بە مالانا ئەسووڕێنەوە. ئەم شیعرانەیان بۆ خۆیان هەڵبەستووە؛ ئەچنە بەر هەر قاپییەك بە دەنگی بەرز و بە نەزم، تێکڕا ئەیخوێننەوە، ماڵەکەش هەر شتێکیان ببێ بۆیان دێنن، شیعرەکان ئەمانەن:

شـــەوی شـــەوی بەراتـــێ خوا دوو کوڕ و کچێکتان باتێ
ســـفرە بێننـــە جەماتـــێ خاتوونـــێ دەســـت بە زێڕێ
دەست لە کەندووان بگێڕێ بەشـــی منـــالان بنێـــرێ

١٠٥. کابرایەك هەبوو لە سولەیمانی بەناو بازاڕا چەوەنەری کوڵاوی ئەفرۆشت؛ بـە دەنگێکـی خـۆش و بـە نەزم بەم جـۆرە بانگی ئەکرد و ئەیوت:

«هەتیوی بێ باوکە چەوەنەر، خورمای بێ ناوکە چەوەنەر، کۆرپەی بێ دایکە چەوەنەر، سوورەی بەر مەمکە چەوەنەر، قیتەی ناو گەڕەکە چەوەنەر، هەی چەوەنەر، چەوەنەر، چەوەنەر...».

١٠٦. دوو پیاوی گەورە بە ڕاو و شـکار بە دەشـتێکا ئەڕۆن، تەماشـا ئەکـەن وا لـە دوورەوە کابرایەکـی ڕیش‌سـپی لیکنـی شـڕەبار،

پەڕۆیەکی چڵکنی کردووە بە سێبەری چاوی؛ سواری نێرەکەرێك بووە و ماکەرێکی ڕووتیشی خستۆتە پێش خۆی و وردە وردە گۆرانی بۆ ئەڵێ و ڕوەو ناو شار ئەڕوا... یەکێ لە پیاوەکان بەوی‌کەیان ئەڵێ: بیدوێنە، ئەڵێ: وا دیارە ئەم کابرایە دەم شڕە، جنێومان ئەداتێ، ئەڵێ: گوێی مەدەرێ بیدوێنە با جنێومان بداتێ.

ئینجا ئەچێ و سەر ڕێی پێ ئەگرێ، دەستی لە ملی کەرەکەی ئەکا و ماچێکی ئەکاتەوە، ماندوو نەبوونییەك لەگەڵ کابرا خۆی ئەکا، کابرا بە تووڕەییەوە ئەڵێ: «تۆ دەست ئەکەیتە ملی براکەت لەگەڵ ئەو بدوێ، کارت چییە بە منەوە؟ ئەگەر دایکت ناردووتی، من هیچ لە بیرم نەماوە کەی دایکتم دیوە. خۆ ئەگەر لەوانەشی بۆ کڕیار ئەگەڕێی و لەناو شار مشتەریت نەکەوتووە، دەشتەکی ئەو پیشە حیزە نازانن».

کابرا ئەڵێ: بەخوا خاڵە نە دایکم ناردوومی، وە نە بە شوێن مشتەریشا ئەسووڕێمەوە، چاوم پێت کەوت، وامزانی چاوت ییێشی، منیش تۆزێ دەستی حەکیمیم هەیە بەزەییم پێتا هاتەوە، دەرمانێك بوو وتم با پێت بڵێم، بەڵکوو چاوییێشەکەت لە کۆڵ کەوێ.

کابرا وتی: وەرێ وەڵڵا، بەقوربانت بم! چاوم ئێشی، پێم بڵێ بەڵکوو لە دەم و نەفەسی تۆوە چاك ببمەوە، ئینجا هەڵی دایە و وتی: «ڕۆنی هەتاو، دەنگی دەهۆڵ، ڕەنگی ئاو، تیشکی ئەستێرە، خشتەی گاگێرە، سێبەری مەنارە، وەفای خەڵکی ئەم شارە، چاوی مار و پێ‌مێروولە، دەوڵەمەندی پیاو ڕووتەڵە، ئاشتی میراتگر، یەکیەتی جێگەگر، ئەمانە شەش مانگ لەبەر سایەقەی هەتاو دانێ، شەش مانگ لە دەسکاوانێکی بێ‌بنا بیکوتە، شەش مانگیش بیخەرە بەر ڕەشەبا، ئینجا بیکەرە کلتووری بن کلکی ئەو دێڵە کەرە، بە کلچوێکی یەرەقی ئەو نێرەکەرە بیهێنە بە

چاوی سەر و خوارتا ئیشەڵڵا زوو چاك ئەبیتەوە».

مامەی ڕیش‌سپی تۆزێ خۆی بۆ جووڵاند، یەکێکی کەڕەنای بۆ کێشا وتی: «جارێ ئەمە پێشەکی بۆ هەقی هاتنەکەت. بەبێ مزەڕەتی سەری خۆت و بۆزەی هاوڕێت، کە چاکیش بوومەوە کۆنە کارەکەرێکی ڕەشتاڵەی دایانی نەنکم ماوە، ئەتدەمێ بۆ خۆت و ئەو هاوڕێیەت -کە بۆ پێکەنینی خۆی تۆی کردووە بە پێستی لاقنگی گا- بەیانی لە ئاشخانەکەی دوایەوە شلە حەی حەی بکەن بۆ نان‌خواردنی ئێوارەتان ئەگەنە میوانخانەکەی پێشەوەی».

**١٠٧.** حەسەن‌بەگی قادربەگی جاف لەگەڵ دەستەیەك لە شۆڕەسواری جافا بەو دەشتی شارەزوورەدا تێ‌ئەپەڕن. مەرەزەی شارەزوور دەستی بە خۆیا هێناوە، گۆلەکان ئاویان تێ بەردراوە، هەموویان پشتە پشتە وەستاونەتەوە. ڕائەوەستێ و سەیرێکی بەسۆزی ئەم دیمەنە ئەکا، کوتوپڕ بانگی سوارەکان ئەکا و ئەڵێ: «بێنو، بێنو، ئێستە زانیگمە خوا لە قورئانا ئەفەرموێ: «**مَرَزَ الْبَحْرَيْنِ، بَيْنَهُما بَرْزَخٌ لا يَبْغِيان!**» مەعنای چییە. ئەوە دەربارەی ئەم گۆلگەلە فەرمووگیەسی. ئەوەسە چۆن پشتە پشتە وەستاگنەسەوە، ئاوی ئەم گۆل تێکەڵاوی ئەو گۆل ناوێ، هەر وە دوو گۆل پشتە دوێك کەوتگەسە بەینیان. وە قەورەکەی حەمە پاشا ئەگەر وا نەهاتینایە من ئەمەم نەئەزانی».

**١٠٨.** «حەبیبەڵڵاخانی باوەجانی» ئەنێرێ بۆ عەشرەتێك مەشکە دۆ بەرنە سەرکانییەکەی «ناراو» کە ئەم شوێنە هاوینەهەواری «قوایی» و «باوەجانی»یە. کابرایەکی باوەجانی سواری کەرێك ئەکەن و مەشکە دۆی لە پێش دائەنێن، لە ڕێگە مەشکە «پشکی» بەر ئەبێ.

کابرا کێری خۆی ئەخاتە کونەکەیەوە و ئەڕوا تا ئەگاتە سەر هەوار. ئەڵێن: دابەزە، ئەڵێ: دانابەزم تا ئەچمە بەردەمی خان. ئەڵێن: کورە دابەزە، تۆ بۆ ئەوەندە شێتی؟ ئەڵێ: «کەرانگاکەی گاگینە، چشۆ کەن بۆ کەرە کەوەی دایکی کەران، کێرم پشکی مەشکەیە ناتوانم داوەزم».

١٠٩. قازی بایەزید ئەسپێکی هەبوو، هەموو جار سواری ئەبوو ئەچوو بۆ سەرا و پێی ئەهاتەوە. ڕۆژێك قورئانی ئەخوێند تووشی ئەو ئایەتە بوو کە ئەڵێ: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا﴾. هێنای ئەسپەکەی بەرەڵڵا کردە ناو شار بۆ گیانی ئەو عالەمە. ئەسپە کەوتە کۆلانان و سەر دوکانان، سا خوا چی دابێ لە توێکڵە باینجان و لە ترۆزییە کرمێ و لە توێکڵە شووتی ڕزیو، ئەیخوارد و پێوە ئەژیا.

ڕۆژێك ئەسپەکە... تۆ سەلامەت. قازی وتی: بە پیاوەکەی بچێت چەن کۆڵهەلگر و خۆڵڕێژێك بێنێ بیبەنە قەراخ شار فڕێی دەن. ئەوانیش کە هاتن داوای دە قڕانیان لە قازی کرد بۆ فڕێدانەکەی. قازی وتی: داوای پارە لە پیاوی وەکوو من چۆن ئەکەن؟ یەکێکیان هەستا و وتی: قوربان! ئێمە هیچ دەرامەتێکی‌ترمان نییە بێجگە لەم جۆرە شتانە نەبێ، جەنابی قازی ـ خوا ڕاوەستاوی کا!ـ دەرامەتێکی زۆری هەیە و پیاوێکی دەوڵەمەندە. لەم شتانە هەموو وەرئەگرێت: «مارەبڕانە و سەرقەڵەمانە، کەفارەی سوێن و نۆردووی جومعانە، هەقی قەواڵە و کرێ حەواڵە، پارەی تەڵاق و مۆری کاغەزان، بەرمەشکە کەرە و نۆبەرەی ڕەزان، پاشماوەی وەقف و میرات بەشکردن، مووچەی دەرز وتن و پێشنوێژی کردن».

قازی وتی: بە پیاوێکی وەکوو من چۆن شتی وا ئەڵێن؟ ئێوە هەموو خێروبێری وڵاتەکە کۆ ئەکەنەوە و هەزار قاپیتان هەیە بۆ نان پەیدا کردن؛ جلی مردووان و پارەی زیارەتان، چڵکاوی ماڵان و گسکی کۆڵانان، تەنەکە

شکاو و تەنەکە پچڕاو، دزی چڵەدار و گرتکی نەکوڵاو، پارەی خێرات و مردوو هەڵگرتن، کەر فڕێدان و سەگ بە کێش کردن، جەژنانەی دووکان، کراسە کۆنی جوان، نوردووی لادێ و پاشماوەی میوان. ئەمانە هەموو وەرئەگرن، بێجگە لە گوێلە نۆکی خاپیرۆز و مستەساوەری بن کووپەی دایە ئەفرۆز، لەگەڵ ئەوەدا ئەم ئەسپە کە بردتان فڕێتان دا پێستەکەی بەرن بۆ دەباخ و کلکەکەی بۆ قەرەج و یاڵەکەی بۆ موتاب و ناڵەکەی بۆ خاوەن کۆشك، بۆ چاوەزار بیکا بەسەر کۆشکەکەیەوە، ئەمانە هەموو دەستتان ماچ ئەکەن، ئیتر چۆن هیچتان نییە و داوای شت لە پیاوێکی وەکوو من ئەکەن؟!.

ئینجا کابرا هەستایەوە وتی: «قوربان! جەنابی قازی، بەمانە فەرمووت ئێمەت کرد ڕازی. بیکە بە خێری گۆڕی جوانەمەرگەکە شتێکمان بدەرێ با دوعا بۆ سەری جەنابت و پادشای وڵات بکەین کە ئەم هەموو خێروبێرەتان پێ داوین».

.١١٠ شێخ عەزیزی جانەوەرە ئەچێ بۆ دیدەنی مەولەوی. لە ڕێگەدا تووشی کابرایەکی بەرازخۆری قەڵخانی ئەبێ کە دوو ژنی لەگەڵ ئەبێ؛ لێیان ئەپرسێ: بۆ کوێ ئەچن؟ کابرا ئەڵێ: قوربان ئەمانە هەردووکیان ژنی منن، یەکێکیان دوانزە ساڵ و یەکێکیان پێنج ساڵە ژنی منن، هیچ منداڵمان نییە، ئەچین بۆ سەر مەرقەدی «مەلا مستەفای بێسارانی» بەڵکوو خوا منداڵێکمان باتێ. شێخ عەزیزیش لە پارچە کاغەزێك ئەم دوو شیعرەیان بۆ ئەنووسێ:

بێساران ماوا، شێخی بەحر و بەڕ    ئاما وەیانەت یەکانە و دوو دەڕ

جە دەوری یانەت مەکەران هۆڵە    پێشان کەرەم کەر جفتی پار کۆڵە

ئەیدا بە کابرا، پێی ئەڵێ ئەمە بخەرە ناو گومەزەکەی شێخەوە.

بە ڕێکەوت؛ساڵی دوایی شێخ عەزیز ڕێی ئەکەوێتە ماڵی ئەو کابرایە. ژنەکان ئەیناسنەوە، هەریەکە کوڕێك دێنن و ئەیخەنە باوەشیەوە، ئەڵێن پار کە چووینە سەر مەرقەدی شێخ و کاغەزەکەی تۆمان فڕێ دایە ناو گومەزەکەوە، هاتینەوە خوا هەریەکە ئەم کوڕەی پێ داین.

١١١. «حەسەن کەنۆش» شاعیرێکی کوردی نەخوێندەوار بوو، بەم شیعرانەی باسی یارەکەی کردووە:

**جە بەیانەوە، جە بەیانەوە خاڵێ دیم وە بەین دوو بەیانەوە**
**چون نەجم مەدرەوشۆوەبەیانەوە حەکاکانی دەور گشت بەیانەوە**
**کێ دیەن مەغریب وە بەیانەوە؟ تاحەسەن وەخاك سەرمەنیانەوە**
**هەر ها وە حەسرەت ئەو بەیانەوە**

١١٢. پیرەمێرد گێڕایەوە وتی: حاجی ئەولا گۆجەی دراوسێمان بەبێ زیاد و کەم بیست وحەو ژنی هێنا بوو. لەم دواییەدا ژنێکی تەڕپیری عەیاری بووبوو، ژنەکە مێردی زۆرتر دیبوو. شەوێك ژنە دائەنێ ئەڵێ: توخوا وەرە با بە ڕاست حسابی قسمەتی خۆمان بکەین. توورەکەیەك گوێز دائەنێ لە پێشا خۆی ئەڵێ: هەوەڵ ژنم «وێڵەدەر»ی بوو، جوێ بووینەوە. وتی لە «وێڵەدەر» شایی و هەڵپەڕکێ بوو، لە تەنیشت بێوەژنێکی نازکۆڵەوە بووم. دەستێکی نەرموشل و لاڕانێکی خڕوخۆڵی بوو، هەموو جار دەستمی لێ هەڵئەخلیسکا. پاش هەڵپەڕکێ ڕاستەوڕاست خوازبێنیم لێ کرد و ڕێك کەوتین. هەر ئەو دەمە بردمە لای مەلا، حەمەی مام عەزیز و ئەمینی گوڵەندامم برد بۆ شاهیدی، مارەم کرد و لەگەڵ خۆم هێنامەوە. گوێزێك لە هەمانەکە دێنێتە دەرێ و دائەنێ، ئەڵێ: من ئەمە یەك.

ئافرەتیش ئەڵێ: من ئەسڵم «چەمەك»ـەییە. کچ بووم، چووین بۆ مازوو چنین؛ کوڕێکی دراوسێمان بوو «عەولی» ناو بوو حەزی لێ کردبووم. ڕۆژێ لە کەژ هاتینەوە گەیشتینە کوێرە شیوێك، پەنابوو. من وتم: ماندووم لێرە تۆزێ ئەحەسێمەوە، تۆ بڕۆ. تێ‌فکری هاتە لام دانیشت، وتی: چۆنت بەجێ دێڵم؛ سا شەیتان هەردووکمانی تەفرە دا... قەوما؛ ئیتر هەر لەوێوە نەچووینە ئاوایی پێکەوە چووین خۆمان کوتایە ماڵی «شێخ عەلی مزگەوتە» لەوێ لێکیان مارە کردین، من کارەکەر و ئەویش خزمەتکار. ئەویش گوێزێکی لە هەمانەکە دەرهێنا و لە بەردەم خۆیا داینا، وتی: منیش ئەمە یەك.

لەو یەك و لە من یەك، من بیستوحەو ژنەی خۆمم تەواو کرد، ئەو گەیاندیە سی‌ویەك، ناچار حاجی ئەڵێ: ئافرەت تۆ لێرە دانیشە من چوار گوێز قەرزاری تۆم، وا من ئەچم ئەگەڕێم تا چوار ژنی‌تر دێنم، ئینجا تای تەرازوو ژمارەی گوێزمان وەك یەك ئەوەستێ.

**١١٣.** کابرایەك ئەچێتە لای قازییەك کە لە دیواخانی حوکما دانیشتبوو؛ وا دیارە ئەم کابرایە زۆر بە شوێنیا گەڕا بوو. کە چوو لەوێ چاوی پێ‌کەوت وتی: قازی ئەفەنی ئەوە تۆ لە کوێیت؟ وتی: لە بەینی تۆ و دیوارەکەم. وتی: گوێم لێ بگرە. وتی: بۆ گوێ‌گرتن دانیشتووم. وتی: ژنێکم مارە کردووە. وتی: بە خۆشی و بە کامەرانی! وتی: ماڵی باوانی مەرجیان لەگەڵ کردووم کە نابێ کچەکەیان لا دەرکەم. وتی: باشە مەرجەکە بەجێ بێنە. وتی: ئێستە ئەمەوێ لایان دەرچم. وتی: ئەی مەرجەکەت چی لێ ئەکەی؟ وتی: مەرج و شتە نازانم هەر ئەڕۆم. وتی: خوات لەگەڵ. وتی: ئاخر کێشەکەمان ببڕێنەوە. وتی: بڕیمەوە. وتی:

حوکمت بەسەر کێدا دا؟ وتی: بە سەر کوڕی دایکتا. وتی: بە شاهێدی کێ؟ وتی: بە شایەتی کوڕی خوشکی خاڵت!».

١١٤. کابرایەك چووە لای مەلایەك پێی وت: قوربان ژنەکەم لەگەڵم خراپە، پیاوی چاك بە بەڵکوو تۆزێ ئامۆژگاری بکەی و کردەوەی لەگەڵم چاك ببێ. مەلا هەستا چووە ماڵیان و ژنەی بانگ کرد و پێی وت: «خوشکم! شەرع ئەفەرموێ: ژن ئەبێ لە ژێر فەرمانی مێردی خۆیا بێ؛ تۆ نابێ چاوت لەوە بێ کە ئەم مێردەت چاوی کزە و کەچەڵە، دەستی کورتە و بەڵەکە، قاچی ئەلەرزێ و بۆنی دەمی دێ، زمانی ناخۆشە و پاشی بە جۆشە، دەستنوێژ ڕاناگرێ و دایم سەرخۆشە، لە قسە کردنا کەف ئەچەرێنێ، لە وەختی نووستنا دەم ئەتەقێنێ».

کابرا کە ئەمانەی بیست وتی: «هەڵستە، هەڵستە بڕۆ خوا بتگرێ بۆ خۆت و ئامۆژگاریت! ئەو شتانەی کە تۆ بەم ژنەی منت وت، ئەو گەلێکیانی نەئەزانی».

١١٥. شێخێك لە «نۆڕەباب» هەڵکەوتبوو، هەناسەی گیرا و دوعای لە کارا بوو، شێت و هاری چاك ئەکردەوە، دزراوی ئەدۆزییەوە، بەستراوی ئەخستە کار، تۆبەی دز و درۆزنی دائەدا، گەلێ بۆ گەل بە خزمەت بوو. ڕۆژێك کوێخا مستەفای «بێورە» چووە خزمەتی وتی: «یاشێخ! تۆ ئەم فەیز و بەرەکەتەت هەیە، کە مردی لە کیسی هەموومان ئەچێ، ئەولادێکت نییە جێت بگرێتەوە با ژنێکت بۆ بێنین؛ خۆیشت لەزەتی ژن و مێردی ئەبینی و ئەولادەکەیشت کەڵکی خزمەتی قەومەکەی پێوە ئەبێ، بەم جۆرە شێخی خستە سەر سەودا.

شێخ هەڵسا چووە خزمەت «مەلا مەحمووی بارێ»، وتی: «قوربان!

ڕوویان لێ ناوم ژن بێنم». فەرمووی: باشە پێغەمبەر فەرموویەتی: «النِّكاحُ سُنَّتي».

**شەوقی نامێنی چرای خانەدان مەگەر بە سایەی ژنی خانومان**

پرسی: قوربان ژنی چۆنی بێنم؟ فەرمووی: ژنێك بێنە خۆشەویستی بزانێ، نەوەی باش بخاتەوە و مەیلی چاکەی لە ڕەگەزدا بێ. خۆت لە سێ جۆرە ژن بپارێزە:

لە بێوەژنێ کە مێردی مردبێ؛ هەر ساتە نەساتێ ئەڵێ: ڕەحمەتییەکە ئەیشێلام، بۆنی ئەکردم، پێی ماچ ئەکردم.

لە ژنێ کە دەوڵەمەند بێ و بەهۆی پارەکەیەوە شانازی بکا و منەت بەسەر پیاوانا بنێ.

لە ژنێ کە مەکرکەر و بە ئاین و ئۆین بێ، هەمیشە خۆی بخا و بە نکەنك بۆڵە بکا».

قەیرە کچ باشە، قەدر زانە. پیرێژن ژارە، هەناسەی مارە. ژن لە عومری دە وە تا بیست حەزی نەفسە. لە بیست تا سی بۆ دڵداری و یاری و دیاری. لە سی تا چل دایك منداڵ، لە چل تا پەنجا سەرەوکاری ماڵ. لە پەنجا بە دواوە خوایشی لێ ڕەنجا!.

بەم حسابە شێخ هاتە سەر ئەمە کچێك بێنێ بەڵام زۆرتر لە دڵی خۆیا سەودای کەوتە سەر ئەوە نەشمیلەیەکی خنجیلە بێنێ. یەکێ لە ئاغا لێکەوتووەکانی «سنجەڵێ» کچێکی جوانی نازکۆڵەی بوو، گۆرانییان پیا هەڵدابوو:

فاتەلێ لە نجەلێ     بۆم بوەستە مانگ هەڵێ
بانگت ئەکەم بلێ بەڵێ     ئەوسا وەرە لەگەڵم هەڵێ

شێخ مەیلی چووە سەری. هەرچەند وتیان: یاشێخ ئەوە منداڵە لە

ڕێـك تۆدا نییـە، ئەوانـە کۆنـە چەکمـە ڕەقـن، لووتیـان بەرزە، بـە پارەی سـەرقەڵەمانەی نوشـتە و دەسـەنە بەڕێـوە ناچـن. ئـەو گوێـی نەدایـە... خوازبێنـی کـرد. ئەوسایش کـچ وەکـوو ئێسـتە نەکەوتبووە سـەر و کڵاوی خۆی، بە هەموو کەسێکیان ئەدا... دایانێ.

سا، ساڵی تێ وەرنەگەڕایەوە کۆنە داخوازێکی شەوێ وەکوو گۆرانییان پیا هەڵدابوو وتبووی: «بانگت دەکەم، بڵێ: بەڵێ» لە دەرگاوە بانگی کرد. وتی: بەڵێ و هەڵات. کاتێکیان زانـی چوونە «نەنۆڕ» ماڵی مەحموودی بەگە شەلە، ـ کە بێدینێ بوو دوژمنی شێخان ـ. لەوێ بۆ خۆی لەگەڵ لاوە خۆشەویستەکەی جووتیان گرت و شێخ بە تەنیا مایەوە. ئینجا شێخ کە جاران نیوەشەوان دەنگی زیکر و قورئانی ئەهات، ئەمجا هەموو شەوێ بە کۆڵێ گریانەوە ئەیگوت:

**فاتەڵــێ هــەی فاتەڵــێ　　بانگیان کــردی وتت بەڵێ**
**پەنــدی پیرانــە بەڵــێ　　جــوان ئەبێ لە پیر هەڵێ؟**

١١٦. «مینەکەچەڵ» هەبوو لە «چوارتا»، «فاتە» ناویش لە «سیتەك» بوو کە کۆنە ژنی «خلەیئەسمەر» بوو. گۆیا بە قسـەی فاتە، مینە داوای کردووە. هەردووکیشیان نەخوێندەوار بوون، هەریەك بە پێنج خشتەکییەك بە سەروگوێلاکی یەکا دێن. فاتە ئەڵێ:

**مینەکەچەڵ لە ماڵیا نییە مستێ بڕوێشێ**
**لێفەیەکـی نییـە پێـی تێهەڵکێشـێ**
**فەقیانـەی شـڕی کـەرێ نایکێشـێ**
**دێنێ لـە کن مـن خۆی هەڵئەکێشـێ**
**ئەڵێ با فاتە شەو لام ڕاکێشێ**

مینەش ئەڵێ:

**پێــی بڵێــن: هەی تــڕی لــەوی مرێ**
**یاڵــی خواتــەوە وەکــوو یاڵــی کــەرێ**

**ئێســتر بــە پاشــووی لە پێشــی بەرێ**
**هــەر دەڕوا و وردە گــوو هەڵئــەوەرێ**

**من کەی وتم شووم پێ بکە؟ ژنی خلەی ئەسمەرێ**

**١١٧.** ژنگەلی ئاوایی «قەدەفەر» لە شارەزوور کۆ ئەبنەوە ئەچن بۆ «مەستەکان» بۆ پرسە. «نەنکەپیرۆز»ێك هەبوو، ئەویش چوو وتی: منیش دێم لەگەڵتان، بەڵام ئەم نەنکەپیرۆزە خۆی ڕانەئەگرت، بلامانێ تڕکەن بوو.

ژنگەل وتیان: نەنکەپیرۆز مەیە شوورەییە، ئاوڕوومان ئەچێ. چیت ئەوێ ئەتدەینێ. وتی: ماڵێ مەنێ گەنمم بدەنێ تا نەیەم لەگەڵتان. وتیان باشە و لێیان دا ڕۆیشتن. لە پاشا نەنکەپیرۆز کەوتەوە بیری کە باسی ئەوەی نەکردووە بە مەنی ماڵی کێ بێ. هەستا چوو بە شوێنیانا.

ژنان لە پرسەکەدا دانیشتبوون خەریکی شین و شەپۆڕ بوون، نەنکەپیرۆز کردی بە ژوورا. هەموویان لە ترسی کەتنی نەنکەپیرۆز هەر بە جارێ وشك بوون. «پوورایشێ» سەر ڕستی بە دەستەوە بوو، مردووەکەی بە دەنگی بەرز و بە دەم گریانەوە ئەلاواندەوە، ژنەکان بۆیان ئەسەندەوە، تێکەڵکێشی کرد بە لاوانەوەکە و وتی:

**ئەوەنــدە هاتگە ســامانی نییە   سا کە پێم بێژن بە مەنی کییە؟**

ئینجا پوورایشێ وتی:

**نەنکــە پیــرۆزی دایــە پیــرە**
**تون بیقووجنە و سەخت نگای بیرە**

نەنکەپیرۆزیش هەر بە دەم گریانەوە وتی:

**باوانــت شــێوگێ، هەژ وە ســەرت وێ**
**مەنی «دەوڵەت یار» لە بەردەست وێ**

**١١٨.** کابرایـەك لـەو خـوارە ڕێبـوار بـوو، تووشـی بـوو بـە تووشـی کابرایەکیترەوە کـە دانیشـتووە و نان ئەخـوا. ئەمیش چـوو سـەلامی کـرد و دانیشـت. کابرا هیـچ خوڵکی نەکرد بۆ نانخواردن. ئینجا قاپی قسەی لەگەڵ کردەوە و پێی وت: تۆ ئەزانی من لەلای ماڵی ئێوەوە هاتووم؟ کابرا وتی: «ڕێگەت بەوێدا بووە». وتی: ژنەکەتم چاوپێکەوت زکی پڕ بوو. وتی: «ڕاست ئەکەی، کە بەجێم هێشت زکی پڕ بوو». وتی: کە من لەوێ بووم مناڵی بوو. وتی: دیارە ژنی زكپڕ ئەبێ منداڵی ببێ. وتی: «دوو کـوڕی بـوو». وتـی: «ئەوە دایکیشـی هـەر دوو دووی ئەهێنا» وتی: یەکێکیـان مـرد. وتـی: «وا دیارە دایکـی شـیری دوو منداڵـی پێ نـەدراوە». وتـی: «زۆری پـێ نەچـوو ئەویتریشـیان هـەر مـرد». وتـی: «ئـەوە لـە خەفەتی براکەی بووە». وتی: «پاش ئەوان دایکیشیان مرد». وتی: «دیارە یەکێ دوو کوڕی لە سەریەك بمرێ لە تاوانا خۆیشی ئەمرێ».

تا ئـەم قسـانەیان کـرد، کابـرا لە نانی خۆی بووەوە و هەمووی خوارد. ئینجا پێی وت: لام وایە نانەکەت بە دەم خۆش نەبوو؟ وتی: «ئاخر هەر لەبەر ئەوە بوو کە بەشـی تۆم نەدا، وتم با تۆیش تووشـی ئەو ناخۆشـییە نەبی».

١١٩. «مەلا کاکەحەمەی بێلوو» ـ کە بە «ناری» بەناوبانگە ـ لە مەریوانەوە نامەیەك بۆ شێخ محموودی حەفیدزادە ئەنووسێ.
وێنەی نامەکە مێژووی تیا نەبوو، هەروەکوو خۆی بۆ وێنەی ئەدەبێکی کوردی نووسرایەوە:

ڕوح و دڵ قوربانـــی ناڵی کەوشـــەکەت
سەربەسەرگەردی حەساروحەوشەکەت

دائیمـــا موحتـــاج و موشـــتاقم لەبـــۆ
گەنجی یادی خاتری بێ خەوشـــەکەت

ئەگەر لە ڕێگەی مەرحەمەتەوە حاڵی ئەم پیرەغولامی خۆتانە مەنزوور بفەرموون، بە کوردی و بە کورتی ئەمەیە عەرزم:

بە تێغی میحنەت و دەرد و جەفا جەرگی مەلا لەت بوو
بەڵێ مەعلوومی ئافاقە مەلا نیوەی مەلالەت بوو

وە ئەگەر مەیلت بە بەیانی توولانی بێ و ئارەزووت لە حیکایەتی «قوێلە» و «چوچانی» بێ، ئەمەیە عەرزم:
دوور لە تۆ چاوم بێ بینش ماوە، قوەی بیستنم بۆ ناڵە و گرمەی هەوری بەهاری نەماوە، حەواسم سەراسەر فەوتاوە، دڵم بە ئاگری مەحروومی وەك کەبابی سولەیمانی برژاوە، جەرگم لە قازانی سینەدا بە بڵێسەی دووری، وەك «سلّق»ـی کەرکووکی کوڵاوە.
هەمیشە چاوەڕێگەی حافیزم بۆ یاسین، موحتاجی هاتنی مەلام بۆ تەڵقین، مائیلی شەش گەز جاو و دوو گەز خاکم بۆ تەکفین. وەلێ ئەگەر بەشارەتی موژدەی سروور و سەلامەتی زاتی موبارەکتم زوو پێ بگا ـ کە بۆ من موژدەی ئاوی حەیاتە ـ یەقینم وایە چاوم ببێ بە دووربین

و زەڕەبین، وە لەگەڵ حەزرەتی‌خدرا لە حەیاتا مساوی ئەبین.

عەرزی مەخسووس: کۆچ و کلْفەت و دایکی «سەعیدبەگ»ـی بادەڵانی پەنایان هێناوە بە غولامی خۆتان، لەسەر واقیعەی کە نسبەتی قەتڵیان لە سەعیدبەگ داوە. وە فیعلەن مەحبووسە و لە حەبسخانەی حکوومەتایە. ناچار منیش ئەوا پەنام بە قاپی موبارەکت هێنا، شایەد فکرێ بە حاڵی ئەو بفەرموون، کە شایەد لە زەحمەتی حەبسا نەجاتی ببێ، وە مەعلووم ئەم پیرەغولامی قاپی خۆتانە تا قیامەت مەسروور و مەمنوون و موتەشەککرتانە. ئیتر هەرچی بڵێم زیادەیە غولامی دەرگای خۆتانە... (ناری).

.١٢٠ شێخ «علاءالدین»ـی بیارە لە ١٩٥٤/٣/١٨ دا کۆچی دوایی کرد. شێخ عوسمانی کوڕە گەورەیان لە شوێنی دانا. بۆ پرسەنامە و شادمانی جێ‌نشینی لە ٣/٢٦ /١٩٥٤ دا نامەیەکم بۆ شێخ‌عوسمان نووسی، بە ناوی پارچەیەك لە ئەدەبی نامەی کوردییەوە، وێنەکەی لێرەدا نووسرایەوە:

**شـێخی پایە بەرز وەسمانی دانا    جێ نەزەرگەکەی وەسمانی زانا**

**ناسۆری کۆچی شێخی نوورانی    سـاڕێژە بە یاد عوسمانی سانی**

جێ‌نشینی بنەماڵە و هیوابەخشی ئەو ماڵە! ئەو کۆچەی شێخی بیارە و گوڵی ئەو دیارە کردی، نێشی جێگە برینی لە دڵی دۆست و یارانا گەلێ بەسۆزترە لە تیری خەرقەپۆشان لە گۆشەی دڵی مەینۆشانا. دنیا هەوارگەی بێکەسان و بێنەوایانە. ئەو کەسەی ڕووبەرووی مەزاری پاك ئەبێتەوە، بۆ جێگایەکی دیاری سەر ئەنێتەوە لە نەمانەوە ڕوو ئەکاتە مان. لە کۆڵێتی بێ‌وەفاوە ئەچێتە کۆشکی باسەفا؛ کەواتە وامەزانە

شێخت ڕۆیشت، وا بزانی چوونی بۆ مانتە و مانیشت بۆ شانتە.

ئەو شوێنەی تۆ لێی دائەنیشی، جێ ماڵە گەورەیە. شێخانی ڕابردوو پێیان ڕەوا بینیت، بۆ ئەوە ببیت بە گوڵی هەمیشەبەهاری ئەو باخە. چاوت لە شوێنی شوێنداران بێ، ئاگری کینەی یاران بە ئاوی دەروونی فراوانی خۆت بکوژێنەوە. کە وات کرد، ژیانت ژینی یاران ئەبێ و نەمامت سەربەرزی باخی نازداران. ڕەوانی پاکی شێخی ڕابردوو لە بەهەشتی بەرینا لە کۆڕی خواناسانا نزای سەرفرازیت بۆ ئەکا. منیش دڵت ئەدەمەوە بە سوورەی موبارەکەی فاتیحە.

**دۆستی ئەو خانەدانە: سەجادی**



# شەکراوی دەماخ

١٢١. مەحمووپاشای جاف سەد سوارێکی لەگەڵ ئەبێ و ئەیانەوێ ڕووەو گەرمیان بچن. نزیـك ئەبنەوە بە ناوچەی «جەباری». پیاوێك ئەنێرێ بۆ لای «سەید فەتاحی‌جەباری» کە پێی بڵێت پاشا ئەڵێ: «بە نان و دان و گانەوە ئەبین بە میوانی». پیاوە ئەچێ کە چاوی بە سەید فەتاح ئەکەوێ، تەماشا ئەکا پیاوێکی ڕیش سپییە؛ شەرم ئەیگرێ و پێی ئەڵێ: پاشا ئەڵێ: «بە نان و بە دانەوە میوانین»؛ ئیتر باسی گانەکە ناکا. سەی فەتاح تێ ئەگا و ئەم شیعرە بۆ مەحمووپاشا ئەنووسێتەوە:

**وەك قەومی لووتن ئەهلی جەباری**

**دایـم ئامـادەن بـۆ میوانـداری**

کە پاشا ئەمە ئەخوێنێتەوە ئەڵێ: «سەی فەتاح دەستی خۆی وەشان قەت بە من ئەگیرێ؟» کە ئەچنە ئەوێ خەڵاتی ئەکا.

١٢٢. جارێك کابرایەکی کورد ئەچێتە لای حەمەپاشای‌جاف ئەڵێ: پاشا پاییز هات. ئەویش ئەڵێ: «بەخێر بێت. ئا کوڕە بۆی بار کەن کەشك و دۆینە». کابرایەکی‌تر گوێی لێ ئەبێ، ئەڵێ ئەگەر من بچم بڵێم پاشا بەهار هات زۆرترم ئەداتێ؛ دەنگ ناکات تا بەهار دێت، هەڵئەستێ ئەچێ و ئەڵێ: پاشا بەهار هات.

پاشاش ئەڵێ: ئا کوڕە تێ‌هەڵدەن ئەم دەویت باوکە. کابرا ئەڵێ پاشا

بۆچ تێمهەڵدەن؟ ئەی لە کاورای پاییزت بۆچ هەڵنەدا؟

ئەویش ئەڵێ: «پاییز کەشکی تیایە، دۆینەی تیایە، برویشی تیایە، بەهار چی تیایە بۆ من؟ گیای تیایە؛ ئەویش بۆ بزن خاسە. خۆ من بزن نیم».

ئینجا کابرا ئەڵێ: «پاشا، پاشا، تۆ سەری خۆت تۆزێکیترم هەر تێهەڵدەن، ئەگەر ئەو دەویت باوکە نەوایە، منیش نەئەهاتم و ئەم تێهەڵدانەم نەئەخوارد». پاشا بە قسەکەی پێ ئەکەنێ و بۆ ئەویش بار ئەکا.

١٢٣. ڕەزابەگی فەتاح‌بەگ نیوەڕۆ بوو لە ئاوایی «کەلار» ڕاکشابوو. «حسە» کوڕە مسکێنێکی دوانزە ساڵان بوو؛ بۆ ئەوە باوەشێنی کا تا خەوی لێ ئەکەوێ، لە ژووری سەریەوە دانیشتبوو. چەند منالێکیتریش لەولاوە دەنگەدەنگیان دەهات، نەیانئەهێشت خەوی لێبکەوێ. ڕەزابەگ تووڕە بوو، سەری بەرز کردەوە و وتی: «منالان! وەڵڵا جووکە بکەن هەستم، جووکەتان ئەبڕم». منالەکان بێدەنگ بوون و خەوی لێکەوت. حسەش هەر باوەشێنی ئەکا. کە زانی وا خەوی لێ کەوتووە بە سەبرێ سەری بردە بناگوێی و بانگی کرد: «ڕەزابەگ، ڕەزابەگ». ڕەزابەگ چاوی بەرز کردەوە وتی: ها... ئەمیش وتی: «ڕەزابەگ جووك، ڕەزابەگ جووك. ئا بزانم چۆن جووکەجووکەم ئەبڕی؟» ئەمەی وت هەستا باوەشێنی فڕێ دا و بۆی دەرچوو.

١٢٤. حاجی مستەفاپاشا وتی: ئەمیری حەج بووم، بەسەر حاجییەکانەوە ئەگەڕام. سەیرم کرد وا لەبەر کەعبەدا کابرایەکی سووری قەڵەوی ڕیش‌سپی کەوتووە، ئاو ئەکەن بە سەریا؛ بە جلوبەرگەکەیا

زانیم کوردە، چووم بەلایەوە. ئەو ساڵەش حەج کەوتبووە مانگی تەمووزەوە، گۆشتی کاڵ ئەخرایە سەر لمەکە ئەبرژا. کابرا چاوێکی بەرز کردەوە هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشا، لە پاشا سەری بەرز کردەوە ڕووی کردە ئاسمان و وتی: «ئەرێ خوا! تۆ بۆچ چاوت نەبوو لەو دەشتی گەڵگەی ئاوداری هەوا فێنکەدا ماڵ بۆ خۆت دروست کەی؟ ئەمە شوێن بوو تۆ ناوتەوە؟ ئەگەر جارێکیتر ڕووم کردەوە ئەم شوێنە بزانە من کوڕی خەڵك نیم». وتی: لە پاشا پێم وت: کابرا ناوت چییە و خەڵکی کوێیت؟ وتی: حاجی قادری ڕوغزایی. («گەڵگە» دەشت و گردێکە لەلای پێنجوین).

١٢٥. کابرایەکی مەنگوڕی، باراشێك ئەبا بۆ ئاش ئەیهاڕێ و ئەیهێنێتەوە. لە گەڕانەوەدا ئەگاتە سەر دەوەنێك و لەوێ تووشی کابرایەکی دراوسێیان دەبێ کە ئەویش هەر ئەچێ بۆ ئاش. لێی ئەپرسێ ئەڵێ: ئەوە تۆ باراشەکەی خۆتت هاڕی؟ ئەویش ئەڵێ: «ئەدی کوو؟ نایهاڕم!». ئەمیش ئەڵێ: «بە گۆڕە بابم دەسا ئەگەر من لە کنت بوومایە نەمدەهێشت چەقە لەوێ ئاشەوە بێنیت». ئەویش ئەڵێ: «کوڕە دایەلێت دەگێم چما نەتدەهێشت؟» ئەڵێ: «بە گۆڕە بابم نەمدەهێشت».

لەم قسەیەك و لەو قسەیەك، ئەبێ بە شەڕیان. ئینجا ئەویکە لە ئاش هاتۆتەوە ئەڵێ: «دەسا دایەلێت دەگێم، دەبا ئەم دەوەنە ئاش بێت بزانم چە ڕایەت دەکەوێ نایەلێت؟». بارەکان لە کەرەکان ئەکەنەوە و هەریەکە تەکان ئەداتە بارەکەی خۆی کە بیکا لە ئاشەکە. لەم سمڕ سمڕە دەست ئەدەنە خنجەر و یەکتری ئەکوژن. کە بە سەریانا ئەچن ئەبینن وا دوو بار و دوو تەرم لەوێ کەوتوون، یەکێکیان نووزەیەکی تیا

ماوە. کە لێی ئەپرسن، ئەم کەینوبەینە ئەگێڕێتەوە و ئەویش ئەمرێت.

١٢٦. مام سولەیمانی سێتەبەسەری هەمەوەن لە چەمچەماڵ لە کۆڕێکا دانیشتووە، تووڕەیان کردووە؛ ئەویش وتوویە:

**ئیتر مەوەشـــن قســـەی بێ سەمەر**
**لە قوونتـــان ئەوڕم لکـــێ چەوەنەر**

ئینجا وتوویە: «ئەگەر لە سەری بڕۆن، قوولتریش ئەوشم».

١٢٧. مچە گەوجی باوەجانی هەبوو کە ئەکەوتە گڕوگاڵی شیعر، بەمجۆرە شیعری ئەوت:

**هەکەمـــە زوڕنـــا، دەکەمـــە ژێـــرت**
**وەك چەقچەقەی ئاش هەڵپەڕێ کێرت**

١٢٨. ڕەسواغای مەنگوڕ هەبوو، پیاوێکی ڕیش‌سپی و بەزمەلی بوو. زۆری حەز لە قومار دەکرد، هەندێ جاریش نوێژی دەکرد و قورئانی دەخوێند. جارێکیان لە کۆڕێکی دیوەخانەکەیا دائەنیشێ و ملی خەڵکەکە ئەگرێ بۆ ئەوە قوماری لەگەڵ بکەن. کەس ملی ناداتێ و لەگەڵی ناکا. کاتی قورئان‌خوێندنەکەشی نزیك بووەتەوە بە ناچاری خەڵکەکە ئەترسێنێ و ئەڵێ: «ئەگەر قومارانم لەگەڵ ناکەن دەچم قورئانان دەخینم، دەسا درەنگە».

١٢٩. دزێـك چووە ماڵێك هەرچەندە گەڕا هیچی تیا نەبوو بیدزێ. هات بڕواتە دەرەوە، خاوەن ماڵەکە پێی وت: [هەڵی‌تەکێنە بارت سەنگینە. دزەش ئەڵێ:] «خوا هەقە، سا تۆیش ماڵت ڕەنگینە».

١٣٠. خێڵێك لە «تاریەر» خستبوویان. کابرایەکی کورد ماڵی لە ژوور هەموو ماڵەکانەوە بوو، شەو هاتبووە خوارەوە لە ماڵی کابرایەکی‌ترا نوستبوو لە باخەڵی ژنێکا. کابرا و ژنە تا پاش هەتاو کەوتن بە ئاگا نەهاتبوون. کابرا کە هەڵئەستێ تەماشا ئەکا هەموو هاوماڵەکان چاویان لێیە کە لە باخەڵی ئەم ژنە دێتە دەرەوە، ئینجا هیچی پێ نەمابوو ئەیوت: «دەك خوا بیبڕێ هەواری لێژ، پیاو ئێوارە لە ماڵی خۆیا ئەخەوێ، کەچی بەیانی لە ماڵی هاوسێ خەوەری ئەبێتەوە».

١٣١. کابرایەك چوو بۆ کاروان، منداڵێکی بچکۆڵەی هەبوو لە بێشکەدا بوو. لە دوای پێنج ساڵ هاتەوە تەماشای کرد چوار منداڵی لە گوێئاگردان دانیشتوون. لە ژنەکەی پرسی ئەم منداڵانە چین؟ ژنە وتی: «ئەوەیان خۆت لێرە بووی گەورە بوو، ئەوەشیان کە تۆ ڕۆیشتی لە زکما بوو، ئەو دانەشیان خەوم بە تۆوە دیبوو». کابرا وتی ئەمە سێ، ئەی چوارەمینیان چییە؟ ژنە وتی: «مێردەکە، ئەو سێ کوڕەت بمرێ ئەگەر لەوەیان بپرسی؛ چونکە بچکۆڵەکەی گوێئاگردانە. نە تۆ ئەو بدوێنە، نە ئەویش تۆ بدوێنێ».

١٣٢. کوڕێکی کورد هەبوو گاڵتەچی بوو، هەموو ڕۆژێ کە ئەڕۆیشتەوە ماڵەوە، دایکێکی پیری هەبوو لێی ئەپرسی، ڕۆڵە دەنگوباس چییە؟ ڕۆژێك دیسان ئەپرسێ. کوڕەش وتی: «بە خوا دایە ئیمڕۆ بە فەرمانی پاشا جاڕیان دا هەرچی بێوەژنێك دانێکی مابێ ئەبێ شوو بکا. هەرکەس نەیدا بە شوو تووشی جەریمە ئەبێ». پیرێژنەش وتی: ڕۆڵە دەخیل! خۆت تووشی جەریمە مەکە، ئەوەتە من دوو کوتەرە دانم ماوە».

**١٣٣.** حەمەبەگ وتی: کابرایەکم لا بوو ناوی قادرەسووری لەك بوو. ڕۆژێك باسی پیاوی نوێژ قایم و دیندار ئەکرا، قادرەسوور وتی: ناشوکری نەبێ زەمان خراپ بووە کەس ترسی خوای نەماوە، خەڵکی بە تەنگ نوێژ و ڕۆژووەوە نین. ساڵێك لەگەڵ بیست سواری هەمەوەن چووین بۆ جەردەیی؛ لە قاتە قاتەکانی کەرکووك کاروانێکمان ڕووت کردەوە. سەرکردەمان «مەخۆل» هەمەوەن بوو. بەڕەحمەت بێ! بە دەستی خۆی پێنج کەس لە کاروانەکەی کوشت. هەموو بار و شتومەك و وڵاغەکانمان هێنا گەیشتینە «شیوەسوور». بستێکی مابوو ڕۆژ ئاوا ببێ، هەزار ڕەحمەتی لێ بێ، مەخۆل! بانگی کرد: «عەشرەت نوێژم نەکردووە». دابەزی بە پەلەپەل دەستنوێژی شت و نەیهێشت نوێژەکەی بچێ، نوێژی خۆی کرد. ئینجا ئێستا پیاوی وەها دیندار ماوە؟!.

**١٣٤.** حەمەبەگی حاجی ڕەسوول‌بەگ ئەیوت: سەید عومەری حەفید ئەیگێڕایەوە ئەیوت: ساڵێك باڵوێزێکی ئێران لە سولەیمانی بوو، ناوی «یەحیاخان» بوو. ئێجگار شیفتەی کاك ئەحمەد بوو، هەموو وەختێ ئەهاتە مزگەوتی گەورە بۆ خزمەت کاك ئەحمەد. بە ڕێکەوت کاك ئەحمەد چووبوو بۆ شاربازێڕ. پێنج شەش تاجری سنەیی هاتبوونە سولەیمانی، شابەندەر گرتبوونی. یەکێکیان ـ کە نەگیرا بوو ـ هاتە ماڵی شێخ. «ئایشەخانیش» منی بانگ کرد وتی: ڕۆڵە، لەگەڵ حاجی مەلا ڕەسوول بچن بۆ خزمەت شابەندەر تکای لێ بکەن بەڵکوو ئەو حەپسانە بەرەڵا بکا. منیش لەگەڵ حاجی مەلا ڕەسوول چووم. قاپیوانێك لە قاپییەکە بوو، پرسی: چیتان ئەوێ؟ حاجی مەلا وتی: عەرزی باڵوێز بکە حەفیدی «کاك ئەحمەد» هاتۆتە خزمەتی؛ ئەویش

دەستبەجێ وتی: بفەرموون. چووینە ژوورەوە زۆری پێخۆش بوو، حورمەتێکی تەواوی گرتین. لە پاشا حاجی «مەلا ڕەسوول» وتی: جەنابی شابەندەر! عایشەخانی حەرەمی کاك ئەحمەد، سەید عومەری حەفیدی ناردۆتە خزمەتتان کە ئەو توجارە کوردستانییانە بەرەڵا بفەرموون. لەگەڵ ئەم قسەیەی حاجی مەلا، شابەندەر وەکوو ئاگر بڵێسەی بەست و وتی: «ئای، ئای! عایشە، عومەری ناردووە بۆ تکا؟ یاڵڵا. دەرەوە، یاڵڵا دەرەوە». خێرا گاڵی دوو خزمەتکاری دا هاتن بە زۆر دەریان کردینە دەرەوە.

**١٣٥.** کابرایەکی کورد هەبوو سەبیلی ئەکێشا. هەموو دەمێ سەبیلەکەی بە دەمیەوە بوو. بە ئەستێ‌وبەرد ئاگری ئەکردەوە، پووشووی چاکی دەست نەئەکەوت، دارگەندەڵی لە جیاتی پووشوو بەکار ئەهێنا. گەندەڵەکەیش درەنگ ئاگری ئەگرت، کابرای کوناوەجەرگ کردبوو.

کابرا نەخۆش کەوت و کەوتە گیانەلا. ژنەکەی چوو بەلایەوە پێی وت: «پیاوەکە! پیاو بە وەسیەت نەمردووە، تۆ هەقی کێت لایە و کێش هەقی بە سەرتەوەیە دەنگ بکە با من بیزانم». پیاوەکەش وتی: «ژنەکە هەقی کەسم بە سەرەوە نییە، هەرکەسیش من هەر هەقێکم لایەتی و ڕۆژێك چاوم پێ کەوتووە، گەردنی خۆش و ئازاد بێ وەکوو شیری بەری دایکی؛ بەڵام تا ڕۆژی قیامەت لە دیوانی خواشدا گەردنی دارگەندەڵ ئازاد نەبێ.

**١٣٦.** کابرایەکی کورد ژنێکی زۆر تووڕەی هەبوو، ئەمیش زۆری لێ ئەترسا. هەموو ڕۆژێ گۆشتی ئەکڕی و بە ژنەکەی ئەوت: بیکە بە «کەشکەك». ڕۆژێك ژنەکەی وتی: پیاوەکە! ئەوا هاوین هات، ئیتر کەشکەك ناخورێ و جارێکی‌کە داوای کەشکەك مەکە؛ ئەگەر

دەفعەیەکی‌کە ناوی کەشکەك بێنی خراپت پێ ئەکەم.

بە ڕێکەوت ڕۆژی دوایی کابرا گۆشتێکی قەڵەوی هێنا بووەوە، ژنەکە وتی: بیکەم بە چی؟ کابرا هیچ قسەی نەکرد، چوو پەیژەکەی نا بە گوێسوانەکەوە و سەرکەوتە سەر بانەکە. ئینجا لەوێوە بانگی کرد: «سا وەڵڵا کەشکەك و کەشکەکیش».

١٣٧. کابرایەکی کورد لە دەورەی تورکانا ئەگیرێ بە سەربازی و ئەیبەن بۆ مەشق‌کردن. بە ڕیز لەگەڵ سەربازەکانی‌ترا ڕایئەگرن و ئەکەوێتە سەرووی هەموویانەوە. ئارەزووی «سەبیل» ئەکا. کیسە و سەبیلەکەی دەردێنێ و ئەیەوێ سەبیلێ تێ‌کا. لەو کاتەدا سەرژمێر دێت سەرژمێرییان بکا، ئەچێتە بەردەمی کابرا کوردەوە ئەڵێ: بلێ «بیر» ئەویش ئەڵێ: «برا سەورکە با سەبیلەکەم تێ‌کەم». ئەڵێ: کورە بلێ بیر سەویلی چی؟ ئەوا ئەویش خەریکە دەست بەسەر سەبیلەکەیا دێنێت، توتنەکەی ساف ئەکا، هەر پێی ئەڵێ برا سەورکە با سەویلەکەم تێ‌کەم. کابرای سەرژمێر ئەوەستێتەوە دوو سێ زللەی چاك ئەکێشێ بە بناگوێیا. ئینجا کابرای کوردە ئەڵێ: «برام بیر، باوکم بیر، کوڕی ئامۆزام حەوجار بیر بزانم بووی وە شا. کوڕ تاینگ نایەڵی پیاو سەویلەکەی تێ‌کا».

١٣٨. کابرایەك هەبوو براخاسی ناو بوو؛ قسەمان لە هاڵ و هەواڵی عەسکەرییەوە ئەکرد کە گۆیا ئێستا ڕێکوپێکترە. وتی: «برا ڕێکوپێکی چی؟ من خۆم لە دەوری عوسمانییا زەفتیە بووم، دووکانەکەشم قەسابی بوو. هەموو ڕۆژێ کە وەختی مەشق ئەهات دوو تارانیم ئەدا بە یەکێ ئەچوو مەشقەکەی بۆ ئەکردم. بەو قورعانەی لێت خوێندووە

ئێستە و ئەوساش خۆم ئەو قەنارەمە بەجێ نەهێشت. ئەوەبوو عەسکەری؛ ئێستەش ئەمانە بە ناخێری گیانیان گوایە عەسکەری ئەکەن».

١٣٩. ڕۆژێـك ژنـە دراوسـێیەك ئەچێتـە ماڵی مەلایەك بۆ پرسـیاری شـتێك. لەسـەر خۆڵەکە دائەنیشـێ. مەلاژن لـەوێ نابێ، کە دێتەوە سـەیر ئەکا دراوسـێکەیان لەسـەر خۆڵەکە دانیشتووە. ڕوو ئەکاتە مێردەکەی و ئەڵێ: «ئەوە بۆچی وا بێوێڵی، نەدەبوو سەرینێکی بدەیتێ بیخاتە ژێر قنگی».

مەلایش پشتییەك لە ژێر شانیا ئەبێ دەری ئەهێنی و ئەیداتە دەست ژنەکـەی خـۆی و ئەڵێ: «ئـەو پشـتییەی بـەرێ با بیخاتـە ژێـر قـوزی». ژنەکـەی ئەڵـێ: بەخـوا مەلا تۆ یان خەڵەفاوی یان شـێت بـووی؟ ئەڵێ: بۆچی؟ ئەڵێ: «مردووت مرێ! ئەوە قسـەیە تۆ کردت؟» مەلایش ئەڵێ: «مردووت مرێ و چاویشت دەرێ، تۆ وتت بیخاتە ژێر قنگی، من وتم بیـدەرێ با بیخاتـە ژێـر قوزی. خۆت ئەزانی چوار پەنجـە بەینیان نییە، ئیتر ئەم هەراهەرایەت لە چییە؟»».

١٤٠. کابرایەکـی کـورد ژنەکەی پێوە نانیشـێ، ئەویـش ئەچێتە لای مەحمووپاشـا شـکات لـە ژنەکـەی ئەکا. هـەردوو لا ئەبرێنـە بـەردەم پاشـا. پاشـا لـە پیاوەکـە ئەپرسـێ شـکاتی چیـت هەیـە لـەم ژنە؟ ئەڵێ: «قوربان پێمەوە نانیشێ، هەموو جار چاوی لە دەرەوەیە، بە شەو ئەچم ـ لە شەرعا شەرمی بۆ نییە ـ لەگەڵی بنووم، قبووڵی ناکا».

ئەمجـا پاشـا ڕوو ئەکاتـە ژنەکە و ئەڵێ: هەی بێحـەیا، بۆچی وەکوو شەرع ئەفەرموێ لەگەڵی هەڵناسی و دانانیشی؟ ئەڵێ: «پاشا، بە سەری تۆ درۆ ئەکا، هەموو شەوێ پێکەوە ئەنووین. کابراش ئەڵێ: «پاشا، پاشا!

بەو قورعانەی تۆ ناگتەسە سەر ڕانی ڕاستت، ئەو گانەی ئەو وە منی ئەدا تۆ وە گەماڵە بۆرەی دەرماڵی خۆتی نادەی». مەحمووپاشا لەم قسەیە نەختێ فیکری کردەوە. قەندەیەکی بە دەستەوە بوو، مودنەیەکی کارەبای گەورەی پێوە بوو، مژێکی لە قەندەکە دا. ئەمجا ژنەکە هەڵیدایە وتی: «دەسا پیاوی درۆزن، قەندەکەی پاشا وە قنگی». پاشا هەر ئەوەندەی پێما وتی: بڕۆن، بڕۆن دەی.

١٤١. کابرایەکی کورد ژنێکی هێنا؛ لەبەر ئەوە کە حیز بوو، عەشیرەتەکەی پێیان تەڵاق دا. لە دوای بەینێ ژنێکی‌تری هێنا، دیسان هەروا. دوایی گەڕا گەڕا، لە ماڵە گەورە کارەکەرێکی هێنا. زۆری پێ نەچوو لە قەراخ چەم شوانێکیان بە سەرەوە گرت. لە ئاواییدا بوو بە هەرا.

مەحمووپاشا مێردەکەی بانگ کرد وتی: کەرانباوگاو ئەمە چییە یەکێکت هێنا حیز بوو، دووت هێنا حیز بوو، سێت هێنا حیز بوو؛ چییە بۆچ وایە؟ کابرا زۆر دلگران بوو وتی: «پاشا بێژم چی؟ لەم تالعە ڕەشەی من هەمە، وەو قورعانەی تۆ خوێندگتە کەیخسرەوبەگی کوڕت بەو هەموو ڕەشادەت و پیاوەتییەوە بوێ وە ژنی من، حیز ئەوێ. تالعم خراوە، بێژم چی؟»

١٤٢. جارێك مەحمووپاشا لە هۆزی «عەمەڵە» تووڕە بوو، هانی دا چوارسەد سوارێك لە «پشتماڵی» و «تەرخانی» چوون سێ چوار کۆماریان لە عەمەڵە تاڵان کرد و هەموو تاڵانەکەیان هێنایە ماڵی پاشا کە ئەو وەختە پێیان ئەوت: «ماڵەگەورە». لە گوێ «زەڵم» و «تانجەڕۆ» ـ واتە لە «دووئاوان» ـ هەڵیدابوو. عەمەڵەکان چوون پەنایان بۆ چەند

کوێخایەك برد و هێنایانن بۆ تکا بۆ لای پاشا. پاشا لەسەر تکای ئەوان وتی: تاڵانەکەیان بدەنەوە. هەرکە ماڵاتی خۆی دایە پێش و ڕۆیشت، مەگەر «عەولحەمی» ناوێك نێرەکەرێکی دیار نەبوو. دوو سێ جار چووە خزمەت پاشا داوای کردەوە، پاشاش وتی: بەخوا من نازانم، بچۆ ناو تاڵانەکە بگەڕێ بۆ خۆت بیدۆزەرەوە.

لەولاوە هاواڵەکانی تاڵانیان دابووە پێش و ئەڕۆیشتنەوە. لەوبەری ئاوی زەڵمەوە یەکێ بانگی کرد: «هۆ، هۆ، هۆ، عەولحەمی، عەولحەمی، عەولحەمی!». عەولحەمیش هەر لەناو دەواری دیوەخانەکەی پاشادا کە بە پێوە ڕاوەستابوو بە دەنگێکی قایم وتی: «هۆ بەڵێ، هۆ بەڵێ، هۆ بەڵێ». کابرا بانگی کرد و وتی: «بێوەڕێوە، بێوەڕێوە، بۆچی وێسیاگی؟» عەولحەمیش وتی: «کوڕە بێژم چی، کوچکی تۆی لێ نەوارێ! نێرەکەرە کەوەم ماگە، پاشا ناچێتە ژێری، ناچێتە ژێری». پاشا بانگی عەلیبەگی کوڕی ئەکا ئەڵێ: «ڕۆڵە بچۆ کەرێك بدە بەم سەگبابە با نەمخاتە ژێر نێرەکەرەکەوە».

**١٤٣.** دەروێشێکی جاف ڕۆژێکی هاوین لە «بێکەسە» تووشی پیاوێکی «مۆریاسی» ئەبێ، باری ترێی پێبوو. دەروێش ڕووی کردە کابرا وتی: «براکە دیارە بارەکەت ترێیە و منیش زۆر دڵم بە ترێوەیە. پارەشم پێ نییە، دەروێشم ناتوانم بە زۆر لێت بسێنم، لە ڕێی خوادا بە گەردنئازادی دوو هێشووم بدەرێ». کابرای خاوەن ترێ وتی: بەخوا برا بە پارە نەبێ نایدەم. دەروێش دیسان وتی: «پیاگی خاس بە، دڵم ئەسووتێ وە گەردەنئازادی تاقەیەك هێشووم بدەرێ». کابرا وتی: برا قسە هەر یەکە، بە خۆڕایی ناتدەمێ. ئەمجا دەروێش وتی: «بێژم چی؟

ئەمە کێری کەریمە سوورە وا لە قنگما ئەگینا ئاوا تۆ ڕزگارت نەئەبوو، بچۆ خوات لەگەڵ!».

١٤٤. جارێك مەحمووپاشا ڕێی ئەکەوێتە ماڵ کابرایەکی «بێسەری». ئەو کابرایە دوو ژنی ئەبێ، یەکێکیان ناوی «پیزە» ئەبێ، ئەویکەیان «پەخە». پیزەیان چێشتی چاك دروست ئەکا و ئەو ڕۆژە بۆ پاشا پڵاوێکی نایاب دروست ئەکا. پاشا کە ئەیخوا بە کابرا ئەڵێ: ئافەرین بۆ کەیبانووت، پڵاوێکی زۆر چاکی لێنابوو.

بە ڕێکەوت بۆ ساڵی دوایی مەحمووپاشا ڕێی ئەکەوێتەوە ماڵیان. کابرا بە پیزە ئەڵێ: پیزە پاشا میوانمانە بزانم چۆن چێشتێکی بۆ لێئەنێی. پیزە خۆی لێ هەڵئەکا و چێشت دروست ئەکا و خوێی تێئەکا. پەخە کە ئەمە ئەبینێ ئەویش ئەچێ بە دزییەوە مستێکیتر خوێ ئەکاتە چێشتەکەوە. لە وەختی نان داکردنا، پیزە کە لێی ئەخوا سەیر ئەکا زۆر سوێرە. مێردەکەی بانگ ئەکا و ئەڵێ: من ئەوەندەم خوێ نەکردووە ئەم چێشتەوە، کەچی ئێستە زۆر سوێرە. کابرا ئەڵێ: ئیشی پەخەیە. دارێك لە پەخە هەڵئەگرێ دەست ئەکا بە لێدانی تا ڕاستی پێ ئەڵێ. ئینجا نان دائەنێن و کابرا ڕوو ئەکاتە مەحمووپاشا و ئەڵێ: «پاشا ڕوو زەردم! بەخوا پیزە پڵاوێکی خاسی بۆ کردبوویت، بەڵام ڕووی دایکی ڕەش وێ، پەخە گووی تێکرد».

١٤٥. «لالە سەرحەدی ڕۆغزایی» تۆبەی کردبوو، وازی لە دزی و ڕێگری هێنابوو. ڕۆژێك لەسەر گردی بێکەسە هەڵیاندابوو، کوڕەکانیشی دەوریان لێدابوو. ڕانێکی شارباژێری بەوێدا تێپەڕی، ئەویش بەرماڵی ڕاخستبوو، لەسەر بەرماڵ نوێژ و تەزبیحاتی ئەکرد.

سەیری کرد کوڕەکان هیچیان لە شوێنی خۆیان نابزوون، بە دەم تەزبیحاتەکەوە وتی: «"لا إلٰهَ" هی لەڕ نە، سپی بێنن هی ڕەش نە، بۆ بەرماڵی باوکتانە». تەماشای کرد کوڕگەل هەر ناجووڵن، ئینجا چاری نەما وتی: «ئەرێ بێ فەڕینە! کوڕگەل گاینە! من دەستی شێخگەلم گڵاو کردگە ئێوە چی؟ ئەو ڕانی شارباژێڕی لە کەلەکە چوو وەو دیوا خۆ ئەم دیواخانە وە تڕ ڕاناگیرێ».

١٤٦. حەمەبەگی حاجی ڕەسووڵ بەگ وتی: عەلی بەگی مەحمووپاشا بۆی گێڕامەوە وتی: ساڵێك ماڵمان لە «کانی چەقەڵ» بوو. حەمەی سان ئەحمەدی سەدانی دوو بەرانی بە دیاری بە شوانەکەی خۆیا ناردبوو بۆ پاشا. کابرای شوان بەرانەکانی ڕابوارد و لێیان وەرگرت، ئیتر خۆی چووە قاوەخانەکە. قاوەچییەکەی پاشا قاوەی لێ ئەنا، کابرا بە دەنگێکی قایم لە قاوەچییەکەی پرسی: «ئەرێ برا توخوا ئەوە چی بۆ پاشا دروست ئەکەی؟» قاوەچیش وتی: قاوەیە. کابرا وتی: برا ئەگەر شتێك بێژم قەیناکا؟ وتی: بێژە. کابرا وتی: ئا چکێکم بدەرێ. قاوەچییەکە فنجانێکی بۆ تێکرد و دایە دەستی. کابرا قومێکی لێ دا، کە زانی تاڵە گورج تفانیەوە و لە قاوەچییەکەی پرسی: «ئەم شتە، پاشا وە پارە ئەیسێنێ؟» ئەویش وتی: ئەرێ وەڵڵا. کابرا ئیتر سێ و دووی لێ نەکرد و وتی: «ئەی کوتامە دایکی، ناکا ئەو پارەیە بدا وە هەڵواگەزۆ، ئەچێ ئەم تفت و تاڵەی پێ ئەسێنێ». پاشا تەماشایەکی ئێمەی کرد و وتی: کورە دەنگ مەکەن قەیناکا.

١٤٧. جارێك مەحموو پاشا ڕێی ئەکەویتە خێڵێکی «ئاخەسووری» لە کوێستان. تەماشا ئەکا هەوارەکەیان جێگایەکی زۆر خۆشە

و سەرچاوەیەکی جوانی لێیە، ڕوو ئەکاتە خەڵکەکە و ئەڵێ: خزمینە! بەخوا شوێن هەوارێکی خۆشتان هەیە، خۆزگە منیش هاوماڵی ئێوە بوومایە! کوێخاکەیان لەولاوە ئەڵێ: «پاشا، بم وە قوروانت پار نەوگە و پێرار نەوگە، هەر ئێستە دەوارێکت بۆ هەڵئەدەم و دێلەشرێکت لێ مارە ئەکەم، ئیتر لەلای ئێمە دانیشە». پاشا چاوێ لە سوارەکانی هاوڕێی دائەگرێ و پێ‌ئەکەنێ و هیچ دەنگ ناکا.

**١٤٨.** «تۆفیق ئاغای گەلاڵی» گێڕایەوە وتی: وەختی خۆی کابرایەکی شێخ‌سمایلی، لەگەڵ عەباس‌ئاغای باوکم ناسیاوی هەبوو. ڕۆژێك کۆچمان کرد، بۆ کوێستان ئەچووین. من و «بەوراغا» و «ئەولاغا» و دوو سواری‌کە لە خزمەت باوکما بووین. ڕێمان کەوتە بەر ماڵی کابرا. کابرا لەگەڵ باوکمی چاوپێ‌کەوت، ڕایکرد جڵەوی ئەسپەکەی گرت و وتی: ئاغە، یان ئەبێ ئەمر بکەن بمکوژن، یا خود دابەزی لە ماڵ ئەم خزمەتکاری خۆتە قاوەڵتی بکەی. باوکیشم ڕووی کردە ئێمە فەرمووی: ئەم پیاوە لە قەدیمەوە دۆستمە، با دڵی نەیەشێ، دابەزین.

ئیتر دابەزین چووینە ژێر دەوارەکە، کابرا دەستوبرد گیسکێکی سەر بڕی، خۆی و ژنەکەی دەستیان کرد بە گرون و لێنانی. دوو سێ سەعات دانیشتین، هەر چیغێکیش لە بەینمانا بوو، باوکم بانگی کرد فەرمووی: ئێمە ڕێمان دوورە زوو نانمان بدەنێ با بیخۆین و بڕۆین. گوێمان لێ‌بوو کابرا لەودیوی چیغەکەوە بە ژنەکەی وت: درەنگە تێکە با بۆیان بەرم. ژنەکەش وتی: چی بکەم، گۆشتەکە نەکولاوە، کابرا وتی: «کچێ، تێکە؛ ئەمانە گەلاڵین. گەلاڵی سەگی سیا بە پێستەوە ئەخۆن». باوکم تەماشایەکی ئێمەی کرد و زەردەخەنەیەکی کرد و ئێمەش پێکەنین.

١٤٩. ڕۆژێك کوێخایەك ئەچێتە خزمەت مەحمووپاشا. بیستبووی کە پاشا لە ئەستەمبوڵ دانی دروست کردبوو. لێی ئەپرسێ: «قوروان ئەو دگانی لە نوێ ژنیاگی بە دەس هەڵپەرسیاگە بۆچی خاسە؟» پاشاش ئەڵێ: «قسە ئەکەم کەس نازانێ دانم نەماوە و شتیشی پێ ئەخۆم». کابرا ئەڵێ: «قوروان بێقەوی نەوێ، نوقڵە ڕەقە بادامییەکان و کەشکی پێ ئەخۆی؟» پاشا ئەفەرمووی: نەوەڵڵا! شتی وا ڕەقی پێ ناخورێ. کابرا ئەڵێ: «بەخوا دگانێ کە نوقڵەبادامی و کەشکی پێ نەخورێ گووی تێوێ». پاشاش هیچ دەنگ ناکا.

١٥٠. کابرایەك لە شارەزوورەوە هات بۆ شار، کە گەڕایەوە هاوڕێیەکی هەموو جار هاتوچۆی شاری ئەکرد، چووە لای و وتی: «حەمە، ئای ئەم جارە لە شار شتێکم لە بازاڕ کڕیبوو نیوەڕۆژە خواردم؛ بەخوا خۆش بوو. حەمە وتی: ئەزانم چی بوو. پرسی دە بزانم چی بوو؟ وتی: «لوولە کەواوەکە بوو؟» وتی: «ناوەڵڵا». وتی: «شەروەتە ئاوەکە بوو؟» وتی: ناوەڵڵا ئەوەش نەبوو. ئەمجارە وتی: «کە واوێ کەلە و پاچەکەوو؟» وتی: «ئەرێ بەخوا خۆیەتی. ئای حەمە ئاوەکەی! ئاوەکەی!»».

١٥١. دەروێشێکی جاف ڕۆژێك لەگەڵ ژنەکەی ـ کە ناوی خاتە بوو ـ لێیان ببوو بە دەمەقاڵ. ژنەکە مانگایەکی سووریان هەبوو، خەریکی مانگا دۆشین بوو، هەر بۆڵەبوڵی ئەکرد. دەروێش بە بۆڵەبۆڵەکەی زۆر تووڕە بوو، پێی وت: «خاتە! خاتە! بێدەنگ ئەبی؟ بێدەنگ وە، ئەگینا وەو سەیساقە لێت ڕاستەوەوم لە ژێر مانگا سوورەوە نەوی لە ژێر کەریمەسووری کەسنەزانەوە وی بەم گاڵۆکە گشت گیانت ئەشکێنم».

١٥٢. ئەمینی دەروێش‌فەتاحی بەردەزەڕی هەبوو، وتی: بە کاروانستانێك ڕێم کەوتە موکریان. شەوێکیان لە ماڵی «برایمی فاتە» بووم، سەیرم کرد ژنێکی جوانی هەیە. منیش جۆشی گەنجێتیمە، دڵم لە ژنەکە چوو، دەستم کرد بە چاوبڕکێ لەگەڵکردنی. برایم هەستی پێ‌کرد یا نەیکرد، شەوێ هەموو لە ژێر کورسییەکەدا نووستین. کە چرایەکە کوژێنرایەوە، برایم جێگەکەی لەگەڵ جێگەی ژنەکەیا گواستەوە منیش پێی نازانم. دوو بەشی شەو ڕۆیشت، دەستم ڕاکێشا بۆ شوێنی ژنەکە، دەستێکم هات بە دەستەوە هێنام و کێری خۆمم ڕەپ کرد و خستمە مستیەوە. هەندێ دەستی لێ‌دا و پاشان ئەویش دەستی منی ڕاکێشا و لە خۆما ئەیخاتە سەر قوزی، کەچی کێرێکی لە هینەکەی خۆم زلتری خستە دەستمەوە. کە ئەمەم دی، هەڕا بوومە تنۆکی ئاو و ئیتر خەوم لێ‌نەکەوت؛ بەیانی لەگەڵ تاریك و لێڵەدا هەستام و وڵاخەکانم بار کرد و ویستم بڕۆم؛ دنیاش زۆر ساردە.

ئەوەندم زانی برایم هات و سەرڕێی پێ گرتم و وتی: برا ئەوە بەم بەیانی زووە بۆ کوێ ئەچی؟ دانیشە قاوەڵتی بکە و دنیاش تۆزێ گەرم دابێ و ئەو وەختە بڕۆ. ئەوا منیش لە شەرمانا ناتوانم سەر بەرز کەمەوە. بەبێ ئەوە بتوانم قسە بکەم دانیشتم و قاوەڵتیم کرد، ئینجا ویستم بڕۆم. ڕووی تێ کردمەوە و وتی: «برا مەڕۆ، ئەم زستانە پێکەوە ڕایئەبوێرین، هەر تۆ بیخەرە مستی من و من ئەیخەمە مستی تۆ تا خوا دەروێك ئەکاتەوە».

١٥٣. کابرایەکی کورد هەبوو «نەزەر»ی ناو بوو، پیاوی «مەحمووپاشا» بوو. نەزەر لە ناکاو ون ئەبێ و زۆری پێ ناچێ پەیدا ئەبێتەوە. پاشا ئەپرسێ: ها نەزەر ئەوە لەکوێ بووی؟ ئەڵێ: «بەخوا پاشا، چووبووم

بۆ ماڵی شێخ، ڕۆحم وە قوربانی سەگی بەر قاپییەکەی وێ!» پاشاش ئەڵێ: ها ها، ئەوەندە نایەنێ. نەزەر کە ئەزانێ پاشا وا ئەڵێ، خێرا ئەڵێ: «کەواسە پاشا کوتامە دایکی». پاشاش ئەڵێ ماڵ کاول نە واش و نە واش!.

.١٥٤ کابرایەکی کورد ڕۆژێك لەو شارەزوورەوە تای لێ هاتبوو. ڕۆژەکە زۆر گەرم بوو، هەرچەند داوای ئاوی دەکرد، ئاوی ساردی دەست نەدەکەوت، ئاوی گەرمیان ئەدایە و هیچ هەوایەکی فێنکیشی نەئەدی. ئەوەندە هەبوو شاخی هەورامان لە دوورەوە دیار بوو، بۆ ئەو شوێنە دوو ڕۆژ ڕێگە ئەبوو. بەفرەکە بەسەر شاخەکەوە دیار بوو. کابرایەکی خزمی بۆ ئەحواڵپرسین هات بۆلای، لە بەردەمیا ڕاوەستا و بەر شاخەکەی لێگرت، ئەویش پێی وت: «کوڕە دەویت باوك، لای بەفرەکەم لێ مەوڕەوە، با هەوایەکی فێنکم بۆ بێت ئەوا پڕووکیام».

.١٥٥ ساڵێك ڕەمەزان بوو، جاف هاتبوونە شارەزوور، لالە سەرحەد کوێخای هۆزی «سەگگلە» کە تیرەیەکن لە ڕوغزایی. ئەوانیش لە نزیکی «دزەکەرە»وە خستبوویان. لالە سەرحەد ڕۆژێك خەڵکی ئاوایی هەموو کۆ ئەکاتەوە و ئەڵێ: «عەشرەت ئێمە کە موسوڵمانین توێ ئەم ڕەمەزانە مەلایەك ڕاگرین کە پێنج فەرزە نوێژمان بۆ بکات و قورئان و حەدیسیشمان بۆ بخوێنێ، کە نوێژی جەژنی بۆ کردین هەر ماڵە شتێکی ئەدەینێ و خوای لەگەڵ». هەموو وتیان: بە خودای فەرموودەکەت بەجێیە.

چوون لە دێی «میرەدێ» فەقێیەکیان هێنا کە هەتا نوێژی جەژنیان بۆ ئەکا لەلایان بمێنێتەوە، ئینجا دەوارێکی بچکۆلەیان بۆ هەڵدا و فەقێ دانیشت. کە نوێژی شێوان داهات دەستی کرد بە بانگدان وتی: «الله

اکبر، اللّٰه اکبر...». «عەلە»ی شوان ئەهاتەوە بۆ ئاوایی کە بانگی بیست ڕایکرد وتی: «کاورا دەنگ، کاورا دەنگ، دەویت باوك هەرا مەکە». یەکێك لە خەڵکی ئاوایی ڕایکرد وتی: «عەلە! عەلە! جوێن مەدە». عەلە وتی: «ئەی ئەم کاورایە ئەم گاڵەگاڵەی لە چییە؟». «مردگت مرێ ئەمە مەلایە بانگ یێژێ؛ بانگی محەمەدی، بۆچی جمێنی ئەدەیتێ؟» وتی: «نەمزانی کە بانگ یێژێ، بۆچی ئەمەسە بانگ؟» وتی: ها. وتی: «توخوا لالە گوڵە ئینجا ئەم بانگە قەیناکا بۆ پەزەکان؟» وتی: «نا، نا، نا». وتی: «دەسا با بێژێتێ».

لە پاشا شەوێ هەموو خێڵەکە بە ژن و پیاوەوە لێی کۆ بوونەوە و وتیان: «مەلا، بۆمان بخوێنە». هەتا دوو سێ سەعات بۆی خوێندن. لەوە بەدواوە یەکێکی تریان لە ئاش هاتەوە و وتی: «مەلا چیت خوێندگە بۆ منیشی بخوێنە». بۆ ئەویشی دوو سێ سەعات خوێند. بەری بەیان یەکێکی تر ـ کە شەو بە دیار ڕانەوە بوو ـ هاتەوە بۆیان گێڕایەوە کە ئیمشەو هەتا ڕۆژ مەلا بۆی خوێندگن. کابرا لەناو دەوارەکەی خۆیان دائەنیشێت و ڕووی کردە دەواری مەلا تەماشای کرد نووستووە. بانگی کرد و خەبەری کردەوە وتی: «برا من لە ماڵ نەوگم تۆ بۆ عەشرەتت خوێندگە بۆ منیش بخوێنە». مەلا وتی: باوکم کە ئێوارێ هات بۆ هەمووتان ئەخوێنم، ئیتر ئەمە چییە؟ وتی: «نابێ ئەوی خوێندگتە توێ بۆ منیشی بخوێنی».

مەلا لە دڵی خۆیا لێکی دایەوە وتی دیارە ئەمانە بە هیلاکم ئەدەن، با چارەسەرێکی خۆم بکەم. چوو کوولەکەیەکی برد لە دەوری خێڵ شارە زەردەواڵەیەك هەبوو، داری کرد بە شارەکەدا. دەمی کوولەکەکەی نا بە کونەکەیەوە هەتا پڕ بوو، دەرگاکەی قایم گرت و چووەوە بۆ شوێنی

خۆی. وەختـی نێوەڕۆ خەڵکـی هەمـوو کۆ بوونـەوە چوونـە لای مـەلا، مەلایش بـەرماڵەکەی لە سـەروچاوی خۆیـەوە پێچا و بە فەقیانەکەی دەستیشـی شـاردەوە، وتـی: «أعوذُ باللّهِ مِنَ الشّیطانِ الرَّجیم، الحمد لِلّهِ ربِّ العالَمین» و سەری کوولەکەی بەڕەڵا کرد، بە جارێ سێسەد چوارسەد زەردەواڵـە دەرپـەڕیـن و بـەناو کورگەلا بـڵاو بوونەوە. یەکێ بـە لووتیەوە، یەکێ بە دەستیەوە، یەکێ بە بناگوێوە پێوەدا. کوردە هەر یەکە بۆ شیوێ ڕایانکـرد، مـەلاش گـورج بوخچەکەی پێچایەوە و هەڵسـا بە لایەکی‌کەدا ڕایکرد و بۆی دەرچوو.

ئینجا کوردەکان لە دەمەدەمی عەسـرا هاتنەوە بۆ ناو دەوار و وتیان: «بچیـن چینـێ لەم مەلای کەرانباوگاوە بدەیـن»؛ کە هاتن مەلا نەمابوو. «قەیتوول»ـی کـوڕی لالـە سـەرحەد دیار نەبوو، لالـە پرسـی: «ئـەرێ عەشرەت قەیتوول دیار نییـە». یەکێـك وتی: «بەخوا لالـە چاوم لێ‌بوو چوار پێنج شەیتان ڕەجیم و ئەلحەمکەلیللا وە دەوریا گیز و هۆڕیان بوو، سەرەوژێر کردیان وە چەما، ئیتر نازانم چی وە سەر هات؟»».

١٥٦. باقـی ئاغـا هەبـوو ڕەئیسـی بەلەدیەی کەرکـووك بـوو. بەلەدیە چەنـد گوێدرێژێکـی هەبـوو بـۆ خۆڵکێشـانی ناو شـار. ئاغـا ئەچێتـە لای کـورتان دووریـك کورتانیـان بـۆ دروسـت بـکا. بـە کـورتان دوورەکە ئەڵێ: «کورە وا نەزانی بۆ یەکێکی‌تری دروسـت دەکەی؛ ئەبێ زۆر چـاك ئـاگات لـە خۆ بێ، ئەوە بزانی کە بۆ منی دروسـت ئەکەیت». کـورتان دووریـش ئەڵـێ: قـوربان! هیچ دڵت چەکەرە نەکا. بە سـەری تۆ ئەگـەر لەوانـە نەبوو کە بۆ خۆت دروسـت‌کرابێ، بیدەرەوە بە سـەرما». ئەویش ئەڵێ «عام فەریم!».

١٥٧. حەمەبەگی حاجی ڕەسووڵبەگ وتی: کەریمیفەتاح پیاوماقووڵی مەحمووپاشا گێڕایەوە وتی: ڕۆژێك لە خزمەت مەحمووپاشادا ڕێمان کەوتە دێیەك. پیاوێکی ڕیش‌سپی هات لە منی پرسی وتی: ئەگەر هەندێ تەڕە بێنم پاشا نایخوا؟ منیش لە دڵی خۆما خەیاڵم کرد بەڵکە خەیار و تەرۆزی وە یا کاڵەك و شووتی بێ، وتم بیهێنە. کابرا ڕۆیی، لە پاش تۆزێك هاتەوە سینییەکی هەڵگرتبوو. تەماشام کرد لەناو دوو تەشپیدا هەندێ بامیەی کاڵ قنچکەکانی لێکردۆتەوە و نەختێ خوێ وردیشی لە لایەوە داناوە، بردی لە بەردەم پاشا داینا. ئیتر منیش تەشپییەکانم هەڵگرت هێنامنە ئەملاوە. وتم: باوکم ئەمە چۆن ئەخورێ؟ کابرا هێشتا ئەیوت: «برا داینە بەڵکوو پاشا ئەیخوا، خۆ شتی خراو نییە، سەوزییە».

١٥٨. عەلیقادر، کابرایەکی شاتری بوو. حسێن‌بەگی حەسەن‌بەگ گێڕایەوە وتی: لە فەقێ‌جنە بووین، ئەحەی سەلیم وتی: سەگی ماڵی عەزەی قادر لەوانەیە کەس نەوێرێ لەبەر ئەو بەو دەوروبەرەدا بڕوا. عەلی قادریش هەڵیدایە وتی: «کوڕە یێژی چی؟ وە کەلام، سەگی ئەوان لەچاو سەگی ماڵی مارفا وەکوو شێخ وایە».

١٥٩. لە خێڵێکی کوردی گەلاڵی لەو کوردەوارییە ڕۆژێك دەنگوباسی جەژن بوو، زەلامێکیان نارد بۆ دێیەکی دراوسێیان بزانێ جەژنە یا جەژن نییە. کابرا چوو تەماشای کرد وا لە خانووێکدا خەڵکێکی زۆر کۆ بوونەتەوە، کابرایەکی سەر سپی لەلای سەرووبانەوە دانیشتووە، ئەو شتێك ئەڵێ و ئەوان بۆی ئەسێننەوە. تومەز ئەمە مەلایە و تەکبیری جەژن دائەدا. کابرای کوردە ئیتر هیچ دەنگ ناکا و ئەگەڕێتەوە دواوە،

لێی ئەپرسن: چی بوو؟ ئەڵێ: «کوڕە پێژم چی بوو، کوچکی تۆی لێ نەوارێ؟ لە خانگەکە پیاگەلێکی فرە دانیشتبوون، کاورایەکی سەرچەرمگیان تیاوو، هەر ئەو ئەگەفی و ئەوان ئەگەفین، ئەو ئەگەفی و ئەوان ئەگەفین؛ بەڵام گووی نەنکی ئەخوا! گەفەی ئەو گەفەی ئەوان ناوڕێ ئێستە خواردگیانە».

.١٦٠ جوولەکەیەکی قەرەداغی گوێدرێژێکی ئەدزرێ. لە دوای بەینێك لەلای کابرایەکی «جافەرانی» بە سەری ئەگرێتەوە، هەندێ پارەی بە کاڵە دڕانە ئەداتێ و گوێدرێژەکەی لێ ئەسەنێتەوە. ڕۆژی جومعە ئەبێ، پاش عەسر ئەڵێ ئێمشەو شەممەیە پێویستە بچمە قەرەداغ، کەرەکە ڕائەکێشێ و ئەکەوێتە ڕێگا. کابرای جافەرانی هاوڕێیەکی لەگەڵ خۆی ئەهێنێ و بە دوایا دێت و خۆی ڕووت ئەکاتەوە هەموو لەشی خۆی لە قوڕە ڕەشەوە ئەدا. «خواجا»ش هەوساری کەرەکەی بە دەستەوەیە ڕایئەکێشێ، زۆر ئەترسێ ناوێرێ ئاوڕ بداتەوە دواوە. تاریك داهاتووە، کابرا بە هێواشی هەوساری کەرەکە دائەماڵێ و ئەیکا بە سەری خۆیا و گوێدرێژ ئەدا بە هاوڕێ ئەڵێ تۆ بڕۆ. خۆی هەندێك بە هەوسارەوە ئەڕوا دوایی ئەڵێ وا چاکە کە خۆمی لێ ئاشکرا بکەم؛ پێ لە ئەرز قایم ئەکا و ناڕوا. خواجا دوو سێ جار ئەڵێ هەچە وەرە، کەڵکی نابێ. کە ئاوڕ ئەداتەوە چاوی پێ ئەکەوێ و کابراش لێی ئەمڕێنێ. جووە هەر دەستە ڕەشمە بەڕەڵا ئەکا و قوشنە قەوت بە تاو خۆی ئەهاوێژێتە دێ قەرەداغەوە. شەو و ڕۆژێك بێ زمان ئەکەوێ، کە دێتەوە هۆش خۆی، لێی ئەپرسن چی بوو؟ ئەڵێ: «خزمینە! کەرەکەم بە سەر گرتەوە و هێنامەوە. شەو لە نیوەی ڕێدا لەناو دار و دەوەنەکانا لێم بوو بە

ڕمووزن و کەوتە شاخەکان».

ئینجا وتیان: لە پاش چەند ڕۆژێك خەبەریان دایە کە کەرەکەت لە فلانە دێیە. جووە ئەیگوت: «عەزیزم! بە حەزرەتی مووسا من خۆم بە چاوی خۆم دیم کە کەرەکە بووبوو بە ڕمووزن و دایە کێو، چۆن ئێستا باوەڕ ئەکەم مابێ؟!.

١٦١. کابرایەکی کورد هەبوو چیلکەفرۆش بوو، هەموو ڕۆژێ ئەچوو بە کۆڵ چیلکەی ئەهێنا و ئەیفرۆشت؛ بەوە ئەژیا. ئەم کابرایە خۆی کەڕ بوو، ژنەکەی کەڕ بوو، کوڕێکی هەبوو کەڕ بوو، کچێکیشی هەبوو ئەویش هەر کەڕ بوو. لە ماڵی پیرێژنێکا بوون ناوی «پوورە فاتە» بوو؛ ئەویش هەر کەڕ بوو.

ڕۆژێـك کابـرا بـە کۆڵە دارەوە هاتـەوە. موختارەکە بانگی کرد وەرە دوو قرانت بدەمێ خەرجی کە. کابرا بە کۆڵە چیلکەوە ڕایکردە ماڵەوە، ژنەکەی پرسی بۆچی نەتفرۆشت؟ وتی: «کچێ! من پیاوێکی هەژارم، خەڵکی خێرم پێ ئەکەن، کەچی موختار داوای دوو قران پیتاکم لێ ئەکا». ژنەکەی ڕووی کردە کچەکە وتی: «ڕۆڵە، سەیری باوکت کە هاتووە ئەڵێ گۆشتی مەڕتان بۆ بکڕم یان گۆشتی گا؟ منیش ئەڵێم تۆ هەرچێکیان بکڕی هەر باشە».

کچە ڕایکردە لای براکەی وتی: «کاکە! دایکم پرسم پێ ئەکا ئەڵێ کوڕی وەیسە داوای تۆی کردووە، شووی پێ ئەکەی یان نە؟ منیش وتم: دایە من وەکوو کچی خەڵکی نیم باوکم و تۆ و کاکم بە هەرکەسێکم بدەن ڕازیم».

کوڕەش بە توڕەییەوە چوو بۆلای پوورە فاتە و وتی: «وەڵڵا هەرکەس پێم بڵێ پوورە فاتەی گاوە، ئەیکوژم».

پوورە فاتەش وتی: «وەڵڵا باوکم ژووری خۆمە و لە دوو قڕان کەمتری نادەم».

١٦٢. حەمەبەگی قادربەگی جاف عەمری خوای کردبوو. پێ خۆیەك قوڕیان گرتبۆوە، زەلامێك بە خاکەنازەوە ڕاوەستابوو هەرکەس بهاتایە خاکەنازێ قوڕی ئەدا بە سەریا و هەر ئاغاڕۆشی ئەکرد.

کابرایەکی مسگەری سنەیی لە ئاواییەکەدا بوو. بە لای زەلامەکەدا ڕابورد و ئەویش گورج خاکەنازێ قوڕی دا بە سەر مسگەرا وتی: «دەی مسگەر تۆش ئاغەڕۆ بکە».

ئەویش هیچ خۆی تێك نەدا، دەستی کرد بە شیوەن و مەنجەڵی گەورە گەورەی چێشت لێ نرابوو، مسگەر چوو پشکۆیەك ئاگری زلی هێنا، کابرای خزمەتکار کۆڵەنجەی لە بەرا نەبوو، یەخەی کرابووەوە، تیلمە بەنێکیشی لە پشتا بوو. مسگەر پشکۆکەی هاویشتە باخەڵیەوە هەردوو دەستی گرت و وتی: «با پێکەوە شیوەن بکەین».

زەلامەکە، تینی پێ گەیشت وتی: «کوڕە بەرم دە سووتام». مسگەر وتی: «هەقتە بسووتێی، ئاغەت ئاغەی چاك بوو». وتی: «کوڕە مسگەر بەرم دە، سووتام». وتی: «هەر تۆش نەسووتاوی ئێمەش سووتاین». وتی: «مسگەر مردگت مرێ بەرم دە گڕم تێبەر بوو». وتی: «ئافەرین بۆ تۆ بەخوا خزمەتکارێکی دڵسۆز و بە وەفای بۆ ئاغاکەت». وتی: «مسگەر کەرانباوگاو بەرم دە بە ئاگری ڕاستەقینە سووتیام». ئیتر مسگەر دەستی بەڕەڵا کرد، بەڵام کابرای قوڕ بەسەر لاقەبرغەی بە تەواوی سووتابوو.

١٦٣. مەلایەکی کەم فیکر لە دێیەك بوو هەر جار کە ئەچووە سەر مینبەر خوتبەی جومعە بخوێنێ، خوتبەکەی ئەکرد بە لای

مێزەرەکەیا و هەموو جار دەستی لێ ئەدا نەوەك لە فیکری چووبێ. ڕۆژێك لەو وەختەدا کە چووە سەر مینبەرەکە کوێخایەکی قوماربازیان هەبوو، لە دواوە خوتبەکەی لێ دزی. مەلاکە چووە سەر مینبەر دەستی برد بۆ «خوتبە» سەیری کرد نەماوە، بە جارێ پەکی کەوت و زۆر تەریق بۆوە.

ئەو جومعەیە هیچ، جومعەی دواییش کوێخا عەینی کەتنی پێدایەوە. ئینجا بۆ جومعەیەکیتر هێنای دوو خوتبەی نووسییەوە، یەکێکی کرد بە لاسەریا، یەکێکیشی نایە باخەڵی. کە سەرکەوت بۆ سەر مینبەر کوێخا دیسان لە دواوە خوتبەکەی لێ دزی. مەلا، کە چووە سەر مینبەر دەستی برد خوتبە نەماوە، هیچ خۆی تێك نەدا، هێنەکەی باخەڵی دەرهێنا و دەستی کرد بە خوێندنی. وەکوو یەکێ چۆن دەستی گرتمۆڵکە ئەکا و ڕوو ئەکاتە یەکێکیتر ئیشارەی بۆ ئەکا - یانێ کوتامە خۆت، یا کوتامە دایکت - ئەمیش هەر ئەیوت: «الحمد للّٰه حَقَّ حَمدِهِ... هتد» و بە دەستیش ئاوقەی کوێخای ئەکرد؛ یانێ کوتامە دایکت، ئاگات لێیە چۆن ترم برپیت!.

**١٦٤.** شێخ بابەعەلی تەکیەیی جارێك زستان ئەبێ ئەچێتەوە بۆ «تەکیە» و ئێوارە لە مزگەوت لە گوێئاگردانەکە دائەنیشێ و خەڵکی ئاواییش هەموو لەوێن. سەیر ئەکا کابرایەکی نەناسراویش لەوێیە. بابە عەلی بە خەڵکەکە ئەڵێ: ئێستە سەیرێکتان بۆ ئەکەم.

هەروا لە بەرخۆیەوە بە دەنگی بەرز ئەڵێ: کابرایەکی چەرچی سولەیمانی هەیە ناوی سەلامەتە، هەندێ پارەم لایەتی و نامداتەوە؛ شەرت بێ ئەگەر ئێستە لێرە بوایە ڕووتم ئەکردەوە. ئەمە ئەڵێ و سەر بەرز دەکاتەوە و ڕوو ئەکاتە کابرای غەریب و تۆزێ سەیری ئەکا و ئەڵێ: «کابرا ئەترسم تۆ سەلامەت بی؟» ئەویش ئەڵێ: «نەوەڵڵا قوربان! من

هەو نیم». بابە عەلی ئەڵێ: «وەڵڵا کابرا تۆ شێوەت زۆر لە سەلامەت ئەکا. من لام وایە هەوی». ئەڵێ: وەڵڵا قوربان، بەو مەرقەدی ئیمام هەمزەیە! من سەلامەت نیم». بابە عەلی ئەڵێ: «سا یاڕەببی سەلامەت نەبی! بەڵام زۆر ئەترسم سەلامەت بیت». کابرا ئەڵێ: «قوربان بەو قورعانەی لێت خوێندووە من سەلامەت نیم». بابە عەلی ئەڵێ: «دەی یاڕەببی سەلامەت نەبی» و ئیتر وازی لێ دێنێ.

**١٦٥.** لە گەڕەکی کانیسکان ئافرەتێك ئەبێ «خانمخاس»ـی ناو ئەبێ؛ بووکێکیشی ئەبێ [بە ناوی] «مەیاس». بووکێ نەوسن و خەسووی چرووك، هەموو چێشتێکی لە ژێر کلیل و قوفڵدا ئەبێ.

ڕۆژێ دراوسێیەکیان لەسەر تەنوورەکەی ئەوان نان ئەکا. «مەیاس» ئەچێ لەواشەیەکی پێ ئەکا و بە گەرمی ئەیهێنێ بیکا بە چنگاڵ. تێفکری خەسووی کوپڵەی ڕۆنی کردووە بە سنگی هەیوانەکەدا. هەیوانیش تازە سواخ دراوە، ئەگەر بەسەر سواخەکەدا بڕوا، شوێن پێی دیار ئەبێ. کتوپڕ فێڵێك هات بە خەیاڵیا، تری خەسووی پێ بری.

گوێدرێژێ لە حەوشە بەسترابووەوە سواری گوێدرێژ بوو، چووە بەر سنگی کوپڵە ڕۆن، چنگێ ڕۆنی دەرهێنا، نایە سەر لەواشەکەی و گەڕایەوە. چنگاڵی خۆی خوارد، کەری نەبەستەوە و خۆی چووە سەر تەنوور دەستی کرد بە نان کردنەوە. خەسووی هاتەوە، تێفکری کەر چووەتە هەیوان بەر کوپڵەی ڕۆن. کە کوپڵەی داگرت ڕوانی لە چنگی ئافرەت لێی دەرهاتووە؛ ئای هەرەس وەماڵم! و وتی:

**شوێن سمی خەرە و چنگی مەیاسێ**

**من لەم کەتنە سا، سـەرم ئەماسێ**

١٦٦. مەلایەك گێڕایەوە وتی: ڕۆژێك زستان بوو. لە ژووری مزگەوت لەبەر ئاگر بە تەنها دانیشتبووم تەماشای کتێبم ئەکرد. کاتێك ڕوانیم زەلامێکی چوارپەل قەوی، ملهوڕ، باوەشێ پرچی بە سەرەوە بوو، هاتە ژوورەوە. جووتێ کەوشی شڕی لە پێدا بوو، کەوشەکانی داکەند هەر پێیەکی پێخوێك قوڕی پێوە بوو؛ یەك ڕێ چووە سەر بەرماڵەکان. منیش بانگم کرد: دەروێش خۆ تۆ لای خۆت دەروێشی! چیت کرد؟ هەموو بەڕە و بەرماڵی مزگەوتەکەت لە نوێژ برد!. لەسەر ئەمە ئەوەندەم زانی دەروێش لێم ڕاپەڕی وتی: «مەلا! ئاقڵ بە بۆ خۆت. جارێ من دەروێش نیم، خەلیفەم و تۆش مەلا نیت؛ ئەگەر مەلا بوویتایە ئەتزانی. چونکە شێخ ـ بە قوربانی بم! ـ فەرموویە بە شەرع قوڕی زستان عافوە».

ئینجا مەلا وتی: بۆم دەرکەوت کە خەلیفە بۆ شەڕکردن هاتووە؛ منیش توانا و هێزی قۆڵ و بازووی ئەوم نییە و کەسیش لە مزگەوتەکەدا نییە کە لەسەرم بکاتەوە. نەموێرا دەنگ بکەم. خەلیفە بە پێی قوڕاوییەوە بەرە و بەرماڵی هەموو لە نوێژ برد و نوێژێکیشی کرد، کە سەلامی دایەوە هاتە بەر ئاگرەکە بەرانبەرم دانیشت. وتم: خەلیفە، ئەگەر دوو سێ قسەت لێ بپرسم جوابم ئەدەیتەوە؟ وتی: «بەڵێ بپرسە؛ ڕەنگە وا بزانی هیچ نازانم، ئێمە کامەی هیچ نەزانین، لە تۆ مەلاترین».

پرسیم: ئیمان چییە و دین چییە؟ خەلیفە جوابی دامەوە، بەڵام بە تووڕەییەوە وتی: «ئیمان خوایە و دین پیغەمبەرە!». پرسیم: پیغەمبەر ناوی خۆی و باوکی چییە؟ خەلیفە دیسان چاوی لێ دەرپەڕاندم، وتی: «پیغەمبەر ناوی محەمەدە، باوکیشی ـ بە قوربانی بم! ـ ناوی شێخ ئەولایە».

١٦٧. حەمەبەگی حاجی ڕەسوول بەگ گێڕایەوە وتی: لە گەڕەکی گۆیـژە بەقاڵێك هەبوو ناوی «حەمەی پوورە سافیە» بوو.

ڕۆژێـك هاتـە لام وتـی: فڵانـی ئەمـڕۆ بارێکـم «کاهـوو» کـڕیبـوو، لە بەر دەرکانەکەما ئاوم پیا کردوو. سێ زەلامی شارەزووری هاتن، یەکێکیان وتی: «عەشـرەت سـەیرکەن ماشەڵڵا خەیار داگیە بە یەکا». دووهەمیان وتی: «کـوره ئـەوە تۆ یێژێ چی؟ ئەوە خەیار نییـە یارکۆکییە، یارکۆکی». ئەوی سێهەمیان وتـی: «بەخـوا هەردووکتـان بێ‌ئەقڵن! چـاوتان بـە سـەلکی کەوەرەکە کەوتگە، یەکێکیان یێژێ خەیار و یەکێکیشیان یێژێ یارکۆکی».

**١٦٨.** «ڕەزابـەگ» ڕۆژێـك لـە دیواخـان لەگـەڵ هەنـدێ کەسا دانیشـتبوون، خەبـەریان هێنـا وتیـان: «ئەحـەی ناسـر» خـوا کوڕێکـی داوەتـێ، بـەڵام نـۆ مانگـی تـەواو نەکـردووە لـە دایـك بـووە. «ڕەزابـەگ» وتـی: بەخـوا منالێ کە بە حەو مانگی ببێ، ئەوە نابەکامی پێ ئەڵێن و هیچی لێ پەیدا نابێ.

پیاوێك لەولاوە وتی: قوربان! وا مەفەرموو. من بیستوومە ئەو جۆرە منالانـە هەمـوو پاڵەوانـن و پیـاوی گـەورە ئەبـن؛ تەنانـت «ناپلیـۆن» و «محمدفاتح» ئەڵێن بە حەو مانگی هاتوونەتە دونیاوە. ئیتر «ڕەزابەگ» گورج وتی: «سا بەخوا! بە سەری ئەم مەجلسە و بە گۆڕی باوکم! بیستوومە کە خۆم و باوکم هەردووکمان بە حەوت مانگی لە دایك بووین».

**١٦٩.** حەمەبەگی حاجی ڕەسوول‌بەگ وتی: «حەمەی پوورە سافیە» بۆی گێڕامـەوە وتـی: شـێخان لـە سولەیمانی زۆر لـە بـرەودا بـوون؛ دەسـت و پێوەنـدیان ئیتر ئیشـیان هەر ئەوە بوو کـە لە خەڵکیان ئەدا و تالانیان ئەکردن. ڕۆژێك بارێ کاڵەکم لە ژنێکی «شـەمە»یی بە شـەش تارانـی کـڕی؛ پارەم دایە و بارە کاڵەکم بـردە دووکان. وەختێ هەڵم پچـڕی تەنها دەرگا بارەکەی سێ چوار کاڵەکی تیـا بوو، ئەوی‌تری هەموو

زرکی خەڵووزەلێدراو و کاڵەکە شکاو بوو؛ منیش دەستم لێ نەدا.

وەختی چێشتەنگاو ژنەکە هات و داوای جواڵەکەی کردەوە. بە زمانێکی شیرین بە ژنەکەم وت: دایکم، خۆ تۆ کاڵەکت بە من فرۆشتووە ئەمە چییە؟ هیچی بە کەڵك نایەت، بێنە شەش تارانییەکەم بدەرەوە کاڵەکی خۆت چی لێ ئەکەی بیکە. پیرێژن وتی: ماڵێکە و فرۆشتوومە و پارەم وەرگرتووە و تۆیش کڕیوتە. خوا بکا پوولێکت بۆ نەکا! لەسەر ئەم قڕە قڕەمان دراوسێی دووکانەکان کۆ بوونەوە کەوتنە بەینمان؛ وتیان: فلانی ئەمە ئافرەتە با تارانییەك بداتەوە، تۆیش کاڵەکەکە هەڵڕێژە خوا بۆت ئەفرۆشێ. من بەم قسەیە ڕازی بووم، بەلام پیرێژن هەڵیتیزان وتی: قوڕ بە سەرت، من لەوانە نیم کەس بتوانێ تەشقەڵەم پێ بکا؛ بزانە ئێستا چلۆن جەواڵی خۆم بە شەق ئەستێنمەوە و لێی دا ڕۆیشت.

زۆری پێ نەچوو تەماشام کرد هاتەوە، هەتیوێکی لەگەڵ بوو. سەڵتەیەکی سورمەی کۆنی لە بەردا بوو. نووشتەیەکی لە قۆڵی ڕاستی بەستبوو، فیشەکلغێکی شڕی لە پشتا بوو، لیسێکی بە دەستەوە بوو. پیرێژن ڕووی کردە هەتیوەکە وتی: ئەم بەقاڵەیە. ئیتر هەتیو بەبێ هیل و گفت لیسی ڕاست کردەوە و وتی: «بە سەری شێخ سەعید، قەحبەباب هەر ئێستە جەواڵی ئەم ژنە نەدەیتەوە بەم لیسە هەموو لەشت ئەشکێنم». منیش کە وام زانی، لە دڵی خۆما وتم: وا چاکە منیش فێڵێ بدۆزمەوە.

هەر هەڵسام و ڕام کردە ژووری دووکانەکە کوتەکێکی زلم هەبوو، دەستم دایە و هاتم وتم: «بۆچی سەگباب من بێکەسم؟ بە سەری سەید ئەحمەدی بابەڕەسووڵ لەم بەر دووکانەما نەڕۆی بارت کوتەك ئەکەم!». لەگەڵ ئەوەش کە بە عومری خۆم ماڵی هیچ شێخێك نەچوو بووم و هیچ ئاشنایەتییەکم نەبوو.

هەتیوەکە بەم حاڵەی زانی وتی: ئاخر بزانم جواڵەکەت بۆچی لێ گل داوەتەوە؟ منیش بە تووڕەیی وتم: من کاڵەکم لەم پیرێژنە قۆڕە کڕیوە. کابرا ئەمجا زۆر بە نەرمی وتی: «برا تۆ عاجز مەبە با من تەماشای ئەم کاڵەکە بکەم». هات و چاوی بە کاڵەك کەوت، ڕووی کردە پیرێژنەکە وتی: «میمکە بەخوا ئەم فەقیرە هەقیەتی. ئەمە هیچ کاڵەك نییە». ئەمجا وتی: «برا ڕێ‌کەون شتێکت پارە بداتەوە و تۆیش جواڵەکە بدەرەوە».

هەرچەن کابرا زۆر بە شیرینی قسەم لەگەڵ ئەکا، من بە تایبەتی هەر خۆم گورج ئەکەمەوە قۆڵم هەڵئەماڵم و بە تووڕەییەوە جوابی ئەدەمەوە؛ وتم: قەی ناکا نیوەی پارەکەم ـ کە سێ قرانە ـ بمداتەوە منیش جەواڵەکەی ئەدەمەوە. هەتیوەکە وتی: ناوەڵڵا بۆ خاتری من دوو قرانی لێ وەربگرە و جەواڵی بدەرەوە. وتم: ئەلحوکمولیللا با خاتری تۆ بێ.

ئیتر هەرچەند پیرێژن هاواری کرد: «کورە خۆی بە تارانییەك قوراوی ئەخواردەوە». هیچ کەڵکی نەبوو، وتم: «بە سەری سەید ئەگەر لەبەر خاتری ئەم دەستە برایە نەبوایە بە سێ تارانیش ڕازی نەئەبووم». ئاخری دوو تارانیم لێ وەرگرتەوە و گەلێکیش پاڕایەوە، ئەمجا منیش جەواڵەکەم دایەوە.

.١٧٠ ساڵێك لالەسەرحەدی ڕوغزایی ماڵیان لە «پێواز» ئەبێ، تەماشا ئەکا لە دوورەوە کاروانێك ڕەت ئەبێ و کوڕگەلیش هەرکە لە ماڵی خۆی دانیشتووە و هیچی ناچێ بۆ ڕاووڕووت. بانگ ئەکا: «ئای هەتیوەل! خۆ من تەوبەم کردگە ئێوە بۆ وا دانیشتگن؟» تەماشا کەن ئەو کاروانە، بەخوا ڕەنگوێ کووتاڵ و وشکە کروشتی خاسیان پێ وێ». کوڕگەل لەگەڵ ئەمەیان بیست، بە جارێ تاویان

دایە سەر کاروان. لالە سەرحەدیش تەزبێحەکەی بە دەستەوە بوو هەر زیکری ئەکرد و چاویشی لە کاروانەکە بوو.

کوڕگەل گەیشتنە کاروان، هەندێ قسەیان کرد؛ ئیتر بەبێ ئەوەی هیچ بێنن ڕاست گەڕانەوە. لالە سەرحەد هات بە پیریانەوە پرسی: ئەوە چی بوو، بۆچی هەروا گەڕانەوە؟ وتیان: بەخوا لالە چووین ڕووتیان بکەینەوە، کەچی سوێندیان خوارد وتیان: خەڵکی «قەرەچێوار»ین و پیاوی شێخین. ئێمەش لە ترسی ئەوە نەوەك شێخ حەسەن تووشی مۆجیزەیەکمان بکات ئیتر وازمان لێ هێنان. لالە وتی: «بڕۆن، بڕۆن هەی عەمرتان نەمێنێ! هەتیوێ ئەوەندە بێفەڕ وێ بپرسێ ئەرێ زوارەکە لە کوێوە دێن؟ بۆ کوێ ئەچن و پیاوی کێن؟ هەڵوت ئەوانیش یێژن پیاوی شێخین - ڕۆحم وەفیای وێ!- جارێکیکە وەم جۆرە وە حیزی بچن و بێنەوە، وە سەری ئەو شێخی قەرەچێوارە لێتان قووێل ناکەم و هەرچی خراوە پێتان یێژم».

١٧١. مەلایەك لە خێڵێکا وەعزی ئەدا ئەیوت: «هەرکەس شەوی جومعە لەگەڵ ژنی خۆیا ئیشی شەرعی بکات، وەکوو حەو کافری کوشتبێ وایە». ژن و مێردێك لە وەعزەکە بوون، کە هاتنەوەماڵەوە ژنەکە وتی: پیاوەکە ئیمشەو جومعەیە با حەو کافر بکوژین». پیاوە وتی: باشە. تۆزێکی‌تری پێ‌چوو، دیسان ژنەکە وتی: «پیاوەکە جومعەیە نەوەك لە دەسمان دەرچێ با حەو کافری‌تر بکوژین، غەزایە!». پیاوە وتی: باشە. حەو کافری‌تریان کوشت. بەو جۆرە ئەو شەوە تا بەیانی نزیکەی سەد کافریان کوشت.

کەوتە سبەی‌شەوێ ژنە دیسان وتی: «ئیمشەویش هەر جومعەیە

با دەس کەین بە کافر کوشتن». پیاوەکە وتی: ئافرەت! دوێشەو جومعە بوو. ژنە وتی: تۆ نایزانی بۆ غەزاکردن هەموو شەوێ جومعەیە. بە کورتی ژنەکە تەنگی بە کابرا هەڵچنی و شەو هەر جومعە بوو، ڕۆژ هەر جومعە بوو، هەموو ساڵ بوو بە جومعە و شوێنی غەزاکردن.

کابرا بێهێز بوو، وای لێهات لووتت بگرتایە گیانی دەرئەچوو. ناچار ماڵەکەی بەجێهێشت و چوو لە مزگەوت نووست. ژنەکە دوو سێ پیاوی نارد بە شوێنیا، پیاوەکان هاتن و وتیان: ئاخر تۆ لە ماڵی خۆت بۆچی تۆراوی؟ کابراش وتی: «تا جومعە لەو ماڵەدا بێ، جارێکیکە من [سەر] بەو ماڵەدا ناکەمەوە، یان من، یان جومعە».

**١٧٢.** دوو کابرای بەنگکێش لە گردەکەی «زێرینۆك» شەو بوو، دانیشتبوون بەنگیان ئەکێشا. لە دوورەوە ئوتومبیلێك دیاری دا. ئوتومبیلەکە شەو بوو، بە خەتێکی ڕاست درێژ بووبووەوە، یەکێکیان بەوی‌تریانی وت: «هەستە با بچین بەو پەیژەیەدا سەرکەوین بچین بۆ ئاسمان چەند ئەستێرەیەك بێنین هەڵماتێنی پێ بکەین». ئەمەی وت و هەڵسایە سەر پێ. ئەوی‌تریان قۆڵی گرت و وتی: «کەرە، دانیشە بۆ کوێ بچین؛ ئەترسم لە ڕێگە، پەیژەکە بکوژێتەوە ئەکەوینە خوارەوە ملمان ئەشکێ. ئەوا تیشکی ئەستێرەکە دیارە من دەست ئەبەم تیشکەکە ئەگرم پیا سەرئەکەوم، ئەچم سێ چوار ئەستێرە دێنم هەڵماتێنەکەی پێ ئەکەین؛ ئیتر بۆ کوێ بچین؟»

**١٧٣.** مەلا «محی‌الدّین»ـی خواجەفەنی گێڕایەوە وتی: کابرایەك هەبوو «سفوك»ـی ناو بوو، لەو ناو جافەدا ویستی ژن بهێنێ؛ هاتە لام و پرسی پێ کردم بۆ ئەوە بچم مارەی بکەم. وتی: منیش پێم

وت: بچۆ باوکی کچە و خۆت و دوو شاهێد حازر کە ئەوا منیش دێم. ئەڵێ: کە چووم و نزیکی دەوارەکە بوومەوە، کوڕە هات بە پێشوازمەوە وتی: مامۆستا هەموو حازرین فەرموو. وتی: لە ڕێگەدا پێم وت: ڕۆڵە، من هەر شتێك ئەڵێم تۆیش وا بڵێ. وتی: کە چووینە ژوورەوە سەیرم کرد شاهێدەکان نین، وتم: ڕۆڵە، هەستە بچۆ دوو شاهێدیش بێنە. ئەویش وتی: «ڕۆڵە هەستە بچۆ دوو شاهێد بێنە». ئەڵێ وتم: کوڕم مەبەستم ئەوەیە بچی دوو زەلام بێنی. ئەویش وتی: «کوڕم مەبەستم ئەوەیە بچی دوو زەلام بێنی». وتی: سەیر ئەکەم من هەر شتێك ئەڵێم ئەویش ئەیڵێتەوە لە پاشا تووڕە بووم وتم: کەرانباوگاو! بچۆ دوو پیاوی سەگباب بێنە تا ژنەکەت لێ مارە کەم. ئەویش وتی: «کەرانباوگاو! بچۆ دوو پیاوی سەگباب بێنە تا ژنەکەت لێ مارە کەم». وتی: ئیمان لە سەرما نەما، هەستام شەپەزللەیەکم کێشا بە بناگوێیدا. وەڵڵا ئەویش هەستا جوان و پوخت شەپەزللەیەکی کێشا بە بنا گوێی منا.

ئیتر ئیش تێك چوو دەستم دایە یەخەی و دەستم کرد بە لێدانی و وتم: سەگی سەگباب بۆچ لێم ئەدەی؟ وتی: سەیرم کرد تا من زللەیەکم لەم ئەدا ئەو دوو زللەی بە بناگوێی منا ئەکێشا و بە تەواوی شەل و کوتی کردم و پەکی خستم. دەستم لە یەخەی کردەوە و خەڵکی هاتن بە سەرمانا، بەڵام من ناوێرم هیچی‌تر بڵێم. بە دەست دەستم بۆ هەڵئەتەکان وتم برۆ.

کوڕە ئینجا ڕۆیشت و گەیشتە بەر قاپی و وتی: «مامۆستا مارەی هات؟» وتم: هات سەگی سەگباب! برۆ. وتی: کوڕە لێی دا ڕۆیشت و ئەو شەوە چووە لای ژنە. منیش لەبەر هیلاکی قسەم پێ نەئەکرا. بەیانی خەڵکەکە کۆ بوونەوە وتیان: ئەرێ ئەم زرمەزلێیەتان لە چی بوو؟ منیش

حاڵەکەم بۆ گێڕانەوە. کە من هەوەڵجار کفرم کرد وتم من هەر شتێك ئەڵێم تۆیش وا بڵێ، چووم سەیرم کرد شاهید نییە، وتم بچۆ شاهید بێنە.

ئیتر هەر شتێکم ئەوت لەلایەن شاهیدەوە ئەویش وەکوو بەیتی بلە ئەیوتەوە. وتی: سەر لە نوێ خەڵکەکە بەیانی چوون کوڕەکە و ژنەکە و دوو شاهیدیان هێنا، ئەو وەختە ئیتر مارەمان کرد.

٠١٧٤ مەلا ئەحمەدی حاجی مەلا ڕەسوول گێڕایەوە وتی: لە ئاوایی «کونەکۆتر» بووم، سەیرم کرد کابرایەکی کوردی ڕەشماڵ لە دەرەوە هات. وتی: مەلا نەخۆشێکمان هەیە نوشتەی بۆ بکە. وتی: منیش «مُخَمَّس»ـەکەی ئیمامی غەزالیم بۆ نووسی. کابرا لە پشتەوە چاوی لێ بوو کە موخەمەسەکە ئەنووسم؛ نوشتەم بۆ پێچایەوە و دامە دەستی و ڕۆیشت. تا ئەو ئەچێتەوە کابرای نەخۆش ئەمرێ. ئینجا کابرا ئەڵێ: «باوکم مەلا هەر لەوێ دارە تەرمی بۆ هەڵبەست، ئێوە ئێستە شین و شەپۆڕی چیتانە؟».

٠١٧٥ کابرایەکی کورد لەو جافەتییە تەماشای کرد هەرجار مەلا ئەچووە خێڵەکەیانەوە هەموویان ئەچوون بە پێشوازیەوە و ئیحترامێکی زۆری ئەگیرا. کوڕێکی هەبوو وتی: چاك وایە منیش کوڕەکەم بکەم وە مەلا. لە کوێستان بوون و دەمەدەمێ گەڕانەوەیان بوو، هەڵسا چووە دێیەك، کوڕەکەی برد و چووە لای مەلای دێیەکە وتی: «مەلا، ئەم کوڕەم بۆ بکە وە مەلا» و لێی دا ڕۆیشت. زۆری پێ نەچوو گەڕایەوە بۆلای مەلا و وتی: مەلا کوڕەکەت بۆ کردم وە مەلا؟ مەلاش وتی: باوکم کوڕ بەم دەمودەستە چۆن ئەبێ بە مەلا؟ وتی: «مەلا! من ئەمانە نازانم، گام وە بارەوە، مەشکەم وە دارەوە، دۆینەم لە چاڵەوە،

یاڵڵا کوڕم بۆ بکە وە مەلا درەنگە».

١٧٦. کابرایەکی کورد لە شارەزوور کوڕێکی پوورزای لەرز و تای بوو، لە کۆڵی نەئەکەوت. پێیان وت: بیبەرە سەر «سەی‌ساق» و مەڕێکیش لەگەڵیا بەرە بۆی سەر ببڕە چاك ئەبێتەوە. وتی: ئەیبەم، بەڵام مەڕم بۆ سەر نابڕێ. مەڕێك زۆرە، ئەچم پێی ئێژم: ئەگەر وە کەمتر ئەیکا خاسە، ئەگەرنا ئەیوەم بۆ «باڵانتەران». هەڵسا کوڕەی هەڵگرت و گیسکێکیشی لەگەڵ خۆی برد و چوونە سەر گۆڕی «سەی‌ساق». ڕووی کردە گۆڕەکە و وتی: «سەی‌ساق! تۆ وە گیسکێ خاسی ئەکەیتەوە بیکەوە، ئەگەرنا باڵانتەران وە مریشکێك کڕە ئەکا؛ ئەیوەم بۆ ئەو». («سەی‌ساق» و «باڵانتەران» دوو شەخسن لە شارەزوور).

١٧٧. کابرایەکی کورد وازی لە گەرمیان و کوێستانکردن هێنا و وتی: بۆ خۆم جووت و گا ئەکەم. یەك دوو ساڵ کردی، شتێکی وای دەست نەکەوت؛ ساڵێکیان وتی: ئیمساڵ لەگەڵ خوادا ئەبم بە شەریك. بەو نیازەوە دەستی دایە، وەردی بڕی و تووی چاند. گەنم دەستی هێنا بە خۆیا و زۆر باشی هێنا بوو، کابرا هەموو جار لەگەڵ هاوماڵەکانیا ئەچوون بۆ سەیری دەغڵ و هاوماڵ پێیان ئەوت: ماشەڵڵا دەغڵەکەت خاسی هاوردگە. ئەویش ئەیوت: بۆچی گەمەیە من لەگەڵ خوادا بووم بە شەریك.

گەنم هاتە وەختی دروێنە؛ دروێنەی کرد و خەرمان سوور بوو. هاتنە سەر بەشکردن؛ ڕووی کردە خوا و وتی: «ئەی تۆ هەقی سەپانی و وەرزێری و بنەتۆ نادەی؟ ئەبێ بیدەی!». هێنای هۆڕێکی بۆ خۆی جیا کردەوە و هۆڕێك بۆ سەپان و بنەتۆ و هۆڕێکیش لەولاوە بۆ خوا. هی

خۆی و سەپان و بنەتۆوی گواستەوە بۆ ماڵەوە. هی خواش لەو دەشتە مایەوە، شەوی بەسەرا هات. وتی: بەخوا وا چاکە تا خوا نەهاتووە بەشەکەی خۆی بگوێزێتەوە بچم لێی بدزم.

هەستا چوو بەبێ دەنگ، گایەکی دایە پێش خۆی و چوو بۆ گەنم. لە ڕێگەدا گاکە نەئەڕۆیشت، ئەمیش چوو بە ئەسپایی سەری نایە بناگوێی گاوە چپانی بە گوێچکەیەوە وتی: «دەویت باوك! من ئالێکت ئەدەمێ و کەچی لە خوا ئەترسی بۆیە ڕێ ناکەی؟! خۆ ئێستە دەسم بەسریاگە، ئەگەر ڕۆژم لێ بووەوە تۆوی حەجێکت پێ ئەکەم».

بە هەرجۆر بوو گەیاندیە سەر گەنم و هەر بەو شەوە گەنمی گواستەوە. بەیانی چووە سەر شوێن خەرمانەکە و وەکوو کەسێ نەیزانیبێ ڕووی کردە خوا و وتی: «ها برا! خێرا گەنمەکەت بەم شەوە گواستەوە؛ وات ئەزانی ئەگەر شەوێك بمێنێتەوە لێت ئەدزم؟!».

ئەو ساڵە بەسەر چوو، ساڵی دوایی دیسان ڕووی کردە خوا و وتی: «با ئیمساڵیش بوینەوە وە شەریك». هێنای وەردی بڕی و تۆوی چاند و گەنم دەستی هێنا بە خۆیا. قەفی کرد و دانی گرت و پێگەیشت و دوورییەوە، کوتای و سوور بوو. خەرمان گەلێ لە هی پار زۆرتر بوو. ئێوارەوەختێك بوو، وتی: با ئیمشەویش بڕوا، جا بەیانی بەشی ئەکەین.

بەشێکی شەو ڕۆیشت و نەڕۆیشت هەورە چڵکنەیەکی هێنا و کردی بە باران. بارانێکی زۆر قورس و لێزمە، کابرا ئۆقرەی لێ بڕا، هەر بەو شەوە چوو بۆ سەر خەرمانەکە، سەیری کرد دەنکی نەماوە هەمووی لافاو بردوویەتی. کتوپڕ لەو وەختەدا برووسکەیەکی هاوێشت، کابرا سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان بۆلای خوا وتی: «چرای چی هەڵئەکەی، مەگەر گووی تیا ماگە؟ گوو وەڕیش باوك ئەو کەسە لەگەڵ توا ئەوێ وە شەریك!».

**١٧٨.** کابرایەکی کورد لە سولەیمانی ئەچێتە لای سەرتاشێك، سەری ئەتاشێ و لێ ئەدا لە شار دەرئەچێ و ئەچێتەوە بۆ ماڵی خۆی. ئەڕوا تا ئەگاتە سەر گۆیژە، لەوێ پیاوێکی خێڵەکەی خۆیان ـ کە لەلای ڕان بوو ـ تووشی ئەبێ. لێی ئەپرسێ حەمە مرا! ئەوە سەرت تاشیگە؟ ئەڵێ: ئا. ئەڵێ: ئاگات لێوو تیف‌تیفەکەی چەند خۆشە؟ ئەڵێ: تیف‌تیفەی چی؟ ئەڵێ: کورە ناشێ کاورا تیف‌تیفەی بۆ لێ نەداوێتی؟ ئەڵێ ناوەڵڵا! برا هەر ئەوەندەوو، تاشی و وتی: هەڵسە بڕۆ. وتی: کەواسە برا هیچ خۆشییەکت نەچێشتگە.

ئینجا کابرا قوشقنە قەوەت لێی ئەدا لە سەر گۆیژەوە ئەگەڕێتەوە بۆ سولەیمانی و ئەچێتەوە لای سەرتاشەکە ئەڵێ: «برا، تیف‌تیفەکەت نەداگە، کوچکی تۆی لێ نەواری! بەچکە شاری، تۆ بۆچ ئەمەندە بێ فەڕی؟ ئاخر نایێژی وە بێ تیف‌تیفە خوا چۆن قەولیەسی؟»

**١٧٩.** «حاجی تۆفیقی پیرەمێرد» گێڕایەوە وتی: کابرایەکی «کۆزەڕەقە»یی هەبوو «مەکە»ی ناو بوو. ساڵێکیان بێستانێکی ترۆزی ئەکا، بە هەڵکەوت بەرێکی زۆر ئەگرێ. هەموو ڕۆژێ کاروانێکی لێ ئەفرۆشێ، یەکێکیش لە جادەکەی سابوونکەران ناوی «ماوزەڕ» ئەبێ، کە «مەکە» بارە ترۆزی دێنێ لەوێوە تێ‌ئەپەڕێ ئەیباتە بازاڕ، ئەمیش شوێنی ئەکەوێ. کە کڕیار دێتە سەر ترۆزییەکان خۆی تێ‌هەڵئەقورتێنێ، دەست ئەکا بە تاریف کردنی ترۆزی و بە دەور و پشتی کابرای مشتەریدا هەڵئەسووڕێ و هەر ئەڵێ: «چەمیلە و خرمەی دێ!». تا ترۆزی ئەفرۆشرێ، نایشزانێ ئەمە ناوی مەکەیە هەر ئەڵێ «کاك خدر» وا و کاك خدر ئەمە؛ کاك خدر لەمەودوا کە بارت هێنا بانگم کە بزانە چۆنت بۆ ئەفرۆشم، من

وا بە دەستمەوەیە شایییێك لە «هۆمەرەکوێر» ئەکەم کۆزەڕەقی و خەراجیانی و داربەڕوولەیی بانگ ئەکەم، ئەمەندەیان پلاو و گۆشت دەرخوارد ئەدەم تا لە لووتیان دێتەوە.

مەکەش ئەڵێ: لالۆ! جارێ من ناوم خدر نییە و تا ئێستەش شایی کەس نەچووم و پلاوی کەسم نەخواردووە؛ تۆ بە ڕێی خۆت و من بە ڕێی خۆم. خێر، ماوزەڕ وازی لێ نایێنێ، دیسان تێی ئەئاڵێ و دەست ئەکاتە ملی و ئەڵێ: لالۆ «خدر» کە سەر شایی کەس ناچی، وەرە بتبەمە کەبابخانە حازروبازر کەباب بخۆین.

ئیتر لە کۆڵی نابێتەوە، لایە زۆر و لایە خواهێشت، ڕایئەکێشێتە کەبابخانە. لە ڕێ تووشی «مەلا فەرەج» دێن. ماوزەڕ ئەڵێ: مەلا تۆیش فەرموو. بە دزییەوە بە مەلا فەرەج ئەڵێ: تۆ کەبابت خوارد، زوو هەڵسە بچۆرە دەرەوە و بگەڕێرەوە بە پەلەپەل بانگ کە یاشێخ کابراکەی سەلەمی ڕۆنت لێکردبوو، دەستت نەئەکەوت، ئەوەتە تێپەڕی.

لەسەر ئەو تەگبیرە ئەچنە کەبابخانەوە، بایی دوو ڕووپیە کەباب ئەخۆن. مەلا فەرەج زوو ئەچێتە دەرەوە، بانگ ئەکا یاشێخ قەرزارەکەت تێپەڕی. ئەویش لە پڕ دەرپەڕی و «مەکە» لەوێ ئەمێنێتەوە. هەر چاوەڕوانە شێخ ـ کە ناوی نازانێ ـ بێتەوە پارەی کەبابەکە بدا، هەر نایەتەوە؛ ئەمیش گوێدرێژەکانی لە مەیدانەکە جێهێشتووە، تەنگە تاو بووە؛ هەڵئەستێ بڕوا خەلیفە فەرەج پیر ئەیگرێ، پارەکەی لە باخەڵ دەردێنێ.

ئینجا بە بازارا وەك شێت ڕائەکا و ئەڵێ: «ئەمە فیقەی پێکی زوڕنای شاییەکەیەتی، هێشتا هەڵپەڕکێی هومەرەکوێرمان ماوە».

١٨٠. دێکانی لە بەری سیروانەوە ڕۆژێك داریان بۆ ماڵی «وەسمان پاشا» ئەهێنا. کابرایەکی زۆر کوڵەبنەی کەللە قەوی، گوێدرێژێکی کولەکی بار کردبوو، یەك لە یەکی گزگلتر بوون. پاشا کابرای جووجەی گل دایەوە، چاکەت و پانتۆڵێکی ڕاویان بۆ کرد و فێسێکی سەریشیان نایە سەری. عەولقارێکی زۆر کەڵەگەتیش لای پاشا بوو، فنجانی قاوەیان پڕ ئەکرد و ئەیانخستە سەر سینی ئەیاندایە دەست عەولقار. پاشا بە جووجەی ئەوت: تۆ فنجانەکان یەکە یەکە لەسەر سینییەکە داگرە و بیدە بە خەڵکەکە لە دیواخان. جووجەیش بە پەیژە نەئەگەیشتە قاوەی سەر سینییەکەی عەولقار، هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ چوو لە دواوە گونی عەولقاری گرت، عەولقار دانەوییەوە و ئینجا قاوەکانی لەسەر سینییەکە داگرت و دای بە میوانەکان.

١٨١. وەسمان پاشای جاف پیاوێکی هەبوو «سلێمان شانازی» ناو بوو. ئیشی ئەم پیاوە هەر ئەوەبوو هەموو ڕۆژێ ئەچوو بۆ «بامۆك» لە ماڵی میرزا ئەولا ماستی ئەهێنا، هیچی پاشماوە بەرنەئەکەوت؛ زۆریش تامەزرۆی ئەو ماستە بوو.

ڕۆژێك ئەکەوێتە سەر ئەوە کە شتێك بدۆزێتەوە لە ماستەکە بخوا و توێژەکەشی نەشکێنی. لەو گۆی سیروانە قامیش قەڵەم هەیە، قەفێك ئەبڕێ، نووکەکەی وەك قەڵەم دائەدا، لە گۆشەیەکیەوە بە هێواشی دایدێڵێتە بن جامەکە، ماستەکە لە بنەوە هەڵئەمژێ تا تێر ئەخوا، لە سەریشەوە توێژەکەی ناشکێ.

ڕۆژێ پاشا ئەیبینێ وا کاسە ماست لە ناوەوە پووچە، لێی خوراوە و توێژیش نەشکاوە. سلێمان بانگ ئەکا ئەڵێ: سلێمان ئەم ماستە لە

بنەوە کێ خواردوویە؟ ئەڵێ: «پاشا من ماستم هاوردگە توێژی نەشکیاگە، گەردی لێ نەنیشتگە». پاشا ئەڵێ: ڕاست یێژی توێژی ها وە سەرەوە لە شوێن خۆی، بەڵام لێشی خوریاگە؛ بڕوانە تەپیگە. ئەڵێ: «پاشا! مانگاکە باداره کە شیرەکەیان کردگە وە ماست باکەی داگیە لە ماستەکە؛ کە نەختێ لە توێژگەکەی لاچووگە بای ماستەکە دەرچووگە، چاڵ بووگە، نابینی هێلکە کە کەڵەشێر وە سەریا ئەتسێ کاتێ کولاندیان شوێن تسەکە چاڵە.

پاشا ئەڵێ «سلێمان ڕاستم پێ بێژە چە ئەفسوونێکت کردگە سە کار؟ وە سەری تایەربەگ ئەگەر ڕاستم پێ بێژی خەڵاتت ئەکەم». ئەڵێ: «پاشا پێشەکی ئەمر کە خەڵاتەکەم بدەنێ، ئینجا ئەو مەراقەت وەك «با» لە سك دەرئەکەم». پاشا ئەمر ئەکا خەڵاتی ئەدەنێ، ئەوسا «نەیجە»کە لە بەر پشتێنەکەی دەردێنێ و پاشا فێری ماست خواردن بە «نەیجە» ئەکا.

**١٨٢.** پیرەمێرد گێڕایەوە وتی: مەقسووداغا هەبوو لە بنەڕەتا عارەبی جبوور بوو. نەخوێندەوار بوو، لە باخی پورەگی کە ئێستا جێگای ماکینەی ئەلکتریکە کۆنەکەیە، خانووێکی بوو. ژنێکی خەڵکی سولەیمانی هێنابوو. خۆی پیرێکی زرتەبۆزی تووڕە بوو، هەمیشە لەگەڵ منالانا شەڕەجنێوی بوو. ژنەکەش ئافرەتێکی بە عیشوە و ناز و تازە بوو.

دراوسێیەکی فێڵباز و گاڵتەچییان هەبوو «عەبۆلی ئەولای شەریف»ی ناو بوو؛ هەموو جار مەقسووداغای تووڕە ئەکرد بۆ ئەوەی جنێوی بداتێ.

ئەم مەقسووداغایە پیرێکی نەوسن و چڵێس بوو، هەموو ڕۆژێ ئەچووە بازاڕ سا هەرچێ بۆ ماڵ پێویست بوایە ئەیکڕی ئەیناردەوە؛ بۆ

خۆیشی شتێکی وەك هەنار یا سێوی ئەکڕی، دەستەسڕێکی ئاڵی گوڵداری عەجەمی بوو، ئەیکردە دەستەسڕەکە و بەڕێدا ئەهاتەوە، تا ئەگەیشتە ماڵەوە، وچانێکی لەسەر دووکانەکەی «سەعەی خلە سێسەر» ئەگرت، تۆزێ ڕایئەبوارد و ئەو وەختە ئەچووەوە.

عەبۆل ڕۆژێ ویستی ئاینوئۆینێکی فێڵبازی لەگەڵ بکا، چوو دەسەسرێکی وەك دەسەسڕەکەی ئەوی کڕی، هاتە دووکانی «سەعە». تێفکری وا مەقسووداغا هەناری شارەبانی کردۆتە دەسەسڕەکەیەوە و لەوێ دایناوە و وچان ئەگرێ. ئەویش چوو بە قەد هەنارەکانی ئەو شووتی و کوولەکەی کڕی و کردیە دەسەسڕەکەیەوە هات لە تەنیشت ئاغاوە دانیشت و بە دزییەوە دەسەسڕەکەی ئاغای هەڵگرت و دەسەسڕەکەی خۆی دانا و هەڵسا ڕۆی. ئاغاش دوای ماندوو حەسانەوە دەسەسڕ هەڵئەگرێ و ئەچێتەوە بۆ ماڵەوە. بانگ ئەکاتە ژنەکەی ئەڵێ: وەرە ئەم هەنارانە بەرە یەکێکیانم بۆ هەڵوەرێنە. ژنە دەسەسڕ ئەباتە ژوورەوە کە ئەیکاتەوە کوولەکەیە. ئەڵێ ئاغا یاخوا بە خێر بێیتەوە، ئەو شووتییانەت بۆ ترشیات هێناوە؟ ئەمڕۆ ئایشی خلەی خزمم سرکەی بۆ ناردبووم، باشە ئەیخەمە ناوی.

ئاغا دەهری ئەبێ، دەست ئەکا بە جنێودان، ئەڵێ ئافرەت شووتی چی؟ هەنارم بۆ خۆم کڕیوە، تۆ ورێنە بە بێزوو ئەکەی؟ ئاخۆ کێت گرتووە. ئافرەت ئەگری و دەسەسڕ دێنێتە بەردەمی، ئەبینێ ڕاست ئەکا شووتییە. ئینجا هەڵئەستێ بە توورەیی شووتی بەرێتەوە بۆ سەر بەقاڵ، لە ڕێ لائەداتە دووکانی سەعە، عەبۆلیش وا بە دوایەوە بزانێ چی بەسەر دێ. دیسان دائەنیشێ حەکایەتی خۆی بگێڕێتەوە، عەبۆل ئەیخلافێنێ دەسەسڕەکەی خۆی بۆ دائەنێ و شووتی خۆی هەڵئەگرێتەوە.

ئاغا بە تووڕەییەوە ئەچێتە سەر بەقاڵ ئەڵێ: ئەمە مسڵمانەتییە شووتی کۆڵە ئەدەی بە من لە باتی هەنار؟ دەسەسڕ ئەدا بە سەر سنگی بەقاڵا ئەکرێتەوە ئەبینێ هەنارەکانی لە ناوایە. قالەی پیرۆت لەوێ ئەبێ جرتێکی نیو هۆقەیی بۆ ئەکەنێ و ئەویش بە تەریقی و شەرمەزارییەوە هەنار ئەکاتەوە ناو دەسەسڕ و ئەگەڕێتەوە. عەبۆلیش وا بە دوایەوە.

سا ئاغا لە دووکانی سەعە دائەنیشێ و دانانیشێ عەبۆل ئەچێ «شێلم» ئەکڕێ و ئەیهێنێ دیسان ئەیگۆڕێ و ئاغا ئەچێتەوە ماڵەوە. دەسەسڕ دائەنێ، ژنە بانگ ئەکا ئەڵێ: ناوەجاخ تۆ سیحربازی، ئەمجا دەسەسڕەکە لە پێش چاوی خۆم بکەرەوە. کە ئەیکەنەوە شێلمی کاڵ دەرئەچێ. ئینجا گۆبەند خەست ئەبێ، ئەڵێ: ژنەکە تۆ جادووی ئەتوانی منیش بکەی بە کەر و بمفرۆشی، بڕۆ سێ‌بەسێ تەڵاقت کەوتبێ.

دەسەسڕ هەڵئەگرێ دێتەوە دووکانی سەعە، لەوێ دەردی خۆی ئەگێڕێتەوە. عەبۆل لەوێ بە سووکی دەسەسڕی لە دەست وەرئەگرێ، ئەڵێ با ببیەم لە ڕووناکی تەماشای بکەم. ئاغا تۆ خەڵەفاوی، کەری خۆتت لێ بووە بە ڕمووزن. هەڵسە پێشم کەوە بابتبەمە ماڵی خۆتان، لەوێ دەسەسڕەکەت بکەرەوە بزانە چی تیایە؟

ئەیباتە ماڵەوە دەسەسڕ ئەکەنەوە هەنارە. ئاغا شەرمەزار ئەیگرێ دەست و داوێنی ئافرەت ماچ ئەکا و ئاشت ئەبنەوە؛ ئەچنە لای «شێخ‌بابەعەلی» بە هەرجۆرێ بێ تەڵاقەکەی بۆ پینە ئەکا.

**١٨٣.** عێل سەرەوژوور بووەوە بۆ کوێستان ئەچوو. دوادواییەکەی لە «شلێر» و «ناوخوان» بوو. کابرایەکی کورد لەوێ ئەکەوێتەوە بیری کە کەوای نییە. بە پەلە ئەگەڕێتەوە بۆ پێنجوێن، ئەچێتە بەر دووکانەکەی «ئەوڕەحمانی حەمەی وەسمانی خەیات» پێی ئەڵێ:

کەوایەکم بۆ دروست کە. ئەڵێ: پێنج قران. ئەڵێ: لەو چیتە بێ. ئەڵێ: شەش قران. ئەڵێ: ناوەکەی زۆر بێ. ئەڵێ: حەوت قران. بە کورتی کابرای کوردە هەر شتێك ئەڵێ، ئەوڕەحمان قرانێك بۆی سەرئەکەوێ تا ئەگاتە پانزە قران. کابرا ئەڵێ: «خاسە براکە، بۆم دروست کە و بیە وە دەسمەوە با بگەم وە خێڵەکە».

ئەوڕەحمان تۆپە چیتێك دائەگرێ و مەقەستی تێ ئەخا بۆی ببڕێ، کابرا هەر دەست ئەداتە تفەنگەکەی و ئاوقەی سەر سنگی ئەکا ئەڵێ: «دەویت باوك، وەستای بەرگ‌دروو! پانزە قرانم لێ ئەستێنی و گەرەکتە وە قەیچیش پارچە پارچەی کەی دەسم بوڕی! وە کەلام هەر ئێستە ئەتکوژم».

ئەوڕەحمان کەوا ئەزانێ ئەڵێ: «برا ئەمە هی تۆ نییە هینەکەی تۆ وا لە ژوورەوە لە جلخانەکە، سوورێکی بازاڕ بخۆ و وەرەوە کەوای خۆت لەبەر کە». کابرا ئەڵێ دە وا بێژە.

کابرا ئەچێ بۆ ناو بازاڕ و ئەوڕەحمان بە شاگردەکەی ئەڵێ پێنج شەش تەقەڵی کە و بیهێنەوە، تا کابرا ئەگەڕێتەوە کەوا تەواو ئەبێ و لەبەری ئەکا، کە قۆڵی تێ هەڵئەکێشێ، لە سەرشانیەوە تەقەڵەکانی هەموو بەر ئەبێ و ئەشکەوتی تێ‌ئەکەوێ.

ئەوڕەحمان هەر ڕاست ئەبێتەوە زللەیەك ئەماڵێ بە بناگوێی شاگردەکەدا و ئەڵێ: «کەرانباوگاو! من وتم گیرفانی لە تەنیشتەوە بۆ بکە یا لە سەرشانەوە؟» کابراش ئەڵێ: «ئەوە دەردت وێ دەویت باوك! گیرفان لە سەرشانەوە ئەکەی بۆ کەوای خەڵکی».

**١٨٤.** منداڵێکی گژنی ناشیرین چووە سەر بیرێك، تەماشای ناو ئاوەکەی کرد «سەکوت»ـەکەی خۆی بەرچاو کەوت زۆر

ترسا، هەڕای کردەوە بۆلای دایکی وتی: دایە جنۆکەیەك لەو بیرەدایە وەرە تا بچین پیشانت دەم. دایکەکەش لەگەڵی چوو سەیری بیرەکەیان کرد. ئینجا بوون بە دوو، دایکەکەی پێی وت: «ڕۆڵە! ڕاست ئەکەی ئەوەتە ئەو دێڵە سەگە قەحبەشی بەلاوە ڕاوەستاوە».

**١٨٥.** مەلایەك نوێژی شێوان پێشنوێژی ئەکرد بۆ خەڵکەکە، زۆری درێـژ دایە؛ خەڵکەکە هەموو وەڕس بوون. ئینجا بێجگە لەوە لە ئاخری نوێژەکەشا هات سەجدەی سەهویشی برد، کە هیچ سەهویشی نەکردبوو. پاشان پێیان وت: نەء! درێژە دانەکە بەس نەبوو، ئەم سەجدە سەهوە چی بوو کە سەهویشت نەکردبوو؟ وتی: «فلانی لەناو نوێژەکەدا کەوتە فیکرم کە دەستنوێژم نییە، ئەم سەجدەیە بۆ ئەوە بوو!».

**١٨٦.** «شاکرمجرم» ڕواندزی نوێـژی خەوتنان ئەکا لە پشت مەلایەکەوە. هەر ڕاست لە پشت سەری مەلاوە لە یەکەم ڕیزا ڕائەوەستێ، مەلا سوورەتی «والمرسلات» لە نوێژەکەدا ئەخوێنێ، ئەگاتە ئەوە ئەڵێ: ﴿أَلَمْ نُهْلِكِ ٱلْأَوَّلِينَ﴾. «شاکر مجرم» دەچێتە ڕیزی پاشەوە. مەلا ئەڵێ: ﴿ثُمَّ نُتْبِعُهُمُ ٱلْآخِرِينَ﴾. ئینجا خۆی ئەکوتێتە ناوەڕاستەوە. مەلا ئەڵێ: ﴿كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ﴾؛ شاکرم، شاکر ئەبێ نوێژ بەرەڵا ئەکا و ئەکا بە پێڵاوەکانیا و بۆی دەرئەچێ، ئەڵێ «کەواتە ئەم بەزمە بۆ منە».

**١٨٧.** کابرایەکی کورد برایەکی هەبوو براکەی مرد. خەڵك و خوا کۆ بوونەوە چوون ناشتیان. ئەو لەو وەختەدا خۆی دزیەوە

نەچوو بۆ ناشتنەکەی؛ پاشان پێیان وت: بۆچ نەچوویت تەرمی براکەت بنێژی؟ وتی: «برا بۆچ من شێت بووگم بچم؟ برا جوانەمەرگەکەم لەگەڵ تەرمەکەی خلەی ئامۆزاما چوو بۆ گۆڕستان ناشتی، ئیزرائیل چاوی پێ‌کەوت کەوتەوە بیری هات گیانی ئەویشی کێشا. ئێستە منیش بچم خۆم بخەمەوە بیری، ئیزرائیل بێت گیانی منیش بکێشێ؟! با هەر وە سۆی ئەو دەردوە بتلێتەوە، منی بەرچاو نەکەوێ».

**١٨٨.** «مەحمووپاشای جاف» تازە هاتبووەوە، کابرایەکی کورد ئەچێ بۆلای بۆ بەخێرهاتنەوەی. مستێ ناوکە «قەزوان»یش لەگەڵ خۆی ئەبا بە دیاری بۆ پاشا. ئەچێ و ناوکە قەزوان ئەکاتە کوچەلەیەکی دارینەوە و لە بەردەمی پاشادا دایئەنێ و ئەڵێ: «میرم وەخێر بێتەوە! ئەم ناوکە قەزوانەشم وە دیاری بۆ هاوردگە. پێ ناوێ بیتەقێنی، خۆم تەقانیگمە». پاشا سەیرێکی ناوکە قەزوان ئەکات و بە کابرا ئەڵێ: کوڕە کەچەڵ، ئەمەت بە چی تەقاندووە؟ ئەڵێ: «میرم، وە چی تەقانگمە؟ ئا وەم دگانە گواویانە». مەحموپاشا زەردەخەنەیەك ئەیگرێ و هیچی‌تر.



# هەندێک لە داستانی ژن

**١٨٩.** کابرایەکی کوردی شاری ژنێکی هەبوو، ڕۆژی کوڵابوو بە دەستیەوە؛ بە هیچ جۆر پشووی ئەوەی نەئەدا کە تۆزی بحەسێتەوە؛ یا چاوی بە دۆستێکی بکەوێ. ڕۆژێك یەکێ لە هاوڕێکانی لە ڕێگادا تووشی بوو، تەماشای کرد وا سەبەتەیەك «ترێ» بەسەر سەریەوەیە و بە پەلە هەڕا ئەکا و «هەی ترێ!» ئەکا. پێی وت: «برا ڕاوەستە چاك و چۆنییەکت لەگەڵ بکەم و بزانم بۆچی دیار نیت؟» کابراش هەر بەدەم هەراکردنەوە وتی: «لێم گەڕێ دەستم ناگا و ئیشم هەیە».

ئەمیش گوێی نەدایە، سەر ڕێگەکەی لێ‌گرت و وتی: «کوڕە چیت تێ بگەیەنم؟ دەرفەتی ئەوەم نییە قسە لەگەڵ کەس بکەم. بە ناخێری گیانم، ژنم هێناوە، ژنەکەم هەر لە نیوەشەودا هەڵم‌ئەستێنێ و سەبەتەیە چەوەنەرم ئەدا بەسەرا ئەڵێ بچۆ بیفرۆشە؛ کە ئەوە ئەفرۆشم و ئەچمەوە سەبەتەیەك شێلمی بۆ داناوم، بەبێ ئەوە دانیشم ئەوەشم ئەدا بەسەرا ئەڵێ: بڕۆ؛ کە ئەوە ئەفرۆشم ئەچمەوە تەماشا ئەکەم ترێی بۆ داناوم، ئەڵێ: ئەوەش بەرە؛ ئیتر هەروا بەم جۆرە ئەم ڕەتێنێ». کابراش پێی وت: «جا کەواتە برام تەڵاقی بدە و خۆت ڕزگار کە». وتی: «کوڕە دەستم ناگا تەڵاقی بدەم، ئەوەندە پشووم ناداتێ چاوێ بکەمەوە و چارەسەرێکی خۆم بکەم».

.١٩٠ کوڕێکی قومارباز جەهێل پیرێژنێکی حەفتا ساڵی هێنابوو. ڕۆژێك کوڕە داوای ئاوی کرد، پیرێژنەکە تەکانی دا هەڵسێ، نەیئەتوانی. کوڕەکە دەستی دایە پەلی هەڵیسێنێ، پیرێژن ئەیوت: «ئای هەتیو! قۆڵم ڕامەکێشە چاوم خێل ئەبێ!».

.١٩١ کابرایەك کوڕێکی سەرشێتی هەبوو هەراسی بە باوکەکەی هەڵگرتبوو کە دوو ژنی بۆ بێنێت. باوکیشی ئەیوت: «ڕۆڵە دوو ژن بە جارێ نابێ». ئەویش ئەیوت: نا هەر ئەبێ دوو بێ. لە ئاخرا دایکەکەی چوو بێوەژنێکی دۆزییەوە و پێی وت: مارەت ئەکەم بۆ کوڕەکەم، بەڵام ئەبێ بتبینم چۆن کەفوکوڵی ئەنیشێتەوە. بێوەژن وتی: تۆ کارت نەبێ.

هێنایان و لێیان مارە کرد. باوکی چووە لای کوڕە وتی: ڕۆڵە! ئەوا ژنمان بۆ هێنای هەستە بچۆرە لای. ئەویش ئەیوت: دوو ژن نەبێ نامەوێ. وتی: ئاخر دوومان بۆ هێناوی، ئێستە بچۆرە لای یەکێکیان، لەوێ بێرە دەرەوە بچۆرە لای ئەوی‌کەشیان. کوڕە بەم جۆرە ملی هێنایە ژێر بار و هەستا چووە لای پیری بێوەژن.

بێوەژن هیچ دەرفەتی نەدا، یەکێکی ئەکرد سازی ئەکردەوە بۆ یەکێکی‌تر. ئەو شەوە تا بەیانی وای لێ کرد باریکی کرد. بەیانی باوکی هات وتی: ڕۆڵە ژنەکەی‌تر چاوەڕێ ئەکا ئاخر بچۆرە لای. وتی: «باوە هەر ئەمەم بەسە».

ئەو شەوەش بێوەژن لۆکاندیەوە. ڕۆژی دوایی باوکی هات وتی: «ڕۆڵە، ئاخر ژنەکەی‌تر بە تەمایە، دانیشتووە». وتی: «باوە، ئەوە دەرکە و دایکیشم تەڵاق بدە، ئەمە بەشی هەردووکمان ئەکا!».

دوو سێ ڕۆژی‌تری پێ‌چوو، کوڕە بە تەواوی هێزی لێ بڕا، وای لێ‌هات نەیئەتوانی مێشەکان لە لەشی خۆی دەرکا. مێشێك هەر زۆر

عەزیەتی ئەدا، ئەمیش لە ژێر لێوەوە نووزەیەکی لێوە هات وتی: «لاچۆ باوەحیز! ئەگینا ئەڵێم بە باوکم ژنێکت بۆ بێنێ!».

**١٩٢.** کابرایەك هەبوو زۆر دڵی پیس بوو. هەر ژنێکی ئەهێنا لە پاش چەند ڕۆژ کە چاوی پێ بکەوتایە لەگەڵ کەسێکی دراوسێ قسەی بکردایە، وەیا تەماشای پیاوێکی بکردایە، گورج تەڵاقی ئەدا؛ بەم جۆرە خووەوە دوانزە ژنی داوێنپاکی بەرەڵا کردبوو. ژنێکی زۆر کارکردە و دنیا دیدە هەبوو، ناردیە لای کابرا بۆ ئەوەی بیخوازێ. خواستی و هێنایە لای خۆی. ژنەکە دۆستێکی هەبوو، ڕۆژێك نانێکی بۆ دۆستەکەی دروست کرد و بانگی کرد. دۆستەکەشی کوڕی پیاوێکی گەورە بوو، خزمەتکارێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو. خزمەتکارەکە لە حەوشە ڕاوەستابوو، ئاغەی لە ژوورەوە بوو. کوتوپڕ کابرای خاوەن‌ماڵ لە دوورەوە دەرکەوت. ژنەکە چاوی بە مێردەکەی کەوت، بە خزمەتکارەکەی ـ کە لە حەوشەکەدا بوو ـ وت: تۆ دەست بدەرە خەنجەر و بڵێ: «بە چاوی خۆم چاوم لێ‌بوو کە هاتە ئەم حەوشەیەوە. بەخوا ئەگەر نەیدەن بە دەستمەوە ئەچم ئەڵێم بە دارۆغە خانووەکەتان بسووتێنێ و مێردەکەت حەپس بکا».

وەختێ کابرای خاوەن‌ماڵ گەیشتە حەوشە، خزمەتکارەکەی بە خەنجەری ڕووتەوە دی و خزمەتکار ئەڵێ من چاوم لێ‌بوو کە هاتە ئێرە، ئەوا ئەچم خەبەر ئەدەم بە دارۆغە. ژنەکەش ئەڵێ: «خوا قەبووڵی نییە تۆ بوختان بۆچ ئەکەی؟ هیچ بیستووتە پیاوی نامەحرەم ڕوو بکاتە ئەم ماڵە؟» لە ئاخرا خزمەتکارەکە بە بۆڵەبۆڵ ڕۆیشت. ژنە زوو هاتە ژوورەوە وتی: «پیاوەکە شتێکم کردووە کە هەتا قیامەت پیاوەتی تۆ بگێڕنەوە: فلانی کوڕی فلانکەس پۆلیس و یاساوڵی حوکمەت بە شوێنیا ئەگەڕان،

خۆی هاوێشتە حەوشەی ئێمە. منیش بۆ ئەوە پیاوەتییەکی گەورە بۆ تۆ پەیدا کەم، ئەوەتە لە پەنای بەستەکە نوێنەکەدا شاردوومەتەوە. ئەو کابرایە کە خەنجەری ڕووتی بە دەستەوە بوو، جەندرمە بوو؛ بە زمانی لووس دەستم پێوە نا و ڕۆیشت. تۆش کوڕەکە بانگ بکە با لەگەڵت نان بخوا کە دنیا تاریك بوو بەڕێی بکە با بڕوا. بەبێ شك خزمەکانی زۆر زۆر منەتبارت ئەبن».

کابرا کوڕەی لە پەنا نوێنەکان هێنایە دەرەوە ماریفەتێکی زۆری لەگەڵ نواند و لە پاش نانخواردن ڕەوانەی کرد و گەلێ مەمنوونی ژنەکەی بوو.

یەك دوو ڕۆژێ پێ چوو، ئێوارەیەك دیسان نانی بۆ دۆستێکی تری دروست کرد و بانگی کرد و پێی وت: ئیمشەو پێکەوە ئەنوین. ئێوارە لە پاش نوێژی شێوان مێردەکەی هاتەوە، ژنەکە گورج عەبایەکی هێنا دای بەسەر دۆسەکەیا و چوو بە پیر مێردەکەیەوە وتی: «پیاوەکە خوشکێکم هەیە ژنی کوڕێکی بێشەرمە. مێردەکەی شەڕی لەگەڵ کردووە، ئەویش تۆراوە و هاتۆتە ئێرە، شەرمیش لە تۆ ئەکا؛ زۆر شەرمنە. خۆ ئێمەش ناشوکری نەبێ هەر یەك ژوورمان هەیە، ئەگەر ڕێ ئەکەوێ ئیمشەو لە مزگەوت یا لە جێگایەکیتر تەشریفت بنوێ». کابرا وتی: زۆر چاکە و ڕووی کردە چارشێوبەسەر وتی: یاخوا بەخێر بێی دایکەکەم و بە ژنەکەی وت: زۆر خزمەتی بکە، مادام تۆراوە ڕووی کردۆتە ئەم ئاشە کۆنە. ئەویش وتی: بە سەرچاو، لە سایەی خوا و سەری تۆوە لەسەر هیچ پەك ناکەوێ، تەنها زایفەیەك چییە با مانگێك دانیشێ!.

ئیتر کابرا هەستا چووە مزگەوت، وەکوو گونی هەلاج لە سەرمانا ئەلەرزی. بەیانی ڕووی کردە ماڵ، کابرای دۆستە درەنگ خەبەری بووەوە و خۆی گورج کردەوە و هات لە قاپی بچێتە دەرەوە، خاوەنماڵ گەیشت.

ژنەکە دەستوبرد ڕووی کردە دۆستەکەی و وتی: «وەڵڵاهی دڵت ئەوەندە پیس نەبێ؛ هەتا ئێستا لەلای خۆم بووە و نەچووەتە هیچ جێگایەکی‌تر، لە سایەی خواوە خوشکی من لەوانە نییە بچێتە ماڵان». کابرای مێردی وتی: چییە و ئەم زەلامە چی ئەوێ؟ ژنەکە وتی: «پیاوەکە خۆت ئەیزانی ئێوارە فاتەی خوشکم بە تۆراوی هاتە ئێرە، منیش گلم دایەوە. بەیانی زوو گەلێ جنێوم پێ دا، وتم: مێردەکەت لێی داوی دەستی خۆش بێ! بەخوا ئەبێ بڕۆیتەوە و ڕەوانەم کردەوە. ئێستا ئەم کوڕە زاواکەمە هاتووە ئەڵێ: خوشکت ئیمشەو لە کوێ بووە؟ تو سەری خۆت سا، لێرە نەبووە؟ کابرای مێرد ڕووی کردە دۆستی ژنەکەو پێی وت: «وەڵڵا بیللا ژنت ئیمشەو لە باخەڵی خوشکیدا بووە و لە هیچ جێگایەك نەبووە؛ دڵت هیچ نەکا».

**١٩٣.** کابرایەکی کوردی دەوڵەمەن تاقە کوڕێکی هەبوو، لەبەر ئەوە زۆری خۆش ئەویست نە پێی خوێند، وە نە فێری هیچ کارێکی کرد. کوڕە لە پاش مردنی باوکی دەستی کرد بە تەخشان و پەخشان کردن. زۆری پێ‌نەچوو نابووت بوو؛ پوولێکی بە دەستەوە نەما. چار ناچار، ماڵ و منداڵی بەجێ‌هێشت و چووە شارێکی وەکوو «ئەدرنە». بێجگە لە کۆڵکێشی هیچ ئیشێکی‌تری پێ نەکرا. چووە گمرك بۆ کۆڵکێشی، زۆری پێ‌نەچوو لەبەر ئەوە پیاوێکی بنەماڵە بوو و خووڕەوشتێکی باشی ئەنواند، کردیان بە حەماڵباشی. لە ماوەی یەك دوو ساڵێکدا پارەیەکی باشی کۆ کردەوە.

ڕۆژێك تێ‌فکری پارەکە زۆرە، ئەگەر بچێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، ئەتوانێ تجارەتی پێوە بکات. پارەکانی هەڵگرت و چووە کەلاوەیەکەوە هەزار لیرەی کردە توورەکەیەك، هەزار مەجیدی کردە توورەکەیەك، هەزار بینجوویشی

کردە توورەکەیەکی‌ترەوە و زۆر چاك قایمی کرد و خستیە باخەڵیەوە. کە سەری هەڵبڕی ئەوا ژنێکی جوانکەلە بە دیاریەوە وەستاوە.

ژنەکە پرسی: ئەمە چییە باوکم؟ وتی: بەخوا خوشکێ، من خەڵکی ئەو وڵاتی کوردەوارییەم، لێم قەوماوە هاتوومەتە ئەم وڵاتە، ئەم پارانەم گرد کردۆتەوە؛ ئەمە دوو ساڵە ماڵ و منداڵم بەجێ هێشتووە، ئێستا کە خوا بەزەیی پیاما هاتۆتەوە ئەوەندەی داومەتێ، ئەمەوێ ئیتر بڕۆمەوە بۆ وڵاتی خۆم.

ژنەکە وتی: ئۆ، بەخوا زۆر دڵم پێت سووتا؛ کەواتە ڕاوەستە منیش خێرێکم لە سەرە، لە تۆم چاکتر دەست ناکەوێ، ئەوا ئەچم بۆت دێنم.

کابرا دانیشت و ژنەکە لێی دا ڕۆیشت، زۆری پێ‌نەچوو تەماشای کرد ئەوا ژنەکە پۆلیسێك و یاساوڵێکی مەحکەمەی هێنا و هاتەوە، کابرایان ڕاکێشا و بردیان بۆ دیوانی قازی. قازی پرسی لە ژنەکە چییە؟ وتی: قوربان! ئەم کابرایە بێکەس و سواڵکەر بوو، حەوت ساڵ لەمەو پێش هات منیش شووم پێ‌کرد. ئەمە حەو ساڵە بەخێوی ئەکەم و چنگەکرێی بۆ ئەکەم. دوێنێ شەڕمان بوو، سێ‌بەسێ تەلاقی دام. شەوێ هاتووە هەزار لیرە و هەزار مەجیدی و هەزار بینجووم هەبوو، هەریەکی لە توورەکەیەکی چیتی مۆردایە دزیویەتی؛ ئێستە ئەمەوێ بۆم بسێنیتەوە.

قازی ڕووی کردە کابرا و وتی: ها تۆ ئەڵێی چی؟ کابرا وەکوو لە بانێ بەر بێتەوە، وتی: قازی‌بەگ بۆ خاتری خوا، نە ژنم بووە و نە هیچ و نە پارەشم دزیوە. ژنە وتی: قوربان تەماشای کە ئەمە حەو ساڵە بەخێوی ئەکەم کەچی ئێستە ئەڵێ هەر ژنیشم نەبووە؟ ناو و نیشانمان ئەوە بێ کیسەکان تەنانەت بە دەزووی سپیش دروراون.

قازی ئەمری کرد: کیسەکانیان لە باخەڵی کابرا دەرهێنا، هەموو ناو و

نیشانی ژنەکە دەرچوو. ئینجا دوو شاهێدیش هاتن وتیان: ئەشهەدوبیللا! ئەم کابرایە سواڵکەر بوو، ئەم ژنە هەر لە زووەوە دەوڵەمەندە و پارەی بە سوو ئەگەڕێ و خۆی مارە کرد لەم کابرایە. دوێنێ لەسەر دەستی ئێمەدا تەڵاقی ژنەکەی دا؛ کەچی شەوێ چووە پارەکەشی لێ دزیوە. ئیتر قازی ئەمری کرد پارەیان دا بە دەست ژنەکەوە و کابرایان دەرکردە دەرەوە.

کابرا کە ئەمەی لێ کرا، هات تۆپەڵێ قوڕی دا بە سەریا و لە کۆڵانێکا دەستی کرد بە گریان هەتا ئێوارە. ئێوارە ماڵێکی گەورە بەرانبەری بوو، کارەکەرێك هات وتی: کابرا وەرە ئاغەژنم بانگت ئەکا. کابرا وتی: ئینجا نۆرەی ئاغەژنی تۆیە، ئیتر چم پێ ماوە؟ لەگەڵ ئەوەش وتی هەر با بچم تازە لە چی بترسم...؟

هەڵسا لەگەڵ کارەکەرەکە لێی دا ڕۆیشت. کە تەماشای کرد ژنێکی جوانی خانومان لەسەر کورسییەك دانیشتووە. پرسی: باوکم چیت لێ قەوماوە لەم بەردەرگایە لە بەیانییەوە ئەگری؟ وتی: ئەوی لە من قەوماوە لە کەس نەقەومێ! ئەوی بە سەری هاتبوو سەراپا بۆی گێڕایەوە. خانمەکە وتی: ئەو ژنە یەکێکی گەنمڕەنگی دەم و چەناگە کوتراوی کورتەباڵای چاو جوانە؟ کابرا وتی: بەڵێ، خۆیەتی. خانم وتی: «دانیشە من بەیانی پارەکانت بۆ ئەسێنمەوە، بەڵام بەو شەرتە کە پارەی خۆتت دەست کەوتەوە ئیتر لێرە نەمێنی». کابرا وتی: شەرت بێ هەتا ئەمرم بەندەی تۆ بم و ئیتر لەو وڵاتەش نەمێنم.

ئیتر چوو لەسەر تەنووری ماڵە گەورەکە لێی کەوت و نان و چێشتیان بۆ هێنا؛ بەڵام هەنگوینی بە دەم تاڵ بوو، هیچی پێ نەخورا. هەر لێکی ئەدایەوە کە ئایا چلۆن ئەم ژنە پارەکەی بۆ ئەستێنێتەوە؟ بەم خولیایەوە خەوی لێ کەوت.

بەیانی زوو خانم هەڵسا چارشێوی بە سەرا دا و کابرای بانگ کرد، وتی: ئەو ژنە خۆی وتوویەتی کە حەو ساڵە ژنی تۆ بووە؟ وتی: بەڵێ. وتی: ئەمە لە مەحکەمەش نووسراوە؟ وتی: بەڵێ. وتی: «کەواتە بچۆ ئەو ژنە کوڕێکی پێنج ساڵی هەیە وا بە باوەش ژنێکی دایانەوە کە بۆی ڕاگیر کردووە، کوڕەکەت پیشان ئەدەم، پەلی بگرە بیبە، بڵێ: ئەیبەم بۆ وڵاتی خۆم و کوڕی خۆمە. ئەگەر ژنەکە چوو شکاتی کرد، تۆیش بڵێ: بە شەرع ئەولاد هی باوکە؛ من منداڵی خۆم ئەبەم بۆ وڵاتی خۆم. ژنەکەش زۆر کوڕەکەی خۆش ئەوێ و نایدا بە تۆ. هەتا لە پارەکەی خۆت هەندێ قازانجیشی لێ نەسێنی کوڕەکەی مەدەرەوە. کابرا وتی: «سا دەی بم وە قوروانت!»

ژنەکە کارەکەرەکەی خۆی لەگەڵ نارد، منداڵەکەی بەلای دایانەکەوە پیشان دا. کابرا چوو پەلی منداڵی ڕاکێشا. دایان وتی: ئەوە چییە؟ وتی: ئەڕۆمەوە بۆ وڵاتی خۆم و کوڕەکەم ئەبەمەوە لەگەڵ خۆما. دوو سێ منداڵیتر ڕایان کرد، خەبەریان دا بە دایکی کوڕە. ژنە ئاگری تێچوو، بە غار دوای کابرا کەوت. وتی: سەگباب! ئەو کوڕە بۆ کوێ ئەبەی؟ وتی قەحبە! کوڕی خۆمە و ئەیبەمەوە بۆ وڵاتی خۆم. ئەمەی وت و شەپازللەیەکی بە بناگوێی کوڕا کێشا، کوڕە دەستی کرد بە گریان.

ژنە بە تەواوی ئاگری تێچوو، ڕایکرد بۆلای قازی و شکاتی کرد. فەڕاشێك هات و کابرای بانگ کرد. قازی وتی: کورە کابرا تۆ منداڵی ئەم ئافرەتە بۆ کوێ ئەبەی؟ وتی: قوربان! من ئەو کابرایەم کە دوێنێ ئەم ژنە وتی ژنی بووم و تەلاقم داوە و پارەکەی لێ سەندمەوە، ئێستا کە من ئەڕۆم سەرمایەی حەو ساڵم ئەم کوڕەیە، وە بە شەرعیش ئەولاد هی باوکە، هی دایك نییە. ئەیبەم بۆ وڵاتی خۆم. قازی فەرمووی: دایکم

شەرعەن ئەولاد هی باوکە خۆ لێی زەوت ناکەی؟

ژنە دەستێکی کەوتە ئەملا و دەستێکی کەوتە ئەولا. کابرا لەگەڵ لە مەحکەمە هاتە دەرەوە چەپۆکێکی بەسەر کوڕەدا دا. دایکەکەی وەختبوو گیانی دەرچێ. ئاخری چارناچار، هات کەوتە پاڕانەوە. کابرا وتی: ئافرەت، تۆ شێت بووی؟ کوڕەکەم بە سەد هەزار لیرە نادەم. ژنە داوێنی بادا وتی: بیکە لە ڕێی خوادا هەزار لیرەت قازانج ئەدەمێ کوڕەکەم بدەرەوە. کابرا هەموو پارەکانی خۆی لەگەڵ هەزار لیرە قازانج وەرگرت و کوڕەکەی دایەوە دایکی.

کابرا لە دڵی خۆیا لێکی دایەوە وتی: کاروان ڕۆیشتووە؛ ئێستاکە هاوڕێم دەست ناکەوێ کە لەگەڵی بڕۆم. ئەم پارەیەش خەڵکی زانیویانە کە پێمە، ئەترسم لێم بدزن. ئینجا وا چاکە بچم پارەکەم لەلای قازی بە ئەمانەت دانێم، هەروەخت کاروان هات ئەچم وەری‌ئەگرمەوە و ئەڕۆم. چووە لای قازی وتی: قوربان! ئەم پارەیەم بە ئەمانەت لای خۆت بۆ دانێ هەتاکوو هاوڕێم دەست ئەکەوێ و ئەڕۆمەوە. قازی وەری‌گرت و سندووقێك کە لە بەردەمیا بوو خستیە ناویەوە.

لە پاش سێ، چوار ڕۆژ کاروان هات. کابرا چووە لای قازی وتی: قوربان! ئەمانەتەکەم بدەرەوە ئەوا کاروان هاتووە لەگەڵی ئەڕۆمەوە. قازی وتی: ئەمانەتی چی؟ وتی: پارەکانم. قازی فەرمووی: قەحبە باب! پارەی چی؟ یاڵڵا دەرەوە. کابرا هەناسەیەکی هەڵکێشا و دەستی کرد بە گریان و چووەوە بەر ماڵەکە دیسان لێی دانیشت.

کارەکەرەکە هات وتی: وەرە خانم بانگت ئەکا. لێی دا ڕۆیشت. خانم وتی: دیسان چییە؟ وتی قوربان داد! لە دەست گورگ ڕزگارت کردم، ئێستە کەوتمە دەست سوار. پارەکەم بە ئەمانەت لای قازی دانابوو، ئەوا قازی

دەستی پیا گرتووە نامداتەوە. خانم وتی: برۆ بەیانی بۆت ئەسێنمەوە، بەڵام بەو شەرتە لەم شارە بەند نەبی. کابرا وتی: قوربان! ئەگەر ئەم جارە دەستم لە یەخەی ئەم شارە بووەوە شەرت بێ جارێکی‌کە شەوی تیا ڕۆژ نەکەمەوە. چوو لەسەر تەنوورەکە لێی کەوت و هەر لێکی ئەدایەوە ئاخۆ بۆم بسێنێتەوە یان نە؟

ئەو شەوە ڕۆژ بووەوە؛ خانم دەستێ جلی نایابی لەبەر کرد و خۆی ڕازانەوە، سندووقێکی نایە بن دەستی چووە لای قازی وتی: عەرزی قازی بکەن ئیشم پێ هەیە، تەنها خۆم و خۆی. قازی مەحکەمەی چۆڵ کرد.

ژنەکە بە کابرای وت: لە پاش تۆزێك وەرە بڵێ: قازیەفەنی ئەمانەتەکەم بدەرەوە. لەوە پێشتریش ئامۆژگاری کارەکەرەکەی کردبوو کە بە تۆزێك لە پاش پیاوەکەوە بێت و بڵێت: خانم ئاغەم هاتەوە. ئینجا چووە ژوورەوە وتی: «قازیەفەنی من ژنی فلان توجارم. مێردەکەم بۆ تیجارەت چووەتە هندستان، وەکوو بیستوومە، مردووە. ئەوا ئەم سندووقە کە پڕیەتی لە جەواهیر و شتومەکی نایاب، هێناومە لای جەنابت بێ. ئەگەر ڕاست بوو مێردەکەم مردبوو، هەمووی بۆ تۆ، بەڵام لە میرات نووسینەکەدا چاوت لێم بێ؛ ئەگەر نەشمردبوو ئەوا نیوەی بۆ تۆ و نیوەم بدەرەوە».

قازی فەرمووی: بە سەرچاو! کوتوپڕ لەم وەختەدا کابرا هاتە ژوورەوە وتی: «قازیەفەنی خوا ڕاوەستاوت کا ئەمانەتەکەم». قازی تێ فکری ئەگەر نەیدەمەوە ژنەکە متمانەم پێ ناکا. وتی: «وەرە ڕۆڵە ئەوەتە لەو سندووقەدا بۆ خۆت دەری بێنە، با من دەستم لێ نەکەوێ». کلیلەکەی دایە وتی: بی‌بژێرە بزانە تەواوە، هەرچەن من دەستیشم لێ نەکەوتووە، بەڵام شەرعەن وا چاکە.

کابرا سندووقی کردەوە، پارەی خۆی هەڵگرت و نایە باخەڵی. لەو

کاتەدا کارەکەرەکە هاتە ژوورەوە وتی: «ئاغەژن موژدە، ئاغەم هاتەوە». ژنەکە سندووقی نایە باخەڵی و دەستی کرد بە سەما کردن. کابرای خاوەن پارە و کارەکەریش کەوتنە چۆپی کێشان، قازیش مێزەرەکەی دانا و دەستی کرد بە سووڕدان.

خانم وتی: «قازیەفەنی! من سەما ئەکەم کە مێردەکەم نەمردووە، کارەکەرەکە هەڵئەپەڕێ ئاغەی بەبێ مزەڕەتی هاتۆتەوە، ئەم کابرایە چۆپی ئەکێشێ پارەی خۆی دەست کەوتۆتەوە، تۆ بۆچی وا ئەکەی؟» وتی: «بەخوا خانم منیش لە مەکری تۆ!».

**١٩٤.** ژنێك سێ کچی هەبوو یەکێکیانی دا بە شوو، پێی وت: ڕۆڵە، شەو کە ئەچیتە لای مێردەکەت لەو وەختەدا کە خەریکی ئیش کردنە، بزێکی پێوە بکە بزانە ئەڵێ چی!.

کچە شەو کە مێردەکەی چووە لای ـ وەکوو دایکی پێی وتبوو ـ بزێکی بە مێردەکەیەوە کرد. مێردە زەردەخەنەیەك گرتی و وتی: «ئای ئەوە بۆچی وا ئەکەی؟» سبەینێ دایکەکە لە کچەی پرسی: ها ڕۆڵە، چی بوو؟ وتی: دایکە بزەکەم پێوە کرد، زەردەخەنە گرتی و وتی: بۆچی وا ئەکەی. دایکی وتی: «ڕۆڵە ئەوە کەرێکە خوا پێی داوی، بەختت چاکە تا ماوی سواری بە».

کچی ناوەنجی دا بە شوو، بەو جۆرە ئامۆژگاری ئەویشی کرد. شەو کە کچە مێردەکەی هاتە لای، بزێکی بە مێردەکەیەوە کرد، کابرا ڕاپسکا و هیچ دەنگی نەکرد. بەیانی دایکی کچەکە لە کچەی پرسی: چی بوو؟ وتی: دایە، کە بزەکەم پێوە کرد، ڕاپسکا و دەنگی نەکرد. وتی: «ڕۆڵە، تۆیش هەر باشی؛ ئەوەندە هەیە هەروەخت ئەو تووڕە بوو، تۆ هیچ دەنگ مەکە».

ئینجا کچی بچووکی دا بە شوو، بەویش هەر وای وت. شەو کە مێردەکەی چووە لای، لەو وەختەدا بزێکی بە مێردەکەیەوە کرد. مێردە کشایەوە و ئیشەکەی نەکرد. هەستا خۆی کۆ کردەوە و بە کچەکەی وت: «توخوا بزانم ئەو پەنجەتە کامە بوو با ماچی بکەم». کچە پەنجەکەی خۆی پێشان دا، کابرا چەقۆیەکی دەرهێنا و ئەنگوستی کچەی بڕیەوە. کچە کەوتە قۆڕەقۆڕ و هاوار هاوار تا بەیانی. بەیانی دایکی هات لێی پرسی: چی بوو؟ وتی: دایە، خوا بتگرێ بۆ ئامۆژگاریت! کە من ئەوا ئەنگوستێکم لەسەر دانا. دایکی وتی: «ڕۆڵە ئەنگوستێکت بڕوا چاکترە تا خۆت. ئەوا پێت ئەڵێم مێردەکەت مێردە. هەر ببزویتەوە ئەتکوژێ، جا ئەبێ بە هەموو جۆر ملی بۆ ڕاکێشی».

**١٩٥.** کابرایەکی کورد دوو کوڕی گەنجی هەبوو. کوڕەکان چوون دوو خوشکیان خواست. زۆری پێ نەچوو یەکێ لە کوڕەکان ڕەنگ و ڕوویەکی‌تری هەڵهێنایەوە و ڕۆژبەڕۆژ جوانتر ئەبوو؛ کەچی ئەویتریان بە پێچەوانەی ئەو، ڕۆژبەڕۆژ خراپتر و پەرپووتتر ئەبوو. لە براکەی خۆی پرسی: ئەرێ برا! تۆ لە ماڵەوە لەگەڵ ژنەکەت چۆنی؟ وتی: برا ژنی وا چاك و گوێڕایەڵ هەر نەبووە. وتی: ئەرێ تۆ چۆنی؟ وتی: بەخوا برا! کوشتوومی. من ئەڵێم سیر و ئەو ئەڵێ پیاز. براکەی وتی: نابێ؛ هەردووکیان کچی یەك باوك و دایکن، بۆچ ئەبێ ئەو وابێ و ئەم وابێ؟ وتی: ئەگەر بڕوا ناکەی با تاقییان بکەینەوە. وتی: باشە.

کابرا هەستا چووە بازاڕ بارێ شووتی کڕی. بۆ شەوێ براکەی و دوو سێ کەسی‌تری بانگ کردە ماڵەوە. لە پاش نان‌خواردن وتی: ئا ژنەکە! شوتییەکەمان بۆ بێنە بیشکێنین. ژنە چوو شووتییە کۆڵەیەکی هێنا و

فرێـی دایـە بەردەمـی مێردەکەی. مێـردە وتی: ئەمە خراپە، شـووتییەکی باشـمان بـۆ بێنـە. ژنە بـە ناوچەوانێکی گـرژ و مۆنەوە هەسـتا چوو پێنج، شەش شووتی خستە سینییێکەوە و هێنای وتی: «فەرموو ئەوە شووتییەکانت کـە کـەر نایانخوا؛ ئەڵێی خزمەتکار و کارەکـەری ڕاگیر کردووە، پەیتاپەیتا ئەمری بـە سـەرا ئـەکا!». میوانەکانیش ئاگایان لـەم گفتولفتەیە. لە پاش تۆزێ زۆر شەرمەزار بوون و لێیان دا ڕۆیشتن.

سبەینێ براکـەی هـات وتـی: ئیمشـەو میوانـی مـن بـن. ئینجا چـوو لـە بازاڕ تاقـە شـووتییەکی کـڕی و بردیـەوە ماڵـەوە. ئێواری براکـەی و میوانەکانی‌تر چوون دانیشتن. لە پاش نانخواردن، کابرا بە ژنەکەی وت: ئا ژنەکـە شـووتییەکمان بۆ بێنـە بیشـکێنین. ژنـە چـوو نەوی لە شـووتی و هێنـای دایـنـا. پیاوەکـە وتـی: ئـەم شـووتییە خراپـە بچـۆ شـووتییەکی‌تر بێنە. ژنە شـووتی هەڵگرتەوە بردی و هیچ شووتی‌تریـشیان نییە. نەختێ خۆی خەریـك کرد و هێنایەوە وتی: «پیاوەکە بزانە ئەمە چۆنە؟» دیسان مێردەکـەی وتـی: بەخـوا ئەمـەش باش نییـە، شـووتییەکی‌ترمان بۆ بێنە. ژنە شـووتی بردەوە دیسـان هێنایەوە وتی: پیاوەکە ئەمە یەکێکی‌تر، بزانە ئەمە چۆنە؟» تا حەوت جار پیاوەکە شـووتییەکەی بە ژنەکە دەناردەوە. هەرجار کە دەچوو و دەهاتەوە بە ڕوویەکی گەلێ خۆشـتر لە هەوەڵجار دەهاتـەوە؛ کەچـی شـووتیش هـەر یـەك شـووتی بـوو. جارێـك نەیـوت شووتی‌ترمان نییە.

بەیانی چووە لای براکەی وتی: «ها برا! ژنەکانمان چلۆنن؟» وتی: بۆ خاتری خوا چارێکم بکە. وتی: چارت هەر ئەوەیە تەڵاقی بدە، من مارەی ئەکەم. ڕەوشتی بۆت چار ئەکەم و لە پاشا بۆت تەڵاق ئەدەمەوە.

کابرا چوو ژنەکەی تەڵاق دا و ئەمیش ژنی خۆی تەڵاق دا. هەریەکە

ژنی ئەوی‌کەیانی مارە کرد. ژنی براکەی‌تر کە چاوی بەم مێردەی کەوت سواری بوو. ئەوە ئەو هیچ، ئەمی‌تریش ئەو ڕۆژە کە هێنای، کەرێك لە حەوشەدا بوو، بە ژنەکەی وت: ئا بچۆ دۆڵکەیە ئاو بۆ ئەم کەرە دانێ. ژنە چوو ئاوەکەی بۆ دانا. کەرەکە دەمی برد بۆ ئاوەکە و کەچی نەیخواردەوە.

کابرا هەر هەڵیکێشایە خەنجەر و خەنجەرێکی گەیاندە لارە فیسکەی کەر و وتی: «کەرانباوگاوا! لای وایە ئەو عالەمە خزمەتکاری ئەوە، هەر ئاوی بۆ دانێن و نەیخواتەوە». خوێن فیچقەی کرد. ژنەکە ئەمەی دی زەنەقی چوو؛ ئیتر ملی بۆ ئەم مێردەی ڕاکێشا، ئەگەر مێردەکەی بارە گوێزی لێ بنایە خرەی نەئەهات.

لە پاش بەینێك چووەوە لای براکەی وتی: برا! ژنەکەم بۆ چاك کردووی وەرە بۆت تەڵاق ئەدەم ژنی خۆت بەرەوە. هەریەکە ژنی خۆیانیان تەڵاق دا و ئینجا لە براکەی پرسی: ئەو ژنەی لای من زۆر لاسار بوو چۆنت چاك کرد؟ ئەویش وتی: «کوتەك ئەزانێ قۆناخ لە کوێیە» و باسی کەرەکەی بۆ گێڕایەوە.

کابرا کە ژنەکەی مارە کردەوە فیکری کردەوە وتی: بەخوا وا چاکە با منیش هەر لە هەوەڵەوە ڕایبێنم. بە ژنەکەی وت: ئا ژنەکە مەرکانەیە ئاو دابنێ بۆ گوێدرێژ با بیخواتەوە. ژنە چوو مەرکانە ئاوی دانا و کابرا چوو بەلای کەرەکەوە، ژنەش ڕاوەستابوو، سەیری کرد کەرەکە ئاوەکە ناخواتەوە، هەڵیکێشایە خەنجەر کە لە ورگی کەر بدا. ژنەکە خێرا دەستی کابرای گرت و وتی: «مەکە مەکە، لێت ناوەشێتەوە؛ بە خۆڕایی کەرەکەش مەکوژە. تۆ هەر پیاوەکەی جارانی چاکت ئەناسم».

کابرای قوڕ بەسەر دەستی سارد بووەوە و چووەوە دۆخەکەی جاران.

**١٩٦.** ڕۆژێك پیرێژنێك هات بۆ قەراخ شار، تەماشای کرد ئەوا لە ناقسنەکەی «وەیسی نازدار»دا شەیتان دانیشتووە. دەستەئەژنۆ ئەگری و خورخورِ ئاو بە چاویا دێتە خوارەوە. لێی پرسی: ئەوە بۆچی ئەگری؟ وتی: «پووریێ! "کۆستە"و "باوەمەردە" شاییانە؛ ژن بەژنیان کردووە. ئەمرۆ چوار ڕۆژە دهۆڵ و زورنا لێ ئەدەن، هەرچەنم کرد بیانکەم بە گژ یەکا بۆم نەکرا، لە داخی ئەوە ئەگریم؛ گریان بۆ من باشە». وتی: «ئەی عەمرت نەمێنێ، هەڵسە وەرە لەگەڵم؛ من ئەڵێم برامە، تۆیش بڵێ وایە، ئینجا بزانە چی ئەکەم». شەیتان وتی: پووریێ ئەگەر تۆ شتێکت پێ کرا شەرت بێ تا ماوم ببم بە شاگردت.

ئینجا هەردووکیان هاتنە «کۆستە» و لە ڕێوە چوونە ماڵی ئەو کوڕە کە خوشکی داوە و ژن ئەهێنێ. پیرێژن هەر لەگەڵ گەیشتە جێ، وتی: «ڕۆڵە! خۆ تۆ خزمی، کە ژنت ئەهێنا بۆچی پرسێکت بە من نەکرد؟ من و باوکت خالۆزا و پوورزاین. ئەگەر بە هەژارم ئەزانی هەر خۆڵی ناو ماڵەکەم بێژمەوە چوار ئەوەندەی دەوڵەتەکەی تۆی تیایە».

کوڕە گەلێ لە خۆی بوردەوە وتی: پووریێ لێم ببوورە، بەخوا نەمزانیوە کە خزمایەتییەکی وەهامان هەیە، هەتا ئەمڕۆش بە خزمەتت نەگەیشتووم.

ئیتر پیرێژن داوێنی لێ کرد بەلادا، دەستی کرد بە چێشت دروستکردن. ئەو ژنانەی کە نان و چێشتیان ئەکرد، هیچیان پێ نەمابوو، هەموو بووبوون بە سەیرکەر. سێ ڕۆژ شاییی مابوو پیرێژن هەناسەیەکی نەدا و قنگی نەنایە زەوی. ئەو وەکوو ئاشی چوار پاڵوو هەر هەڵئەسوورا. ڕۆژی بووك سوار کردن، بووکی بە جۆرێ ڕازانەوە کە هەموو خەڵکی دێیەکە سەرسام مان. لێرەوە بووکیان برد بۆ «باوەمەردە» و لەو لاشەوە بووکی باوەمەردە هات. بووکەکانیان گۆڕییەوە. پیرێژن چووە ژوورەوە تەماشای

کچە باوەمەردەیی کرد ـ کە بۆ خاڵۆزای هاتووە بە بووك ـ نەختێ سەرکەفی «خوم» لە گیرفانیا بوو، دەستی تێوە دا و دەستی کرد بە باخەڵی بووکێدا هەردوو مەمکی گووشی. ئیتر هاتە دەرەوە زاوای بانگ کرد و سێ چەپۆکی بە سەری خۆیا دا و نەختێ پۆپە سپیەکانی ڕاکێشا و وتی: «هەتیو! خوا بتگرێ تۆ کە ژنت ئەهێنا، نەدەبوو بگەڕێی ژنێکی بە ناموس و بە شەرم بێنی؟ چووی ئەم خوشکە نازك و نازدارەت دا بە قەحبەیەك!».

کوڕە جارێ لە تاسەوە چوو، ئەمجا پرسی: توخوا پوورێ ئەم ژنە چییە؟ پیرێژن دیسان یەك دوو چەمۆڵەی لە خۆی نا وتی: «ئەم گێسو بڕیدەیە دۆستی هەتیوێکی خومخانەچی بوو، هەموو ڕۆژێك کە بۆ ماست و دۆ فرۆشتن ئەهات، هەتیو ئەیبردە ژووری خومخانەکەیەوە هەرچی لەگەڵ ئەکرد، ئەیکرد. تەنانەت ڕەنگە ئێستەش سنگ و مەمکی نیشانەی خومی پێوە بێ».

هەتیویش کەر و سەرشێت بوو؛ ئەم قسەیە بیست هەڵیکوتایە ژوورەوە و کراسی بووکی هەڵدایەوە. کە ڕوانی ئەوا هەردوو مەمکی جێگای پێنج پەنجە و دەستەکەی لێوە دیارە و هەمووی خومە، ئیتر بەبێ هێڵ و گفت، بووکی دایە بەر خنجەر، شڕ و وڕی کرد بەسەر یەکا.

پێخەسوو، کە بووکی بە کوژراوی دی ئەویش دای بە سەری خۆیا بە باوکەڕۆ خۆی گەیاندەوە «باوەمەردە» و لە دوورەوە بانگی کرد: ئەوە بۆچی ڕاوستاون؟ خۆ کۆستەیی بووکیان پارچەپارچە کرد.

ئەمانیش دەستبەجێ بووکیان پەلپەل کرد. هەردوو دێ ئەمجا دەستیان دایە تفەنگ، هەتا ڕۆژ ئاوا بوو، دە دوانزە کەسیان لە یەکتری کوشت.

ئەمجا شەیتان کە ئەمەی دی دەستی پیرێژنی ماچ کرد و وتی: «نە وەك شاگرد، ئیتر پووریێ هەتا ماوم خزمەتکارتم».

**١٩٧.** دوو پیرێژن بوون بە کچێنی زۆر ناشیرین بوون، کەس نەیخواستن، هەر وا مانەوە تا پیر بوون ددانیان کەوت؛ یەکێکیان تەنها دانێکی مابوو ئەوی‌تریان دوو دان. ئەو سەردەمەش دانساز نەبوو. ڕۆژێ وتیان: خۆ ئێمە لە دنیادا لەزەتمان لە خۆمان نەدی، کەواتە با پێکەوە خانوویێك بگرین، هەردووکمان دەسترەنگین، دروومان ئەکەین و تا ماوین بۆ خۆمان بەم جۆرە ڕائەبوێرین.

هاتن خانوویێکیان گرت. «دوودانە» لە ماڵەوە دروومانی ئەکرد بە جلی ئاڵوواڵاوە، «یەك‌دانە»ش ئیش و کاری بازاڕی ئەکرد. خانووەکەیان لەسەر ڕێی قەراخ شار بوو.

کوڕی پاشا ئەچوو بۆ ڕاو، لەسەر سوارییەوە چاوی بە دوودانە کەوت، بە ئاڵوواڵا و قەد و باڵایەکی بەرز و بە لارولەنجە بە هەیوانەکەدا ئەهات و ئەچوو؛ بە کچێکی جوانی نازداری هاتە پێش چاو. یەك‌دانەی بانگ کرد و وتی: ئەو کچە کێیە؟ وتی: «قوربان! ئەوە تەنها کچمە، بۆیە هێناومەتە ئەم قەراخ شارە کەس نەیبینێ و ئاژاوەیەکم بۆ نەنێتەوە. ئاخری لێرەش ڕزگارم نەبوو، جەنابتان دیتان، قوڕ بە ماڵمەوە درا. ئەترسم کچەکەم لە کیس بچێ». کوڕە میر ئەوەندەی‌تر شێت‌گیر بوو وتی: «پیرێژن! من ئەم کچەم هەر ئەوێ».

کوڕە سەودایەکی وای کەوتە کەللەوە نەیتوانی بچێ بۆ ڕاو، گەڕایەوە خشڵ و تەدارەك و پارەیەکی زۆری نارد و وتی: ئەمشەو کچەکەم ئەوێ، دوودانەیش ئارایشی یەك ددانەی دا و دوو هەنجیرە وشکەی نایە دوو لاگوپیەوە کە چاڵی گوپی پێ پڕ بکاتەوە. یەك ددانە ملچەملچ

هەنجیری ئەمژی زۆری پێ خۆش بوو.

شەو بردیان بە بووکی، کوڕە میر چووە پەردە ڕوانی وا دەڵە دێوێك دانیشتووە، وتی: ئای! پیرێژن چە پەنێکی پێ دام. شەقێکی لە بووك هەڵ دا لە پەنجەرەوە فڕێی دایە باخەکەوە، هەنجیری لە دەم دەرپەڕی. چڵم و لیك و سووراو و سپیاو و فرمێسك دەموچاوی گرتبوو، بە هەنسکەوە ئەگریا و ئەیوت: «هەنجیری ماڵی دایکم ئەوێتەوە».

ڕێکەوت وا بوو کچی شای پەرییان قوڕگی خڕ بووبوو، دەر نەدەبوو. لە تاو ژانی قوڕگی ئارامی نەبوو، تەختەڕەوانیان لەسەر شانی پەرییان بۆ دانابوو ئەیانگێڕا، کە چاوی بەمە کەوت بێ ئیختیار پێکەنی و قوڕگی دەربوو. دوعای کرد پیرێژن بوو بە کچێکی چواردە ساڵ لە پەری جوانتر.

کوڕە، کە پیرێژنی فڕی دایە خوارەوە مەراقی کرد ئاخۆ ماوە یا مردووە؟ کە چوو تەماشای کرد ئەوا باخەکە لە تیشکی ڕووناکی یەك ددانە شەوق ئەداتەوە. ئەویش هەر ئەڵێ: «هەنجیری ماڵی دایکم ئەوێتەوە». چوو ماچی کرد و هێنایەوە ئۆدەی بووکێنییەکەی.

دوو ددانەش چاوەڕێ بوو کەی دەیبەن بۆ کوشتن، کەچی بە خۆشی خۆشییەوە هاتن بە شوێنیا. کە چوو یەك ددانەی نەناسییەوە، بە ناونیشانەی گوفتوگۆی پێشوویان ناسییەوە، ئینجا دوو ددانە هەر ئەیماڵی بە سەر خۆیا و ئەیوت: «چیم کرد بە خۆم».

**١٩٨.** ئەڵێن: لە زەمانی زوو لەو سەرشیوی سەقزە کابرایەك «شاکە»ی ناو بوو؛ ژنێکی هەبوو «شیرین»ی ناو بووە. شاکە هەڵساوە و چووەتە قەڵای کەرەفتوو چل ساڵ نوێژ و ڕۆژوو و بەندایەتی بۆ خوا کردووە. لە پاشا هاتووەتەوە بە ژنەکەی وتووە: «شیرین! ئەوا چڵ ساڵەم تەواو کرد، ئێستە هەقی ئەوەم هەیە کە سێ نیاز بکەم لە خوا و هەرسێکی

گیرا ببێ؛ جا تۆ ئەڵێی داوای چی لێ بکەم؟».

شیرین سێودووی لێ ناکا ئەڵێ: «داوا بکە خوا جوانییەك بدا بە من کە لە دنیادا هاوتام نەبێ». شاکە ئەپاڕێتەوە لە خوا و نیازەکەی گیرا ئەبێ. شیرین ئەوەندە جوان و نازدار ئەبێ لە هەموو دنیادا هەر باسی نازداری ئەو ئەبێ.

شیرین کە ناوبانگی خۆی ئەبیسێتەوە، زۆری پێ ناچێ لە خۆی بایی ئەبێ ئەڵێ: من بەم ناسك و نازدارییە بۆچی دابنیشم بەلای پیرەمێردێکی واوە کە نان نییە بیخوا. شاکە و منداڵەکانی جێ دێڵێ و ئەڕوا. ئیتر هەموو کەس قوڕاو ئەخواتەوە کە شیرین قسەی لەگەڵ بکا.

ئەم دیمەنە کار ئەکاتە دڵی شاکەی مێردی. شاکە دوعایەکی لێ ئەکا، کلکێکی لێ پەیدا ئەبێ. شیرین کە لەسەر ئەو جوانییە ئەم کلکە بە خۆیەوە ئەبینێ، پەشیمان ئەبێتەوە و دێتەوە بۆ لای شاکە و بە دەوری ماڵەکەدا چەن شەو و چەن ڕۆژ ئەسووڕێتەوە و لەناو خۆڵ و قوڕا خۆی ئەگەوزێنێ و ئەگری. شاکەش هەر گوێی ناداتێ، لە ئاخرا لەبەر ئەوە دایکی منداڵەکانی بووە و چل ساڵ زەمانی پێشوویان پێکەوە ڕابواردووە، بەزەیی پیا دێتەوە، دوعایەکی لێ ئەکا شیرین ئەبێتەوە بە شیرینەکەی جاران و دێتەوە ناو منداڵەکانی.

بەم جۆرە شاکە نوێژ و ڕۆژووی چل ساڵی لەسەر خاتوو شیرین دۆڕان و لە ئاخرا دەس لە گونان بەرەو ژێر بۆی دەرچوو.

**١٩٩.** کابرایەك دوو ژنی هەبوو؛ یەکێکیان سەرە و یەکێکیان جەهێل. پیرێژنەکە هەر ڕۆژی بوختانێکی بۆ ژنە جەهێڵە هەڵئەبەست؛ کابرا هیچ گوێی نەئەدایە.

ڕۆژێـك پیرێـژن بـە مێردەکـەی وت: «نازانـم تۆ چە شـیرینییەکت بـەو کچەتیـوەدا چـووە؟ هەمـوو شـەوێ گـوو ئەکاتـە ژێـر خـۆی». کابـرا وتـی: ئەمـە چـەن وەختە لەلامە بۆچـی جارێك نەمدی گـووی کردبێتە سـەر جێگـە؟ پیرێـژن وتـی: هـەتا لـە خـەو هەڵئەستی ئەچـێ ئەیشـوا. کابرا وتـی: مـن بە چاوی خـۆم نەیبینم بڕوا ناکەم. پیرێژن وتی: شـەرت بـێ نیشـانت بـدەم. سـێ چوار ڕۆژێکی پـێ چوو، بەیانییەك کـە کابرا و ژنەکە لە هەیوان نوستبوون، پیرێژن بەبێ دەرپێ لە ژوور هاتە دەرەوە، تەماشـای کـرد نوسـتوون. هات بـە پەلە تەپێ گووی کـردە ناو [جێگەی] ژنەکەیتـر و هـەڕای کـردەوە ژوورەوە کـە دەرپێیەکـەی لە پـێ بکاتەوە. کابـرا بەخەبـەر بـوو، ئـاگای لێبوو کـە پیرێژن چی کرد، دەسـتی کرد بە باخەڵیـا لیرەیەکـی ئاڵتوونـی دەرهێنـا و خستیە ناو گووەکـەوە و خۆی بە نوسـتوویی خسـتەوە. پیرێژن هات و وتی: «هەتیوا هەڵسـە من ئەموت کچەتیوەکـە گـوو ئەکاتـە ژێر خۆی، تۆ باوەڕت نەئەکرد؛ دە تەماشـاکە». کابرا تەماشایەکی گووەکەی کرد و وتی: «ئۆخەی ئەوە لیرەیەکە لە ناویا، خۆزگە هەموو شەوێ بیکردایە».

پیرێژن وتی: «کورە بێنە لیرەکەم بدەرەوە؛ بەو قورعانەی ئەو مەلایە لێی خوێندووە گووی خۆمە هی ئەو نییە.

**٢٠٠.** پیاوێکی جوان عومر ژنێکی پیری لە سك وەستاوەی هەبوو. هەمـوو جـار ژنەکـە پێی ئـەوت: «بچۆ ژنێکی جـوان عومر بۆ خۆت بێنە، من کەڵکی ژن و مێردیم پێوە نەماوە؛ بەڵکە خوا منداڵێکیشت بداتـێ با ئـەم مـاڵ و مڵکـەت نەکەوێتـە دەس خـەڵکی». ئیتـر ئەوەندە سەری کردە سەری کابرا ناچار، چوو کچێکی هێنا.

لە پاش چەن ڕۆژێك پیرێژن ئاگر چووە گیانی. ژەنگ و ژاری هەڵگرت، هەر ئەیوت: هەتیو ئەم ژنە قوددومی خراپە، ئەوەتەی هێناوتە بەرەکەتی ماڵمان نەماوە. دەست ئەبەم بۆ کووپەی ساوەر نیوەی نەماوە، کەنووی ئارد هیچی تیا نەماوە، کووپەڵەی ڕۆن خاڵییە، کابرا هیچ گوێی لێ نەئەگرت.

ئاخری ڕۆژێك کابرا هاتەوە بۆ ماڵەوە، دوو مریشکیان هەبوو هەریەکێ دە دوانزە جووچکی لەبەر بوو. سەیری کرد لە سەرانگوێلکی بەر دەرگاکەیان هەمووی بە مردارەو بووی فڕێ دراوە. پرسی: ئەم مریشك و جووچکانە بۆچی مردارەوە بوون؟ پیرێژن وتی: «لە قودووم شەڕ بپرسە».

ڕۆژی دوایی دوو گوێرەکەیان هەبوو، پیرێژن گوێرەوساری لە ملیان پێچا هەردووکی خنکاندن و ئەوانیشی فڕێدایە سەر سەرانگوێلێك. کابراکە هاتەوە چاوی پێکەوت، پرسی: ئەمانە بۆچ وایان لێ هاتووە؟ پیرێژن وتی: مردووت مرێ، بەخوا داری سواڵی ئەگریتە دەست. کابرا وتی: ئینجا چارم چییە؟ وتی: ئەم کچەتیوە تەڵاق بدە. وتی: خوا بتگرێ، هەموو چەن ڕۆژێکە هێناومە و پارەیەکی زۆرم تیا خەرج کردووە؛ چلۆنی تەڵاق بدەم؟ خۆ ئەگەر تەڵاقیشی بدەم مارەیی و نەفەقەم لێ ئەسێنن. پیرێژن وتی: بیکوژە، بیکوژە. کابرا وتی: «الحُکمُ للّە»! ئەیکوژم.

دوو ڕۆژی پێچوو پیرێژن وتی: درۆزن خۆ تۆ وتت ئەیکوژم، کوا هیچ دیار نەبوو؟ [وتی:] نازانم، چەقۆی تیژم نییە کە سەری ببڕم. پیرێژن وتی: من چەقۆی تیژت بۆ ئەهێنم.

ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە چەقۆیەکی بە هەسان سوو. شەو وەختی نوستن هێنای خستیە کۆشی مێردەکەیەوە. بەیانی زوو هەڵسا تەماشای

کرد ژنەکە پشتیر ئەماڵێ. چوو کابرای خەبەر کردەوە وتی: بۆچی سەرت نەبڕی؟ وتی: بەخوا ژنەکە لەسەر جێگا لێکم دایەوە ئەگەر سەرم ببڕیایە حوکمەت حەپسی ئەکردم؛ ئەیانوت تۆ لەسەر چی ئەم ژنەت سەر بڕیوە؟ لەوانە بوو هەڵمواسن. ئەگەر حوکمەتیش نەیزانیایە، برای هەیە ئەیانکوشتم. پیرێژن وتی: کەوایە بیخنکێنە. وتی: چاکە.

سبەینێ کە پیرێژن تەماشای کرد، ئەوا هەوێکەی مەشکە ئەژەنێ. دیسان مێردەکەی خەبەر کردەوە وتی: ئەوە بۆچی نەتخنکان؟ کابرا وتی: لێکم دایەوە ئەگەر دەستم بخستایە بینی، هاواری ئەکرد، خەڵکی ئەهاتن و تووشی کێشە ئەبووم و بەڵکوو دەرەقەتیشی نەئەهاتم. پیرێژن وتی: دە ئەمشەو من دێم هەردوو دەستی ئەگرم نایەڵم جم بدا، تۆش دەست بنێرە بینی و بیخنکێنە. کابرا وتی: زۆر باشە.

شەو وەختی نوستن هات ژنەکە چووە سەر جێگای خۆی ڕاکشا. پیرێژن بە کابرای وت: دە هەڵسە ئەوا من دەستی ئەگرم، تۆش بیخنکێنە. کابرا وتی: ژنەکە وا نابێ بەخوا ئەگەر بیخنکێنم، خەڵکی ئەڵێن: ئەم ژنە ئێوارە ساغ و سەلیم بوو، شەو بۆچی مرد؟ دیارە حەکیم دێت و تەماشای ئەکا و ڕاپۆرتی ئەدا کە خنکاوە؛ ئەو وەختە منیش و تۆش تووشی گۆبەن ئەبین. پیرێژن وتی: ئەی چاری چییە؟ وتی: تەگبیرێکی چاکم کردووە. وتی: چییە تەگبیرەکەت؟

کابرا وتی: «دەست ئەکەم بە گاینی. شەو ئەیگێم، ڕۆژ ئەیگێم؛ ئەوەندە ئەیگێم هەتا ئەمرێ. ئەو وەختە کەس ناڵێ کوشتیان؛ یا خنکاندیان».
پیرێژن وتی: «ناوەڵڵا! کەواتە ئەو جوان و جەهێڵە وازی لێ بێنە؛ من بە قەد خۆم عومرم ڕابواردووە من بەو دەردە بکوژە با ڕزگارم ببێ و ئێوەش بۆ خۆتان ڕەحەت بین».

٢٠١. بێوەژنە کوردێك هەبوو زۆر فێڵباز بوو؛ چوار پێنج شووی کردبوو بەڵام ماوەیەکی زۆر بوو بە بێوەژنی مابووەوە. ڕۆژێك کابرایەکی زەبەلاح هاتە لای، وتی: بیستوومە تۆ مێردت نییە، منیش بێ کەیبانووم؛ ئەگەر شووم پێ ئەکەی ئەتخوازم. ژنە لێی پرسی: تۆ ئیش و کارت چییە؟ کابرا وتی: ئەوی ڕاستی بێ دزم. وتی: چە جۆرە دزێکی؟ وتی: من عادەتم وایە ئێواران کە نوێژی شێوانم کرد ئەچم بۆ دزی؛ بەیانی بۆ نوێژی سبحەینێ دێمەوە؛ نایەڵم نوێژەکەم بڕوا. ساخوا چی بە نسیب کردبوو ئەیهێنم، پێوە ڕائەبووریم. بەڵام بە ڕۆژ لە ماڵ ناچمە دەرەوە.

ژنەکە چوو لەگەڵی بۆلای مەلایەك و خۆی لێ مارە کرد. لە پاش چوار ڕۆژ، شەوێك نوێژی خەوتنان کابرایەك هات وتی: «بیستوومە تۆ بێوەژنی، ئەگەر شووم پێ ئەکەی ئەتخوازم». پرسی: تۆ چە کارەی؟ وتی: ئیش و فرمانم هەر دزییە. وتی: چلۆن دزێکی؟ وتی: «دزی ڕۆژم؛ بەیانی کە نوێژم کرد ئەڕۆمە دەرەوە. ماڵێ دەرگای دانەخستبێ شتێکی لێ ئەدزم؛ یا خود گیرفانێك ئەبڕم؛ وەیا بە فێڵ و تەڵەکە شتێ دەس خۆم ئەخەم. ئێوارە دوای نوێژی شێوان دێمەوە، نوێژی خۆم ئەکەم و ئیتر بە شەو ناچمە دەرەوە». ژنەکە وتی: «ئەمە خوا داویە بە ڕۆژ و بە شەو من لە ئاهەنگا بم». چوو خۆی لەویش مارە کرد.

نزیکەی چوار پێنج مانگ بە ڕۆژ دزی شەو لەلای بوو، بە شەویش دزی ڕۆژی لەلا بوو. ڕۆژێك وتی: بەخوا وا چاکە من ئەم دوو مێردەم لە یەك ئاشکرا بکەم بزانم چی ئەکەن. شەو بە دزی ڕۆژی وت: «فلانی سبەینێ مەچۆ بۆ دزی، بیست قڕانم لەلای کوێخاکەی "باوەمەردە"یە، بچۆ بۆم بسێنەوە». وتی: چاکە. بەیانی کولێرەبەڕۆنێکی هێنا لە بەرچاوی

کابرا کردی بە دوو کەرتەوە، دەسەسرێکی سووریشی هێنا کردی بە دوو لەتەوە. کەرتە کولێرەی خستە ناو لەتە دەسەسرەوە دای بە دزی ڕۆژ. وتی بڕۆ؛ بەڵام لەسەر پردەکەی «قلیاسان» دانیشە نانەکەت بخۆ هەتا هاوڕێکت لێ هەڵبکەوێ، ئەوسا بڕۆ نەوەکوو ڕووتت بکەنەوە. کابرا وتی: چاکە لەتە کولێرە و دەسەسرێ نایە باخەڵی و لێی دا ڕۆیی.

لە پاش ڕۆیشتنی ئەو، دزی شەو کە مێردی ڕۆژ بوو هاتەوە. ژنەکە وتی: «فڵانی دامەنیشە، بیست قڕانم لەلای کوێخاکەی باوەمەردەیە، بچۆ لێی وەربگرەوە؛ ئەمەش توێشووی ڕێگات، بەڵام لەسەر پردەکەی قلیاسان دانیشە بیخۆ، بەڵکوو هاوڕێکیش پەیدا کەی بە تەنها مەڕۆ با تووشی جەردە نەبی».

کابرا نانەکەی وەرگرت، کەوتە ڕێ. کە هات لەسەر پردەکەی قلیاسان تەماشای کرد زەلامێك دانیشتووە کولێرە ئەخوا. سەلامی کرد و لە لایەوە دانیشت. تێشووەکەی دەرهێنا؛ لەتێ کولێرە لەناو لەتێ دەسەسرەی سووردا. دەستی کرد بە خواردن. کابرای هەوەڵ پرسی ئەوە تۆش لەتێ کولێرەت پێیە لەناو لەتە دەسەسرڕدا؟ وتی: بەڵێ. وتی: سوبحانەڵڵا! منیش هەر شتێکی وام پێیە. کە لەتە کولێرەیان بە یەکەوە نا، تەماشایان کرد کولێرەیەکە و کراوە بە دوو لەتەوە. دەسەسرەکەیان بە یەك گرت، ئەویش یەك دەسەسر بوو، دوو پارچە کرابوو. یەکێکیان پرسی: تۆ بۆ کوێ ئەچی؟ ئیشت چییە؟ وتی: ژنەکەم بیست قڕانی لەلای کوێخاکەی باوەمەردەیە ئەچم بۆی ئەسێنمەوە. وتی: ژنەکەت ناوی چییە؟ وتی: «خەندان». وتی: کورە خۆ ئەوە ژنی منە و من ئەچم پارەکەی بۆ ئەسێنمەوە.

لەسەر ئەمە نزیك بوو بچن بە گژ یەکا. ناچار هەردووکیان گەڕانەوە چوونە لای ژنەکە و وتیان: تۆ ژنی کێی؟ وتی: هەر کامێکتان ئازا بن

ژنی ئەوەم و لە ئیشی خۆیا وەستا بێ ئەو ئەبێ بە مێردم». هەردووکیان بەم قسەیە ڕازی بوون.

دزی ڕۆژ وتی: ئێستا ڕۆژە با بڕۆین من وەستایەتی خۆمت پێشان دەم. دزی شەو دوای کەوت هاتن بۆ بازاڕ. جوولەکەیەکی دەوڵەمەند ـکە کۆتاڵی فرۆشتبوو بە بازرگانەکان ـلە حوجرەی خۆی هاتە خوارەوە بۆ حەفتانە سەندن. دزی ڕۆژ قەڵەمێك و پارچەیەك کاغەزی بە دەستەوە گرت. جوولەکە لە دووکانێك چوار لیرە، لە یەکێکی‌تر پێنج لیرە، لە یەکێکی‌تر پانزە مەجیدی، لە یەکێکی‌تر چوار کاغەزی پێنج مەجیدی. بەم جۆرە شەشسەد حەوسەد مەجیدی وەرگرت. لە پڕ دزی ڕۆژ دەستی کرد بە باخەڵیا کیسە پارەکەی دەرهێنا. خواجە یەقەی گرت وتی: کیسەکەم. دزە وتی: کیسەی چی؟ بێ دین! تەشقەڵەم پێ ئەکەی. خواجە هاواری کرد و جاندرمە هاتن وتیان: چییە؟ جووە وتی: ئەم کابرایە کیسە پارەی لێ دزیم. کابرا وتی: درۆ ئەکا گەرم پێ ئەکا.

جاندرمەکان هێنایان بۆ دائرە. جووە لەلای باش مەعموور وتی: قوربان! ئەم کابرایە دەستی کرد بە باخەڵما کیسە پارەکەمی دزی. کابرا وتی: قوربان درۆ ئەکا، کیسە پارەی خۆمە، ئەگەر شاهیدی هەیە باشە. جووە وتی: شاهیدم لە کوێ بوو؟ تۆ بە دزییەوە دەرت هێنا. وتی: قوربان! لێی بپرسە ـلە خواجە ـکە من پارەکەم ژمارد؟ خواجە وتی: نەخێر؛ ئەوەتا لە باخەڵیا. دزە وتی: قوربان! ئەگەر پارەی ئەوە کیسەکە چەندی تیایە؟ کە کیسەکەیان ژمارد بە تەواوی قسەی کابرا بوو. باش مەعموور ئەمری کرد تا دوو شەق لەم جوولەکەیە هەڵدەن تەشقەڵە بەم مسڵمانە هەژارە ئەکات. وەڵڵا یەك دوو هەرمێیان دا بە خواجە و دەریان کرد.

کابرا بە دزی شەوی وت: چلۆنم؟ وتی باشە؛ بەڵام ئیمشەو نۆرەی منە.

وتی: چاکە. شەو بە ڕێکەوت پیاوێکی گەورەی وەکوو مەحمووپاشا هاتبوو لە ماڵی پیاوێکی گەورە میوان بوو. دزی شەو، دزی ڕۆژی برد و چوو بە کەمەند چووە سەر بان. ڕەفێقەکەی هەڵکێشایە سەر بان، چوونە خوارەوە، قازێك لە حەوشەکەدا بوو دزی، شەو سەری بڕی و دای بە دزی ڕۆژ وتی: دانیشە لەم مەتبەخە بەو ئاگرە بیکە بە کەباب برسیمانە؛ خۆیشی هاتە سەرەوە.

تەماشای کرد ئەوا پاشا لەسەر چوار پایەیێك نوستووە. خزمەتکارێك لەبەر کورسییەکە دانیشتووە حەکایەتی بۆ ئەکا: «سوڵتان مەحموو لەگەڵ هەیاسی خاس وا ڕۆیشتن، وا هاتن ...». بەڵام خزمەتکارەکە زۆر خەوی دێ، لەگەڵ پاشا خەوی لێ ئەکەوێ، کابراش بە لادا دێت، لە پاش چەند دەقیقەیەك پاشا خەبەری ئەبێتەوە ئەڵێ: «حەمەی خوسرەو حەکایەت بکە». حەمە هەڵئەستێ دیسان چەن قسەیەکیتر لە حەکایەتەکە ئەکا.

دزەکە سەبەتەیەکی گەورەی بە گوریسێك بەست و گوریسەکەی لە دارێکی بن میچی هۆدەکە هەڵکێشان. سەبەتەی هێنا بە هێواشی پاڵێکی بە حەمەی خوسرەوەوە نا، خستیە سەبەتەکەوە، سەری گوریسەکەی ڕاکێشا هێواش هێواش، هەتا سەبەتە لە بن میچ قایم بوو؛ حەمەی خوسرەو بە سەقفەکەوە هەڵواسرا!. دزە دەستی کرد بە شتومەك کۆ کردنەوە. پاشا خەبەری بووەوە وتی: «حەمەی خوسرەو حەکایەت بکە». دزە دانیشت ئەیزانی حەمەی خوسرەو لە کوێدا حەکایەتی بڕیوە. وتی: «پاشان سوڵتان مەحموو وای وت، هەیاسی خاس وای کرد...».

دزی ڕۆژ هاتبوو بزانێ چی ئەکا، کە چاوی بەم کارە کەوت سەرسام بوو. لەم وەختەدا بۆنی گۆشتی قازەکە هات. دزە بە ڕەفێقەکەی وت: بگەرە قازەکە سووتا. پاشا هیچ لێفەکەی لا نەدا وتی: حەمە قازی چی؟ وتی:

«قوربان! لەو وەختەدا کەبابی قازیان بۆ سوڵتان مەحموو ئەکرد». پاشا خەوی لێ کەوتەوە.

دزە هەرچی بەنرخ بوو، کردی بە کۆڵێك هاتە دەرەوە. لەگەڵ ڕەفێقەکەی گۆشتی قازیشیان هێنا و هاتنەوە بۆ ماڵەوە.

پاشا وەختی بەیان خەبەری بووەوە بانگی کرد: حەمەی خوسرەو! حەمەی خوسرەو! حەمە خەبەری بووەوە هیچ چاوی نەکردەوە کە لە کوێیە دەستی کرد بە حەکایەت بە دەم خەوەوە. پاشا تەماشای کرد حەمە لە دوور دەنگی حەکایەتی دێ. سەری هەڵبڕی ڕوانی حەمە دەنگی دێ، بەڵام خۆی دیار نییە. هەموو هۆدەکەی ڕوانی. دوایی تەماشای کرد لە بن میچی خانووەکە لە سەبەتەیەکدا هەڵواسراوە، کەچی حەمە هەر حەکایەتیش ئەکا. وتی: «ئەرێ حەمە! ئەوە چی ئەکەی لەو سەبەتەیەدا؟ دەویت باوك!»

کە حەمە سەری هەڵبڕی وتی: پاشا بۆ خاتری خوا ئەمە کێ خستوومیە ئێرەوە؟ ئینجا پاشا دەنگی کرد، دوو سێ کەس هاتن سەبەتەکەیان کردەوە و حەمەیان هێنایە خوارەوە. کە ورد بوونەوە هەرچێ شتومەکی پاشا هەبوو دزراوە و قازێکیش سەر بڕاوە و کراوە بە کەباب. ئەو وەختە زانی ئەوی وتی: قازەکە نەسووتێ دزەکە بووە.

پاشا لە کردەوەی ئەم دزە زۆر سەری سووڕ ما، جارچییەکی نارد جاڕی دا ئەو کەسەی دزی لە پاشا کردووە بێت، عەفوە. کابرای دزە هات. پاشا وتی: چلۆنت ئەم دزییە کرد؟ کابرا سەر تا پا باسی ژنەکە و باسی دزی ڕۆژی گێڕایەوە. پاشا ئیتر دڵی لێیان چوو وتی: کەواتە هەردووکتان ئەو ژنە تەڵاق بدەن من ژنتان بۆ دێنم و ببن بە خزمەتکارم.

**٢٠٢.** کابرایەکی کورد هەبوو زۆر دەوڵەمەند بوو، هەر تاقە کوڕێکی هەبوو. کابرا مرد و «کەلەپوور» و میراتەکەی هەموو مایەوە بۆ کوڕەکەی. پیاوێکی‌تریش بوو زەڕنگەر بوو، بەڵام زۆر قومارباز و بێ‌حقووق بوو. بە هەرجۆرێـك بوو خۆی کوتایە بن دەستی کوڕە دەوڵەمەندەوە؛ هەموو ڕۆژ ئەچوو لەگەڵی سواری وڵاغ ئەبوو، جێگای خۆش‌خۆش ئەیگەڕان. لە لوقەنتە نایابەکانا نانیان ئەخوارد، ئێوارانیش دیسان لە ماڵی کوڕە دەوڵەمەند نانی ئەخوارد. بەم ناوەوە «کیسەدار» بوو، هەموو ڕۆژێ بە لانی کەمەوە یەك دوو لیرەشی لێ ئەدزێ.

زۆری پێ نەچوو کوڕە پارە و پووڵی نەما؛ ناچار بە فرۆشتنی ملکەکانی بوو. زەڕنگەر هەر ڕۆژە دووکانێك یا باغێك، یا کۆشکێکی بەنرخی بە هەرزان لێ ئەکڕی و کەچی ئەو پارەی کە ئەیدایە نیوەی زیاتری بەناو ڕەفاقەتەوە لێی ئەدزیەوە، هەتا وای لێ هات تەنانەت لە شتومەکی ناو ماڵیش هیچی بە دەستەوە نەما. لەگەڵ ئەم هەموو تێکەڵاوییەش، ئەم مایەوە جارێك چییە ئەم کوڕەی نەبردە ماڵی خۆی و بانگێشتنێکی بۆ نەکرد.

ڕۆژێك کوڕە دەوڵەمەند هیچی نەمابوو، چووە موغازەی زەڕنگەر وتی: ئیمڕۆ هیچم نییە، هەندێك پارەم بدەرێ بە قەرز با بچین بۆ سەیران. زەڕنگەر هەرچەن بەهۆی ئەم کوڕەشەوە بووبوو بە لۆرد، وتی: فلانی ئێستە هیچم لەلا نییە، وە ئەگەر بشمبێ، ناتدەمێ؛ چونکە هیچت نەماوە، بە چی ئەمدەیتەوە؟ کوڕە هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی: «کەوایە فلانی هەر ئەم ئەنگوستیلەیەم ماوە لێم بکڕە، منیش هوقەیەك نان ئەکڕم و ئەڕۆم بۆ وڵاتێ کە کەس نەمناسێ کرێکاری ئەکەم».

زەڕنگەر بە پارەیەك ئەنگوستیلەکەی لێ کڕی و ڕۆیشت. کە چوو

گەیشتە بەر ماڵێکی گەورە، تەماشای کرد ژنێکی جوان لە باڵەخانەوە تەماشای کۆڵان ئەکا. کوڕەش وەستابوو لە چاو بڕکێ کردنا؛ چونکە دەمێ بوو ئیشی بوو، تەماشای ژنەی کرد. ژنەکەش کوڕەی زۆر جوان هاتە بەرچاو و دڵی لێ چوو، بە ئیشارە بانگی کرد. کوڕە چووە ژوورەوە، ژنەکە بردیە باڵەخانە داینا، لێی پرسی: تۆ چی و چە کارەی؟ وتی: بەخوا فلانی! من زۆر دەوڵەمەند بووم، قەزاوقەدەر هیچم نەماوە ئێستاکە هاتوومە سەر ئەوە بڕۆم بۆ وڵاتێکی دوور، ئیشێ بۆ خۆم بکەم پێوە بژیم. وتی: «نابێ بڕۆی؛ من دڵم چووە لە تۆ هەموو ڕۆژێ وەرە لام شەرت بێ ڕۆژێ سەد قرانت بدەمێ». وتی: چاکە.

ئەو ڕۆژە هەتا عەسر ئاهەنگی خۆیان گێڕا، لە پاش عەسر ژنەکە سەد قرانی دایە. کوڕە هاتەوە وتی: «پیاو پارەی نەبێ کەس نایناسێ؛ وا چاکە بچم کاسبی بکەم». دەسبەجێ چوو کووتاڵی کڕی و دووکانێکی بازرگانی دانا. هەموو ڕۆژ ئەچووە ماڵەکە لە پاش کەیف کردن، سەد قرانیشی وەرئەگرت و ئەهاتەوە، بەم جۆرە بووە خاوەن دووکانێ وەکوو حاجی عەزیزی شەرعی.

ڕۆژێك بە ڕێکەوت زەڕنگەرباشی بە بازاڕا هاتە خوارەوە تەماشای کرد ئەوا ئاشناکەی دووکانێکی پاك و تەمیز، پڕ لە کووتاڵی داناوە. لای دا وتی: پیرۆز بێ! ئەمە کەی دووکانت دانا؟ دەسمایەت لە کوێ بوو؟ وتی: بەخوا فلانی کە تۆ ڕووت لێ وەرگێڕام و دەرتکردم، هاتم بڕۆم ڕێم کەوتە ماڵە گەورەیەك، ژنێکی وا و وا بانگی کردم چوومە ژوورەوە، بووین بە ئاشنا نەیهێشت بڕۆم. ئێستا هەموو ڕۆژی ئەچم کەیف و ئاهەنگ ئەکەم و ڕۆژی سەد قرانم ئەداتێ، ئەوا منیش دووکانم داناوە و ئێستاکە دەسمایەیەکی باشم هەیە.

وتی: ئەو ماڵە لە کوێیە، ژنەکە چۆن ژنێك و ناوی چییە؟ کوڕە زۆر چاك ناو و نیشانی دایە. مەگەر ماڵەکە ماڵی زەڕنگەر و ژنەکە ژنی زەڕنگەرباشی بوو. ناوەکەشی پێ وت. زەڕنگەر هەڵسا و چووەوە دووکانی خۆی، لە خەفەتا وەختبوو شەق بەرێ.

وەختی نیوەڕۆ ـ کە وەختی چوونی کوڕەکە بوو ـ زەڕنگەر هەڵسا چووە ماڵەوە، تومەز کوڕەکە لەوێ بوو. ژنە دەسبەجێ وتی: بچۆرە ئەو پەنجەرەیەوە و دەرگای پەنجەرەکەی داخست. مێردەکەی هەموو ماڵەکەی سنگ و سووژن دا هیچی نەدی. هاتەوە بۆ دووکانی خۆی.

سەر لە ئێوارە چووە دووکانی بازرگان، لێی پرسی: ئیمڕۆ چووی بۆ ماڵە ئاشناکەت؟ وتی: «بەڵێ چووم؛ تەنانەت مێردەکەی هاتەوە، ژنەکە منی لە پەنجەرەیەکدا شاردەوە. چاك بوو نەیدیمەوە». کابرای زەڕنگەر بە تەواوی بۆی دەرکەوت کە ماڵ، ماڵی ئەوە و ژنیش ژنی ئەوە.

کەوتەوە بەیانی، کوڕە چووەوە بۆ ماڵەکە، لە ناکاو خاوەن ماڵ لە دەرگای دا. ژنە کوڕەکەی خستە سەبەتەکەوە کە نانی تێدا بوو، هەڵواسرابوو. کابرا هات پەنجەرەکە گەڕا، هۆدەکان گەڕا هیچی نەدۆزییەوە، ڕۆیەوە. کوڕە لە دوای ئاهەنگی خۆی سەد قڕانی وەرگرت و هاتەوە دووکان. زەڕنگەر هات و پرسی: ئەمڕۆ چووی؟ وتی: «بەڵێ چووم؛ تەنانەت مێردی ژنەکە هاتەوە پەنجەرەکەش گەڕا، هەموو جێگایەکی پشکنی بەڵام لە سەبەتەی نانەکەدا بووم، نەیدۆزیمەوە». کابرا دەستی کرد بە جینگڵەدان.

بۆ سبەینێ کوڕە لە ماڵەکە بوو، خاوەن لە دەرگای دا، ژنەکە سندووقێکی گەورەیان هەبوو، دۆستەکەی خستە ناویەوە و قوفڵی لێ دا. کابرا پەنجەرەی کردەوە، سەبەتەی نانی تاقی کردەوە هەرچەن گەڕا هیچی نەدی؛ ڕۆیشت. کوڕە هاتە دەرەوە، سەد قڕانی وەرگرت و چووەوە دووکان.

عەسر دیسان زەڕنگەر چوو پرسی: ئەمڕۆ چووی؟ وتی: «بەڵێ چووم؛ ئیمڕۆش مێردەکەی هاتەوە پەنجەرە گەڕا، سەبەتەی نان گەڕا، بەڵام من لە سندووقە گەورەکەدا بووم، نەیدۆزیمەوە».

بۆ سبەینێ دیسان کوڕە چووە ماڵەکە، ژنەکە سندووقێکی قیرتاوکراویان هەبوو زوو حازری کردبوو. کابرا کە لە دەرگاکەی دا کوڕەی خستە ناو سندووقە قیرتاوەوە، سەرەکەی قایم کرد خستیە حەوزەکەوە بن ئاو کەوت. کابرا کە هات ئەمجارە تەنانەت عابخانە و کولانە مریشکیشی نەهێشت، هەمووی پشکنی. ژنەکە وتی: «ئەمە چییە تۆ چەن ڕۆژێکە دیتەوە ئەم ماڵە ئەپشکنی، چیت لێ ون بووە؟» پیاوە وتی: هیچ. ژنەکە وتی: «بۆچی گرەوێکم لەگەڵ ناکەی؟» وتی: چلۆن؟ وتی: «تۆ لەوبەر حەوزەکەوە، منیش لەم بەرەوە خورما بخۆین و دەنکی خورماکە بە دەم بهاوێژین، هەرکەس دای لەو سندووقیە قیرتاوە، ئەویتر سەد قڕانی بداتێ». وتی: باشە.

ژن و مێرد دەستیان کرد بە خورما خواردن و دەنك هاویشتن، کوتوپڕ ژنەکە لێی دا، سەد قڕانی لە مێردەکەی وەرگرت. کابرا ڕۆیەوە بۆ دووکان. ژنە کوڕەی هێنایە دەرەوە سەد قڕان و سەد قڕانە گرەوەکەشی دایە. کوڕە هاتەوە دووکان. زەڕنگەر هات وتی: ئیمڕۆ چووی؟ وتی: «ئای! ئەمڕۆ چووم و کابرا هاتەوە، هیچ جێگا نەما نەیپشکنێ؛ بەڵام بەرەکەت دا ژنەکە منی خستبووە سندووقێکی قیرتاو و خستبوومیە حەوزەکەوە. تەنانەت گرەویشیان کرد، ژنەکە سەد قڕانی لە مێردەکەی بردەوە ئەویشی دا بە من».

کابرا ئینجا وتی: چار نییە بۆم ناگیرێ و هەموو ڕۆژێ سەد قڕانیشم لە کیس ئەچێ. وا چاکە بچم بە ژنبراکانم بڵێم بەڵکە بیکوژن. سێ چوار

ژن‌برای بێ‌حەیا و شەڕانی هەبوو، چوو بۆی گێڕانەوە کە خوشکەکەتان وایە و ماڵی منی بە قوڕ گرت. وتیان: فڵانی ئێمە چلۆن بۆمان دەرکەوێ کە وایە؟ وتی: «من کوڕەکە ئەهێنم، ئەگەر هەموو قسەکانی گێڕایەوە ئیتر قسەتان ئەمێنێ؟» وتیان: نەء. گورج زەڕنگەر هات وتی: برا ئەم ئێوارەیە نانم بۆ دروست کردووی بچینە ماڵی ئێمە، لەوێ دانیشین. ئێوارە نانیان خوارد. ژنەکە بیستی کە مێردەکەی لە ماڵی براکانیە، ئەویش هات.

شەو زەڕنگەرباشی وتی: «خزمینە! ئەم کوڕە زۆر دەوڵەمەند بوو، هەژار کەوت. لە پاشا خوا دەرووبەکی چاکی لێ کردەوە. ئا توخوا میرزا، کە هاتی من ئەنگوستیلەکەم لێ کڕی و ڕۆیشتی ژنە جوانەکە بانگی کردی، بۆمان بگێڕەوە هەتا ئیمڕۆ چیت دیوە؟» کوڕە وتی: «فڵانی کە هاتم بڕۆم، گەیشتمە بەر ماڵێك، ژنێکی جوان ناوی فڵان بوو، بانگی کردم، منیش چوومە ژوورەوە کەیف و ئاهەنگێکی زۆرمان کرد و ڕۆژی سەد قڕانی بۆ بڕیمەوە».

ئیتر هەموو حەکایەتەکەی گێڕایەوە هەتا گەیشتە سەر سندووقە قیرتاوەکە. کە ژنەکە لە هۆدەیەکی‌ترا گوێی ڕاگرت ئەوا کابرای دۆستی حەکایەتی ئەوان ئەکا. کوڕێکی چوار ساڵی هەبوو ناردیە لای پیاوەکان. کوڕە چووە بەردەمی زەڕنگەر وتی: «بابە، دراو!». میرزا کە تەماشای کرد کوڕی ژنەکەیە و بە زەڕنگەر ئەڵێ: بابە ئەمجا تێگەیشت کە مەسەلە چییە، وە ئەوانیش لە باسی خورما هاویشتنی سندووقەکەدا بوون، وتی: «کە ژنەکە دەنکە خورمای هاویشت دای لە سندووقەکە ئیتر من خەبەرم بووەوە!». ئینجا ئێوە ئەگەر تەعبیری ئەم خەوە ئەزانن بیفەرموون.

زەڕنگەر وتی: چی؟ خەوی چی؟ میرزا وتی: «ئەی ئەمڕۆ بۆ خۆتم نەگێڕایەوە کە خەوێکی وام دیووە، تۆش بە منت فەرموو: سێ چوار

ڕەفێقم هەیە تەعبیر ئەزانن بۆ ئەوانی بگێڕەوە؟ ئەوا بۆم گێڕانەوە».

ژن‌براکانی وتیان: «سەگبابی تازە پێ‌گەیشتووا! تەماتە بوختان بە خوشکەکەمان بکەی؟» کابرای زەڕنگەر ئیتر دەمی بوو بە تەڵەی تەقیوەوە و هیچی بۆ نەمایەوە.

**٢٠٣.** کابرایەکی کورد مێگەلە مەڕێکی هەبوو خۆی شوانییەکەی ئەکرد. ژنێکیشی هەبوو «حەبێ»ی ناو بوو، ڕۆژی کوڵابوو بە دەستیەوە. ئێواران ڕانەکەی درەنگ ئەهێنایەوە، ژنە دارێکی لێ هەڵئەگرت و ئەهاتە وێزەی؛ ئەیوت: بۆچ درەنگ ڕانت هێناوەتەوە. زوو ئەیهێنایەوە دیسان تێی بەرئەبوو ئەیوت: بۆچ زوو هێناوتەتەوە؟ کابرا سەری لێ تێك‌چووبوو نەیئەزانی چی بکا.

ساڵێك دوو ساڵ، بەم جۆرە بە تێ‌هەڵدان ڕایبوارد. هاوڕێیەکی هەبوو، ڕۆژێك پێی وت: ئەرێ برا من ساڵ دوانزە مانگەی خوا، تۆ ئەبینم پەژارە دایگرتووی. چیت لێ قەوماوە؟ ئەویش وتی: برا، چیت پێ بڵێم، حاڵم بە دەست ژنەکەمەوە پەرێشانە و بە جارێ دنیای ڕووناکی لێ کردوومەتە شەوی تارێك و بە هیچ جۆر ڕزگارم نابێ. هەموو کارەساتی بەینی خۆی و ژنەکەی بۆ گێڕایەوە. ئەویش وتی: چاری ئاسانە. من تەگبیرێکت بۆ ئەکەم، ئەگەر وابکەی ڕزگارت ئەبێ لە دەستی. وتی: بە قوربانت بم! کوا چارێکم بکەی؟ ئادەی پێم بڵێ.

پێی وت: سبەینێ لە وەختا ڕانەکە بەرەوە، ژنەکەت لێت تووڕە ئەبێ ئەڵێ: بۆچ زوو ڕانەکەت هێناوەتەوە؟ تۆش بڵێ: ژنەکە دەنگ مەکە ئیمڕۆ لە دەمی ئێوارەدا لە فلانە ئەشکەوت خەزنەیەکی ئاڵتوونم بەرچاو کەوت، زوو ڕانەکەم هێنایەوە بۆ ئەوە لە وەختا بنووم و بەیانی پێش

مەلا بانگدان تاریك و لێڵە هەستم کەسم پێ نەزانێ بچم دەری بێنم. ئینجا ئەو کە گوێی لە ئاڵتوون ئەبێ، پێت ئەڵێ: ئەبێ پێکەوە بچین. تۆش بێنە لەگەڵ خۆتی بەرە لەوێ بیخەرە ئەشکەوتەکە و خۆت بگەڕێوە. بەم جۆرە لە دەستی ڕزگارت ئەبێ.

کابرا وەکوو هاوڕێکەی پێی وت، بەو جۆرە ئێوارێ زوو ڕانەکەی هێنایەوە، ژنە قیژانی بە سەریا ئەوە بۆچ زوو هاتوویتەوە؟ کابرا قسەی بۆ گێڕایەوە. ژنە وتی: «بێ فەڕی وا و وا لێ کراو، چۆن هەر خۆت ئەچی؟ ئەبێ منیش بێم. ئەتەوێ بچی خەزنەکە دەربێنی و لە منی بشارییەوە. وەڵڵا! ڕۆحیشت دەر بچێ ئەبێ پێکەوە بچین. کابرا وتی: باشە ئافرەت ئێستە من چیم وتووە!

ئەو شەوە هەر پەت و گوریسێکیان هەبوو هەموویان کۆ کردەوە و بەیانی لەپێش مەلا بانگدانا لێیان دا ڕۆیشتن تا گەیشتنە سەر ئەشکەوتەکە. ژنەکە وتی: کە ئەچمە خوارەوە بە ئارەزووی خۆم ئاڵتوون دێنمە دەرەوە، تۆ لێی نازانی. پیاو هێنای چەند گوریسێکی پێکەوە بەست و سەرەکەی لە ناوقەدی ژنەکە قایم کرد و دایهێشتە خوارەوە. دوو سێ گوریس ڕۆیشت، ئینجا خەنجەری دەرهێنا، گوریسەکەی بڕی و ئافرەت کەوتە خوارەوە. ژنە لە خوارەوە بانگی کرد پیاوەکە من کردبێتم تۆ نەتکردبێ. پیاوە وتی: «بڕۆ سەگباب! خۆ تۆ ئەمە چەند ساڵە منت کوشت». ئیتر لێی دا گەڕایەوە.

ئەم ئەشکەوتە هی دێوێك بوو. ئێوارە کە دێوە هاتەوە، حەبێ چوو بە لایەوە و تەفرەی دێوەکەی دا کە نەیخوا. دێوە هەرچەندە بۆڵەبۆڵی کرد حەبێ گوێی نەدایە و سازی کرد، ئیتر دێوە بە هەرجۆر بوو، ڕاهات و گوزەرانی سەگمەرگی لەگەڵ حەبێدا ئەکرد. حەبێ تەنگی بەویش هەڵچنی.

زۆری پێ نەچوو دەنگ بڵاو بووەوە کە کچی پادشا شێت بووە و پادشایش هەر ئەو کچەی هەیە. هەرچەن لەگەڵی خەریك بوون چاك نەبووەوە. جاڕیان دا بە وڵاتا هەرکەس ئەم کچە چاك کاتەوە پادشا کچەکەی لێ مارە ئەکا؛ بەڵام ئەگەر یەکێ وتی: چاکی ئەکەمەوە لە پاشا نەیکردەوە لە سەری ئەدەن.

ڕۆژێك دێوە هات بەلای شوانەی مێردی حەبێوە وتی: «فڵانی، تۆ چەند ساڵێك جەزرەبەت کێشا بە دەست حەبێ گیانەوە، لە پاشا کردت بە تووشی منەوە و خۆتت ڕزگار کرد. ئێستە منیش وەڕز بووم و دەبێ دەشت بگرمە بەر سەری خۆم هەڵگرم بە دەست حەبێوە. کچی ئەم پادشایە من خۆمم پێشان داوە، بۆیە شێت بووە. ئێستە من ناچارم لەبەر حەبێ گیان، ئەبێ ئەم وڵاتە بەجێ بێڵم. کە بەجێم هێشت لە بەرچاوی کچە لائەچم و کچە چاك ئەبێتەوە. جا تۆ هەستە بچۆرە لای پادشا بڵێ: من چاکی ئەکەمەوە با لێت مارە کا و تۆزێ بحەسیتەوە؛ چونکە من ئەزانم بە دەست حەبێوە چیت چێشتووە. بەڵام هەر ئەم جارە ئەم ئیشەت لەگەڵ ئەکەم، ئەوا پێت ئەڵێم ئەگەر جارێکی کە یەکێکی کە شێت بوو هاتنە لات و تۆش چوویتە سەری، ئەوا ئەتکوژم. کابرا وتی: دێوە پیاوی چاك بە، من لە پزیشکیم چی؟ وازم لێ بێنە با بە شوانی خۆمەوە ڕابوێرم. من هەر لە دەست حەبێ ڕزگارم بووە بەسمە، هیچم ناوێ، بۆچی سەرم بە فەتارەتا ئەدەی؟ ئەگەر مەبەستت لەناو بردنمە هەر خۆت بمکوژە و مەمدەرە دەست پادشاوە.

دێوە وتی: مەترسە ئەمەوێ چاکەت لەگەڵ بکەم، هەڵسە بچۆ، بەڵام ئەگەر جارێکی کە بچیتە سەر یەکێکی تر بێگومان بە کە ئەتکوژم.

کابرا ناچار هەندێ شووشە و تەپوتۆزی خستە ناو خورجێکەوە و بە

ترس و لەرزەوە ڕووی کردە کۆشکی پادشا و وتی: من پزیشکم و هاتووم کچی پادشا چاك ئەکەمەوە. پادشا بانگی کردە لای خۆی و پێی وت: کوڕە ئەگەر چاکی نەکەیتەوە لە سەرت ئەدەم. وتی: باشە و قاقەزیان بۆ یەك نووسی ئەگەر کچەکەی چاك کردەوە پادشا لێی مارە بکا، ئەگەر چاکیشی نەکردەوە لە سەری بدەن.

لە پاشا کچەکەیان کردە ژوورێکەوە و کابرا بە لایەوە سەیری کرد دێوەکە لەوێیە. هەروا بە درۆ تۆزێ خۆڵومۆڵی لە شووشەکە دەرهێنا و کردیە ناو ئاو و هەڵیسوو لە لەشی کچەکە و هەندێ دەموپلیشی پێکا دا گۆیا دوعای بە سەرا ئەخوێنێ. لەو کاتەدا دێوەکە بە کابرای وت: «بە دوعا» و ڕۆیشت و خۆی لەبەر چاوی کچەکە ون کرد، کچە چاك بووەوە و بوو بە شایلۆغان و زەماوەن. لە پاش بەینێك پادشا کچەی لە کابرا مارە کرد و ئیتر کابرا کەوت بەسەر خەزنە و خێروبێردا.

یەك دوو ساڵێکی پێ چوو، پادشایەکی دراوسێی ئەم پادشایە هەبوو ـ کە لە وڵاتێکی‌تر بوو ـ ئەویش تاقە کچێکی هەبوو شێت بوو. تومەز دێوەکە لە دەس حەبێ هەڵاتووە و چووەتە ئەو وڵاتە خۆی بەو کچە نیشان داوە و ئەویش شێت بووە.

هاتن لەم پادشایە پاڕانەوە کە ئەبێ زاواکەت ئەم کچەی ئێمەش چاك کاتەوە. پادشا ڕووی نا لە کابرای شوانەی زاوای وتی: ئەمانە دراوسێمانن، ئەبێ بچیت و کچەکەیان چاك بکەیتەوە. کابرا وتی: بۆ خاتری خوا وازم لێ بێنن، من هیچ نیم و ئەم ئیشانە ئیشی من نین. ئەم زۆری وت و ئەوان کەمیان بیست، لە ئاخرا هەستا چووە ماڵەوە، وەسیەتی خۆی کرد و خورجەکەی هەڵگرت و لێی دا ڕۆیشت بۆ ماڵی پادشاکەی‌کە.

چووە ژووری کچەکە، تەماشای کرد وا دێوە لەوێیە. دێوەکە وتی: «ها،

وا و وا لێ کراو! پێم نەوتی من هەر تەنها یەك جار ئەوەت لەگەڵ ئەکەم؟ ئەگەر جارێکی کە بچیتە سەر یەکێکی تر ئەتکوژم، ئێستە ئیتر چۆن هاتوویت بۆ ئیرە؟»

ئەویش وتی: «قوربان! خۆ ئەوە نەهاتووم ئەم کچە چاك بکەمەوە». وتی: ئەی بۆچی هاتووی؟ وتی: «هاتووم بۆ ئەوە عەرزت بکەم کەوا حەبێ لەبەر قاپی ڕاوەستاوە». دێوەکە گوێی لە ناوی حەبێ بوو، وتی: «کوا بۆ خاتری خوا!» ئەمەی وت و لە ترسانا بۆی دەرچوو. کە ئەو نەما کچەکەش بۆ خۆی چاك بووەوە. (ئەمە کەتنی حەبێ گیان کە تەنانەت دێوەشی بەزان).

٢٠٤. کابرایەکی کورد ژنێکی ناهەمواری هەبوو، بە دەستیەوە هاتبووە تەنگ، وێڵی و بێئەقڵی ئەو ژنە دنیای داگرتبووەوە. کابرای مێردی بە دەستیەوە تووشی دیق و زیق هاتبوو، هیچ چارێکی نەدیەوە تەنها ئەوە نەبێ سەری خۆی هەڵگرێ و ڕوو بکاتە وڵاتان.

ڕۆژێك پێی وت: «ئافرەت! خۆ تۆ دنیات لە من هێنایە تەنگ، سەرت لە من تێك داوە، نازانم هەموو ژنێ وایە یا هەر تۆ تاقە ژنیت، ئەوا ئەڕۆم؛ یا ئەمەتە جارێکی کە نایەمەوە، یا ئەمەتە ئەم مەراقەم لە دڵ دەرئەچێ». ئەمەی وت و لێی دا ڕۆیشت.

چەند ڕۆژێك بەبێ وچان دەشتی گرتە بەر؛ ڕۆژێك گەرمای نیوەڕۆ بوو، تووشی کانی و سەراوێك هات، دارگوێزێکی بە سەرەوە بوو. هیلاك و ماندوو، برسی و تینوو ئاگای لە دنیا نەبوو، لەسەر کانییەکە سەری کردە سەر بەردێك و لێی نووست. ئەم کانییەش کانی ژنان بوو. زۆری پێنەچوو دەستە ژنێك بە گۆزە و کونەوە هاتن بۆ ئاو. کابرا لە

دەنگە دەنگی ئەوان خەبەری بووەوە. یەکێك لە ژنەکان وتی: «هەیرۆ! ئەو پیاوە وا دیارە غەریبە، وا لێرە کەوتووە».

کابرا سەری ڕاست کردەوە و زۆر تووڕە بوو لەوە کە ژن لێرەش نایەڵن تۆزێ بحەسێتەوە. ژنەکە هات بە لایەوە وتی: «کاکە برا! ڕەنگە غەریب بیت وا لێرە کەوتووی؛ توخوا لە کوێوە هاتووی؟» کابراش لە داخی خۆی وتی: «ئەرێ وەڵڵا خوشکم غەریبم؛ لە جەحەنەمەوە تازە هاتووم». ژنە وتی: «ئۆ! لە دەورت گەڕێم، توخوا برا هیچ ئاگات لە حەمەعەلی برام هەیە؟» کابرا وتی: هەیرۆ! بۆچ ئەوە برای تۆیە؟ ئەرێ وەڵڵا زۆر چاك ئاگام لێیە. لە بەیانییەوە تا ئێوارە وا لە ژێر لیس و دارا لێی ئەدەن و شرپیان کردووە». ژنە وتی: «هەیەرۆ! بۆچ لێی ئەدەن؟» وتی: «وەڵڵا! نازانم؛ ملیان گرتووە ئەڵێن هەزار قرِان قەرزاریت، لەسەر ئەوە لێی ئەدەن، ئەویش نیەتی بیداتەوە وا ئەوە جەستەیەتی!». ژنە دەستی کرد بە گریان و شین و شەپۆڕ؛ وتی: «ئەی برا، خوشکت کوێر بێ، وا وات لێ ئەکەن».

ئینجا ڕووی کردە کابرا وتی: «براله! وە قوروانت بم تۆ ئەچیتەوە بۆ ئەوێ؟» وتی: «ئەی چۆن؟ وتم تۆزێ لێرە بحەسێمەوە و ئەو وەختە بڕۆم». ژنە وتی: «وە قوروانت بم خۆ ئێستە هیچم پێ نییە تەنها ئەم بانسەر و لاگیرە و تاکە تارانییانەی سەر سەرم نەبێ؛ ئەویش نازانم چەندە. ئەگەر بتدەمێ بۆی ئەبەی؟» کابرا وتی: بۆی ئەبەم، بەڵام بیبژێرە بزانە چەندە ئەگەر هەزار قرِان پڕ نەکاتەوە کەڵکی نییە.

ژنە بەر بووە سەر و پۆتەڵاکی خۆی، هەمووی دارِنی و بژاردی سەیری کرد هەمووی پێنجسەد قرِانە.

بە کابرای وت: «بە قوربانت بم ئەمە پێنجسەد قرِانە چیم لێ ئەکەی؟» کابرا وتی: «قەیدی نییە بمدەرێ، من خۆم ئەبم بە زامنی پێنجسەد

قڕانەکەی‌تر، ساڵێکی‌کە دێمەوە ئەم شوێنە تۆ پێنجسەد قڕانەکەم بۆ بێنەوە». ژنەکە وتی: «ئۆ لە دەورت گەڕێم بەسەرچاو هەرکە هاتییەوە بۆ ئێرە پێنجسەد قڕانەکەی‌کەشت بۆ جێبەجێ ئەکەم». کابرا پارە و هەیاسە و لاگیرەی لە باخەڵی توند کرد و تێی تەقان، بەڵام چۆن تێ‌تەقانێك!.

ژنە بە خۆشی خۆشی گەڕایەوە بۆ ماڵەوە کە برای لە دەست لێدان و شەرەشەقی جەحەنەم ڕزگار کردووە. کە چووەوە مێردەکەی سەیری کرد، ژنە وەکوو مریشکی ئاوەڕووتکراوی لێ هاتووە. وتی: ئەرێ کچێ ئەوە کوا تەوقە سەر و لاگیرە و تاکە تارانییەکانی سەر سەرت؟ وتی: «ئۆ پیاوەکە! ئێستە لەسەر کانی ژنان تووشی پیاوێك بووم لە جەحەنەمەوە هاتبوو؛ خەبەری حەمەعەلی برام لێ پرسی. وتی: شەو و ڕۆژ لەوێ کەوتووە لێی ئەدەن لەسەر ئەوە کە هەزار قڕان قەرزارە و نیەتی بیداتەوە. منیش هەموو تەوقەسەر و لاگیرەکەی خۆمم دایە کە بۆی بەرێت و ڕزگار بێت لەو لێدانە. هینەکانی منیش تەواوی نەکرد، پێنجسەد قڕانی‌تری مایەوە ـلە دەوری گەڕێم!ـکوڕەکە کوردێکی نەجیم بوو، وتی: خۆم ئەبم بە زامنی پێنجسەد قڕانەکەی‌تری. ساڵێکی‌کە هاتمەوە بۆ ئێرە بمدەرەوە».

پیاوەکە ئەمەی بیست، چووە تاسەوە وتی: ژنە خوا بتگرێ کەتنی وات نەدابێ؟ لە کوێوە ڕۆیشت؟ ئا ئەو ماین و تفەنگەم بۆ بێنە.

کابرا سوار بوو بە چوار ناڵە کەوتە شوێن کابرا. ها لێرە، ها لەوێ، لە دوورەوە لە نزیك ئاواییەك بەدی کرد و پێی لێ هەڵگرت. کابرای‌تریش ئەیزانی ئەم کەتنە کە گێڕاویەتی هەروا بە هیچە بەسەر ناچێ، کەسوکاری ئەم ژنە هەر دێن بە شوێنیا، ئەویش چاك ئەڕۆیشت و جارجاریش لای ئەکردەوە بزانێ کەس بە شوێنیەوەیە. ئەو جارە لای کردەوە سەیری کرد وا سوارێك لە دوورەوە تۆز ئەکا، زانی کە ئەمە بەشوێن ئەوا ئەیکوتێ.

کابرا خێرا خۆی کرد بە ئاواییەکەدا، تەماشای کرد وا پیاوێك لە پێچاڵێکا دانیشتووە جۆڵایی ئەکا. ڕووی کردە جۆڵا و چوو بە لایەوە وتی: «مامەی جۆڵا! چاوت لێیە ئەو سوارە لە دوورەوە چۆن بە تاو دێت؟ ئەوە زەفتیەی حوکمەتە ئەگەڕێ بۆ بەندوباو. تازە فەرمانێك دەرچووە بۆ زیادکردنی سولوساتی حوکمەت. ئەوا هات بۆلای تۆ، گەزێکی پێیە هەرچەندە جاوت کردبێ ئەیپێوێ. لە هەموو گەزێکا دوو قڕان سولوساتی حوکمەت زیاد ئەکا، منیش وا بۆ خوا خەبەرم دایتێ».

کابرای جۆڵا وتی: «جا بە قوربانت بم! من چە بکەم؟ من لەم کەسبەما نانی خۆمم دەست ناکەوێ، چۆن ئەتوانم پێچالانەیەکی وا زۆریش بدەم؟» ئەویش وتی: ئیتر ئەوە خۆت ئەیزانی، من هەر ئەوەندە بوو خەبەرەکەم پێ دای؛ لەگەڵ ئەوەشا مادام تۆ ئەوەندە پیاوێکی هەژاری حەز ئەکەی تۆ هەڵسە بچۆرە ئەو ژوورە دانیشە، من کە هات ئەتوانم جوابی بدەمەوە لە پێ‌چاڵەکەدا بۆی دائەنیشم». کابرای جۆڵا هەڵسا چووە ژوورەوە، ئەمیش لە پێچاڵەکە دانیشت.

زۆری پێ نەچوو سوارەکە گەیشتە جێ؛ وتی: ئەرێ کابرای جۆڵا پیاوێکت نەدیوە هاتبێتەوە ئێرە؟ وتی: بەڵێ هاتووە وا لەو ژوورە دانیشتووە. کابرا لە ماینەکەی دابەزی و تفەنگەکەی دانا و چووە لای کابرای جۆڵا. هەرکە ئەو چووە ژوورەوە ئەم هەستا سواری ماینە بۆرە بوو، تفەنگەکەی کردە شانی و تێی تەقان.

کابرا کە چووە ژوورەوە وتی: «ئەرێ کوڕە سەگباب! ئەو لاگیرە و تەوقەسەرە و پارانەت لە ژنەکەم بۆ سەندووە؟» ئەویش وتی: «قوربان! بە سەری تۆ من ڕۆژێ دوو گەز جاو ئەگەر دەر بکەم بەشی نانی خۆم ناکا، ئێستە سولوساتی چیم لێ ئەستێنن؟» کابرا وتی: «کورە گەزی چی

و جاوی چی؟ من چیت پێ ئەڵێم و تۆ چیم جواب ئەدیتەوە؟» وتی: قوربان هەر ئەوەیە کە عەرزت ئەکەم، ناتوانم باجی دوو گەز جاو بدەم.

ئینجا کابرا تێگەیشت کە ئەمە کابرای دەرەوە گوڵی لێ داوە، خێرا دەرپەڕییە دەرەوە، سەیری کرد: ماین و تفەنگەکەی نەماوە و کابرای پێچاڵیش دیار نییە. هەرچەن بە شوێنیا گەڕا هیچ؛ ئیتر گۆلە گۆل بە پێیان دەشتی گرتە بەر و گەڕایەوە بۆ ماڵەوە.

ژنەکەی لێی پرسی: پیاوەکە ئەوە کوا ماین و تفەنگەکەت؟ وتی: «وەڵڵا! ژنەکە تووشی کابرا بووم و باسی حەمەعەلی براتی بۆ گێڕامەوە، منیش ماین و تفەنگەکەم دایە لە باتی پێنجسەد قڕانەکەی‌تر، با بچێ زوو ڕزگاری بکا».

کابرای‌تریش بە پێنجسەد قڕان و لاگیرە و تاکەتارانی و بە ماین و تفەنگێکەوە گەڕایەوە ماڵی خۆی و لەگەڵ ژنەکەیا ڕێ کەوت. وتی: «ژنەکە! کڕنووش بۆ کەریەتی تۆ ئەبەم کە ئەمانەت دەست خستم. خەمت نەبێ من بە هەڵەدا چووبووم تۆ چاکی هەموو ژنێکیت».

**٢٠٥.** ژنێك مناڵێکی هەبوو نابوویە بەر خوێندن. مناڵەکە زۆر بێ‌دڵی دایکەکەی ئەکرد، ڕۆژێك دەستی ئەگرێ و ئەیبات بۆ لای مامۆستاکەی شکاتی لێ ئەکا. مامۆستاکەشی پێی ئەڵێ: ژیر و بە ئەدەب ئەبی باشە، ئەگینە سەگی سەگباب! دایکت وا لێ ئەکەم».

ژنەکەش ئەڵێ: «قوربان! ئەم هەتیوە سەرەخۆرە قسە ناچێ بە گوێچکەیا؛ هەستە چی ئەکەی بیکە، بەڵکوو بە چاوی خۆی بیبینێ و داساکێ».

**٢٠٦.** کابرایەکی «پەڕەکەر» خوشکێکی عازەبی ئەبێ و تۆزێ باری ژیانیان کز ئەبێ. بە خوشکەکەی ئەڵێ: خوشکە با بارکەین

بچینە وڵاتێکی‌تر بەڵکوو خواوەن تەعالا لەوێ ڕزقمان زیادتر بکا. خوشکەکەشی ئەڵێ: برام زۆر چاکە خوا خۆی ئەفەرموێ: ﴿فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ﴾ بچینە وڵاتێکی‌تر لێرە چاکتر ئەبین. سەرمایەی دنیاشیان هەر چەك و کەوان و مێکوتەکە ئەبێ، ئەیگرن بە دەستەوە و ئەڕۆن.

دنیا زستان ئەبێ، زۆر سارد ئەبێ. لە ڕێگەدا لێیان ئەقەومێ و ئەچنە ئەشکەوتێکەوە. سەرما هەر زۆریان بۆ دێنێ لەوانە ئەبن ڕەق ببنەوە. براکە ناچار دێنێ چەك و کەوانەکە ورد ئەکا و ئەیکاتەوە بە ئاگر و لە بەری دائەنیشن. تۆزێ گەرمیان ئەبێتەوە و خۆش ئەبێ. براکە ئەڵێ: ها خوشکە! چۆنە، خۆشە؟ خوشکەکەشی ئەڵێ: برا توخوا واز بێنە «نە دار و نە پەردوو هیچیان نابێتن بە شوو».

**٢٠٧.** کابرایەکی شاری هەبوو دڵی چووبوو لە ژنێك، ئارامی لێ هەڵگیرا بوو، سەودای ئافرەت وای لێ کردبوو لە کار و کاسبی کردبوو؛ نە خەوی هەبوو نە خواردن، زەرد و لاواز و بێ‌تین بووبوو، ئیش و کاری هاتبووە سەر ئەوە لە بەیانییەوە تا ئێوارێ لەو کۆڵانەدا کە ماڵی ئافرەتەکەی لێ بوو، ڕووی ئەکردە کۆشکی ژنە و بەبێ دەنگ و سەنگ ئەوەستا و هیچی‌تر.

ڕۆژێك پیرێژنێکی پۆپ سپی پشت کۆماوە بەوێدا ئەڕوا چاوی بە کوڕە ئەکەوێ، بۆی دەرئەکەوێ کە ئەمە تیری نازی چاوکاڵێك کاری تێ‌کردووە. لێی ئەپرسێ: کوڕی پووری خۆت، ئەوە چی ئەکەی لێرە؟ کوڕە بە هەزار حاڵ دێتە زمان و ئەڵێ: پوورێ وازم لێ بێنە و بچۆ بە ڕێی خۆتەوە. ئەڵێ: کوڕم، ڕازی دڵی خۆت بە پووری خۆت بڵێ چارت

ئەکا. کوڕە هەناسەیەکی پیا دێتەوە و ئەڵێ: پوورێ گیان ئەوی ڕاستی بێ چاوی گەشی چاوکاڵێك بەم دەردەی بردووم. ئەڵێ: ڕۆڵەم کامەتە ماڵەکەی؟ ئەڵێ: پوورێ گیان! ئا ئەوەتە کەوا سەری بردووە بە عاسمانا. ئەڵێ: چی ئەدەی بە پووری خۆت بە مرادی خۆتت بگەیەنێ. ئەڵێ: پوورێ بێجگە لە ماڵی دنیا ئەوا گیانیشم لەبەر دەستایە.

ئەڵێ: ڕۆڵە لە ئێمڕۆژەوە تا پێنج ڕۆژیتر پووری خۆت ئەو ئافرەتەت بۆ دێنێتە ماڵی خۆی. لە ڕۆژی پێنجەما لە فلان سەعات و فلان دەقیقەدا تۆش لەسەر کۆڵانەکەی ئێمە ڕاوەستە دێم بە شوێنتا ئەتبەمە ماڵەوە بە ئارەزووی خۆت لەگەڵی گەمە بکە. ئەوەی منیش ئەمەوێ لە تۆ تەنها مەنێ «پەتك»ـە.

کوڕە وتی: پوورێ گیان! سەر و ماڵم هی تۆیە، پەتك چییە. وتی: لە پەتك زیاتر هیچم ناوێ. کوڕە وتی: پوورێ چۆن ئەڵێی وا ئەکەم. لەسەر ئەم قەول و قەرارە لە یەك جیا بوونەوە.

پوورێ ڕۆیشت لە پێشا «گوجیلە» (تووتەڵە) سەگێکی بچووکی پەیدا کرد و بردیە لای خۆی و گرتیە شیر و شەکر و کولێرە و ڕۆن و خواردنی خۆش. لەولاشەوە تەزبێحێکی دەنك گەورەی سەد دانەیی کردە ملی و سەرپۆشێکی سپی دا بە سەریا و بە لەرزە لەرز دەم بە «سبحان اللّٰه»وە هەستا چوو بۆ ماڵی ژنە.

ژنەکە چاوی هەڵبڕی، پیرێژنێکی نوورانی دەم بە تەسبیحاتەوە هاتە بەرچاو. هەستا چوو بە پیریەوە و بە خێراتنی کرد و داینا. پیرێژن لەبەر زیکر و فیکر پێی نەئەکرا قسە بکا، تۆزێ قسەی دین و دیانەتی لەگەڵ ژنە کرد و هەستا ڕۆیشتەوە.

تا چوار ڕۆژ بەم جۆرە هاتوچۆی ژنەی ئەکرد و لەولاشەوە ئەوەندەی

هێلکەوڕۆن و کولێرەوڕۆن دابوو بە توتکەکە بە تەواوی خرپنە بوو. لە ناکاو هێنای خواردنی لێ بڕی و هیچی نەدایە. شەو و ڕۆژێ بەم جۆرە گوجیلەکەی بێ خواردن هێشتەوە. گوجیلەی بەستەزمان لە برسانا نووزەی ئەچوو بۆ عاسمان، ئینجا لە ئاخری شەو و ڕۆژەدا ناوساجییەکی بۆ دروست کرد و پڕی کرد لە ئاڵەت و دەلوبییەر و خوێ. ناوساجی لە بەردەم تۆوتەڵەدا دانا. تووتەڵە لەبەر برسیەتی نەیپەرژایە سەر توونی و تیژی ناوساجییەوە، هەمووی خوارد. کە لێ بووەوە لە پاش تۆزێك لەبەر تیژی و سوێری ناوساجی خوڕخوڕ ئاو بە چاوی تووتەڵە سەگا ئەهاتە خوارەوە.

ئینجا پیرێژن تووتەڵەی خستە شوێن خۆی و چوو بۆ ماڵی ژنەکە. لەلای ژنەوە دانیشت و دەستی کرد بە تەسبیحاتکردن و تووتەڵەکەش لە بەردەمیا کەوت و وا هەر ئاویش بە چاویا دێتە خوارەوە. کە ژنە چاوی بەم گوجیلەیە کەوت وا بەو جۆرە ئاو بە چاویا دێتە خوارەوە پرسی: ئەرێ داپیرە، توخوا ئەو تووتەڵە سەگە بۆچ ئەگری؟

پیرێژن وتی: «ئەی ڕۆ ڕۆڵە! مەڵێ تووتەڵە سەگ. ئۆف ڕۆڵە! لە دەست ستەم خراپەی پیاوا!». ژنە دڵی داخورپا و وتی: بۆچی داپیرە چی بووە؟ پیرێژن بە هێواشی سەری بردە بن گوێچکەی ژنەکەوە (گۆیا بۆ ئەوە تووتەڵەکە نەیبیەت!) وتی: «ڕۆڵە! ئا ئەمە کەوا ئێستە تۆ ئەیبینیت، کچێکی جوانی شۆخوشەنگی باڵا نەونەمامێك بوو؛ گەلێ لەو ڕوومەتە نازك و نازدارەی تۆ جوانتر بوو. (ژنە تۆزێ چووە پێشەوە) پیاوێکی ستەمکار دڵی لێ چوو، ئەویش بە هیچ جۆر دڵی خۆی نەدایە، لە ئاخرا پیاوەکە چووە لای جادووگەر جادوویێکی لێ کرد و خستیە پێستی ئەم تووتەڵە سەگەوە. ئەوا ئێستە ئەبینی لە داخ و دەردا بۆ خۆی ئێش

و کاری بووە بە گریان و زاری. ئەگینە کچی خۆم ئەمە وە نەبێ گوجیلە بێ؛ بەڵام چی ئەکەی لە ستەمی پیاو؟»

ژنە کە گوێیی لەم قسانە بوو وتی: ئەی ڕۆ! داپیرە بە قوربانت بم! چم لێ ئەکەی؟ خۆ منیش پیاوێك دڵی لێم چووە و هەموو ڕۆژێك ئەهات ڕووبەڕووی ماڵەکەمان ئەوەستا؛ بەڵام ئەمە چوار پێنج ڕۆژە نایبینم، ئەترسم ئەویش چووبێ جادوو لە من بکا.

پیرێژن وتی: «ئەی ڕۆ ڕۆڵە! لە دەورت گەڕێم جوان و جەحێڵی، خوا هەڵناگرێ وات بەسەر بێ؛ جا بۆ وات کردووە؟ بە قورعان ئەوە ئەویش چووە جادوو لە تۆ بکا، ئەی هەناسەی ساردم ڕۆڵە بۆ جوانیت!»

ژنە ئەوەندەی‌تر ئاگری تێ بەربوو، وتی: داپیرە بە قوربانت بم چیم لێ ئەکەی؟ چارم بکە.

پیرێژن تۆزێ سەری داخست و سەری بەرز کردەوە وتی: «ڕۆڵە! بەزەییم دێتەوە بە جوانیتا، ناو و نیشانی ئەو پیاوەم بەرێ بزانم بەڵکوو بچم بیدۆزمەوە و نەیەڵم جادووەکە بکا و بۆتی بێنم. بەڵام چی ئەکەی بە خەڵاتی داپیرەی خۆت؟» ژنە وتی: داپیرە گیان! سەر و ماڵم هی تۆیە، چیت ئەوێ ئەتدەمێ هەر بەو مەرجە ڕزگارم کەی. پیرێژن وتی: ڕۆڵە! هیچم ناوێ تەنها مەنێ «پەتك» نەبێ. ژنە وتی: ئەی ڕۆ پووری گیان مەنێ پەتك چییە، من ئەڵێم سەروماڵم هی تۆیە. وتی: لە مەنێ پەتك زیاتر هیچم ناوێ.

بەم جۆرە ڕێ کەوتن و ئینجا بە ژنەی وت: ماڵەکەی ئێوە جەنجاڵە هەستە با بچینە کولانە شڕەکەی من. هەر ئێستە پیاوەکەت بۆ ئەدۆزمەوە و بۆت ئەهێنم. ژنەکەش وتی: جا خۆ پووری گیان مێردەکەم بە کاروان چووە، کەسی‌تریشمان لە ماڵا نییە. وتی: نا، هەر ماڵەکەی ئێمە باشترە

بەڵام ئەبێ بێ دڵی نەکەیت.

ژنە جلی جوانی لەبەر کرد و خۆی تاسولووس دا و هەستا شوێن پیرێژن کەوت و چوون بۆ ماڵی ئەوان و ژنەی لە ژوورەوە دانا و خۆی چوو بە شوێن کوڕەکەدا. ئەوا ئەو وەخت و سەعاتەش هاتە پێشەوە کە لەگەڵ پیاوەکەدا بەستبووی.

کە ئەچێتە دەرەوە هەرچەندە ئەملا ئەکا و ئەولا ئەکا کابرا دیار نییە، نازانێ عەرز قووتی دا عاسمان هەڵیکێشا. ئێستە و ئەوساش بەرچاوی نەکەوت و نەیدۆزییەوە. خەمی مەنە پەتکی ژنەکەی لێ هات کە لە کیسی ئەچێ. لەو کاتەدا سەیری کرد وا پیاوێکی تۆزاوی شاڵ و پێتاوی پێچاوە و لە دوورەوە هات، دیار بوو کە لە ڕێگەیەکی دوورەوە هاتبوو، چوو سەری ڕێی پێ گرت و وتی: «کاکە برا وا دیارە لە ڕێگەیەکی دوورەوە هاتوویت و دەمێکە لە ماڵ و منالی خۆت براوی. وەرە با بچینە ماڵی ئێمە نازك و نازدارێکی لێیە، نە بخۆی و نە بکەی، هەر تەماشای سای گەردنی کەی. ئەم نازدارە قەیرانێکی لەسەر بووە و قەیرانەکەی تێ پەڕیوە. ئێستە نەزری کردووە یەکەم کەسێ کە لە دەرەوە هاتە ناو شارەوە چەن سەعاتێك لەگەڵی ڕابوێرێ. ئەوا تۆ یەکەم کەس بوویت هاتیت، ئەم هەلە لە دەست خۆت بەر مەدە». ئەوەندەی ڕست بۆ پیاوەکە تا پیاوەکەی هەڵخلەتان و لەگەڵ خۆی هێنایە ماڵەوە.

کە چوونە ژوورەوە لەولاشەوە ئافرەت بە تەمای شتێکی‌ترە. سەری بەرز کردەوە زۆر جوان ورد بووە و تەماشای کرد ئەمە مێردەکەی خۆیەتی. قیژانی و هاواری کرد، وتی: ئای خەڵکینە! ئەم مێردەی من بەنەوخۆین پیسی ئەکا و بە شوێن ئیشی خراپا ئەسووڕێتەوە؛ ئەوا بۆم دەرکەوت کە هەرشتێکم بیستووە ڕاستە.

پیاوەش کە سەیری کرد ئەمە ژنەکەی خۆیەتی واقی وڕ ما؛ وتی: ئافرەت! ئافرەتی چاك بە ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ ئافرەت وتی: خوا یەکە و نەبووە بە دوو من تۆم ناوێ تۆ پیاوێکی خراپی. خەڵکی هەر بە منیان ئەوت مێردەکەت بە شوێن شتی خراپا ئەسووڕێتەوە من بڕوام نەئەکرد، هەتا ئێستە ئەمزانی کە تۆ دێیتەوە هاتمە ئێرە و وتم: ئەبێ ئەم مێردەی خۆم تاقی بکەمەوە، ئەم پیرێژنەم ناردە سەر ڕێت ئەوا تۆیش جوان و پوخت شوێنی کەوتیت و هاتیت، دیارە لە ئیشی خراپ ئەگەڕێیت؛ ئەگینە ئیشت چییە دێیتە ئەم شوێنە. ئەوا من بە چاوی خۆم چاوم پێت کەوت و تاقیتم کردەوە. من مێردێ کە بە شوێن شتی خراپا بسووڕێتەوە نامەوێ.

کابرای هەناسە سارد هەر خواخوای ئەوەی بوو ژنەکەی بێدەنگ بێ و حەیای نەچێ، بە هەزار ناری عەلی تا ڕێکی خستەوە.

**۲۰۸.** مەلایەك هەبوو شار بە شار ئەگەڕا مەکری ژنانی ئەنووسییەوە کە بیکا بە کتێبێك. ڕۆژێ ڕێی کەوتە شارێك؛ ژنە بازرگانێك بیستی کە ئەم مەلایە هاتووە و ئیشی ئەوەیە. دۆزییەوە ناردی بە شوێنیا، بۆ پاش نیوەڕۆ هێنایەماڵەوە لێی پرسی: مەلا هەتا ئێستا چیت نووسیوە لە مەکری ژنان؟ مەلاش وتی: خانم هیچ نەماوە نەینووسم و دوو سێ سەرگوزەشتی بۆ هەڵ دا. لە پاشا ژنە وتی: سبەینێ بەڵکوو بۆ نیوەڕۆ بێییت بۆ ئێرە برایەکم لە وڵاتێکی دوورە، کاغەزێکم بۆ بنووسە بۆی، قاوەڵتییەکەشت لێرە بکە. مەلا وتی: باشە و لێی دا ڕۆیشت.

ژنە ئێوارە لەگەڵ مێردەکەیا چەڵەمەشکێنەیان کرد لەسەر دەستێ جلی گروونی. بەیانی مێردەکەی چوو بۆ دووکان ژنە دەستوبرد مریشکێکی

سەر بڕی و مەنجەڵێ قوبووڵیشی لێ نا. مەلا هات؛ وتی: مەلا ئەوا قاوەڵتییەکی نایابم بۆ دروست کردووی، کاغەزەکەم بەم جۆرە و واو وا بۆ بنووسە هەتا نانەکە پێ ئەگا. لەولاشەوە چوو منداڵێکی دراوسێی نارد وتی: بە هەڕا کردن بچۆ بە مێردەکەم بڵێ: شتێکی خراپ قەوماوە هەر ئێستە بگەڕێتەوە بۆماڵەوە.

ئینجا دەرگای داخست و لە تەنیشت مەلاوە دانیشت. کاتێکیان زانی یەکێ زۆر بە پەلەپەل لە دەرگاکەی دا؛ ژنە بانگی کرد: کێیە؟ وتی: وەرە دەرگا بکەرەوە، دەی. ژنە مستەکۆڵەیەکی لە سنگی خۆی دا و وتی: «ئەی ڕۆ! ئەوا مێردەکەم هاتەوە. خوا ئەزانێ ئەوەندە دڵی پیسە هەر نەبێتەوە. چاوی بە توولەیەك بکەوێ هار ئەبێ، ئێستە چاوی بە ئێمە بکەوێ بە خەنجەر هەردووکمان شەق و پەق ئەکا».

مەلا وتی: بۆ خاتری خوا خۆت چارێ بدۆزەرەوە؛ وتی: «مەلا، چار هەر ئەوەیە بچیتە ناو ئەو سندووقە گەورەیەوە و نەفەس لە خۆت ببڕی». مەلا وتی: باشە و گورج چووە سندووقەکەوە، ژنە قوفڵێکی لە سندووقەکە دا و کلیلەکەی نایە گیرفانی و ڕایکرد بۆ قاپی. قاپی کردەوە و مێردەکەی هاتە ژوورەوە و وتی: ئەوە چی قەوماوە؟

ژنە وتی: «لەمە خراپتر چی بقەومێ؟ هەی ڕۆ، هەی ڕۆ! ئینجا ئەم حسمەتە لە کوێ بێنمەوە؟ مێردەکەی وتی: چی بووە زوو پێم بڵێ دڵم تەقەی کرد. وتی: پیاوەکە، دوێنێ مەلایەك هاتبوو مەکری ژنانی ئەنووسی، هات لە ڕێی خوادا دوێنێ ئێوارە منیش چەن پوولێکم دایە، کەچی ئێمڕۆش هاتەوە. زەلامێکی ملهوڕ پەلاماری دام و خستمی، دەرپێیەکەمی لەتوپەت کرد. لە هاوارهاواری من ئەو منداڵە دراوسێیە هات بە دوای تۆدا. وتی: ئینجا مەلاکە چی لێ هات؟ وتی: کە تۆ لە

قاپییەکەت دا ئیتر وازی لە من هێنا و چووە ناو ئەو سندووقە گەورەیەوە، منیش قوفڵم لێ دا. ئێستە ئەوەتە لە سندووقەکەدایە.

کابرا خنجەرەکەی هەڵکێشا و وتی: «ئا بدە کلیلەکە». ژنە کلیلی دایە دەستی، کابرا کلیلی نا بە قوفڵەکەوە. ژنە وتی: «های، های نەمانبردەوە؟» و دەستی کرد بە پێکەنین: «بەخوا دەستێ جلی گروونی گوڵباتمانیم ئەوێ!». مێردی وتی: «بۆچی ئەمە مەبەستت لەم بەندوباوە ئەوە بوو کە چەڵەمەشکێنەکەم لێ بەریتەوە؟» ژنەکە پێکەنی وتی: «ئەرێ وەڵڵا!» کابرا کلیلەکەی فڕێ دا و خۆی توورە کرد، وتی: «ئاخر ئەمە ئیش بوو تۆ کردت؟ من ناوکم کەوت». ژنەکە وتی: «قاوەڵتی بکە». مێردەکە وتی: قوزەڵقورت ئەخۆم و بە مۆنێکەوە لێی دا ڕۆیشت.

لە پاش ڕۆیشتنی مێردەکە ژنەکە سندووقەکەی هەڵگرت، کە تەماشای کرد مەلای قوڕبەسەر ڕەنگی پێ نەماوە؛ هەر چاوی زەرد ئەچێتەوە. ئینجا پێی وت: «مەلا هەڵسە قاوەڵتی بکە». مەلا وتی: «بۆ خاتری خوا تۆ دەرگام لێ بکەوە بڕۆم، بەخوا قاوەڵتی تۆم ناوێ». وتی: «مەلا! دەسا مەلا تکات لێ ئەکەم ئەم سەرگوزەشتەش بخەرە کتێبەکەتەوە». مەلا وتی: «تۆبە، شەرت بێ بە شەرتی پیاوان ئیتر جارێکیتر باسی ژن نەکەم؛ خۆیان و مەکریان بە گەرووی ئاشا چن».

◈◇◈

# وەڵامی بێ وەڵام

٢٠٩. جارێك «مەولەوی» لە شاری سنە لە دیواخانی «ڕەزاخانی والیزادە»دا دائەنیشێت. والی لێی ئەپرسێت: مامۆستا ڕاست ئەکەن سوختە دەست بۆ ژنی مامۆستایان ئەبەن؟ ئەویش ئەڵێ: «بەڵێ ڕاستە، ئەگەر ژنەکە ڕەزا بێ!». والی قسەکەی پێ خۆش ئەبێ نەوازشێکی زۆری لەگەڵ ئەکا.

٢١٠. کابرایەکی کورد لە سولەیمانی گەماڵێك پەت ئەکا و ئەیبا بۆ خێڵەکەی خۆیان. لەناو شارا کابرایەکی شاگردە قەسابی تووش ئەبێ، پێی ئەڵێ: ها کاکە! ئەوە باوکت بۆ کوێ ئەبەی وا پەتت کردووە؟ ئەویش بەبێ وەستان ئەڵێ: «دایکتی گاوە ئەیبەم غوسڵی دەرئەکەم!».

٢١١. جارێـك سەید ئەحمەدی خانەقا، عەولقاری کوڕی لەبەر دەستیا دانابوو ئەیدوان. «شێخ سالحی مامە» هەبوو ڕووی کردە سەید و وتی: لام وایە دایکی عەولقارت زۆر خۆش ئەوێ؟ سەیدیش کوتوپڕ ئەڵێ: «یا شێخ ئەوەی دایکی عەولقار ئەیدا بە من، ئەگەر تۆ بتدامایە تۆیشم ئەوەندە خۆش ئەویست!».

٢١٢. «شێخ ڕەزا» جارێك لە سولەیمانی تەماشا ئەکا وا ژنێك کچێکی داوەتە پێش خۆی و ڕێ ئەکەن. لێی ئەپرسی ئەڵێ: «خوشکم وا دیارە ئەو جوانو ماینەت داوەتە پێش بەتەڵەبە، بۆ لە منی چاك ناکەی؟»

ژنەکەش ئەڵێ: «باوکی پێی نەوتووم لە کەری چاك کەم!».

٢١٣. «شێخ ڕەزا» جارێك هەر لە سولەیمانی لە کۆڵانێکا تووشی کچێك ئەبێت زۆر بە گورجی ئەڕوا؛ پێی ئەڵێ: «کچم، هێواش بڕۆ با مەقەسەکەت کول نەبێ». کچەکەش خێرا ئەڵێ: «مامە ئەگەر کولیش ببێ بەشی بەرسمێڵی تۆ هەر ئەمێنێتەوە!».

٢١٤. «شێخ ڕەزا» لە دیواخانی وەسمانپاشادا دائەنیشێ و پێکەوە نان ئەخۆن. کوتوپڕ موویەکی لەناو چێشتەکەدا بەر دەست ئەکەوێ و ڕوو ئەکاتە وەسمانپاشا ئەڵێ: «پاشا، ئێوە کە بزنەکانتان ئەبڕنەوە مووەکانیان چی لێ ئەکەن؟» پاشا تێ ئەگا کە چە باسە، ئەڵێ: «یا شێخ ئەیکەین وە هۆڕ و وە گوریس و بە چێشتیشەوە ئەیخۆین!». شێخ ڕەزا ئەڵێ: بەخوا پاشا ترت بڕیم.

٢١٥. «حاجی شوکروڵڵابەگ»ی هەوشار تووشی ژنێك ئەبێ، ئەڵێ: «خوشکم بەینی قوز و قنگ چەندە؟» ژنەش ئەڵێ: «بەگم ئەگەر بەرقلیان لەسەر قوزم بکەیت، بۆ قاوەڵتی ئەگەیتە سەر قنگم!».

٢١٦. «مەلا عەلی قوچەبڵباس»ـی هەبوو، هاتە لام پێم وت: هەر ئەوەندە دانیشە جگەرەیەك بکێشە و لە پاشا بڕۆ. دەستم برد جگەرەیەکم دایە. جگەرەکەی لە تەنیشت خۆیەوە دانا و دانیشت. وتم: بۆچ نایکێشی؟ وتی: «هەروەخت ئارەزووم کرد بڕۆم ئەیخۆم». ئیتر من قسەم بڕا.

٢١٧. کابرایەك ژنێکی زۆر جوانی ئەبێ، کەچی توخنی ناکەوێ. ئەچێ هەتیوبازی بە سەرەوە ئەکا. ژنەکە ڕۆژێ پێی ئەڵێ:

«پیاوەکە تۆ من بەم ناسك و جوانییە وام لە بەردەستا حەیف نییە ئەچی هەتیوبازی ئەکەی؟» پیاوەکەش ئەڵێ: بەخوا ڕاستە ژنەکە تۆ زۆر جوان و نازداری، بەڵام هەرچەن پاڵت ئەخەم و چاوم بە سنگ و بەرۆکت ئەکەوێ، سنگ و بەرۆکی دایکی ڕەحمەتیم ئەکەوێتەوە بیر. لەبەر ئەوە دڵم بڕوایی نادا توخنت کەوم». ژنەکەش ئەڵێ: باشە پیاوەکە! ئەی توخوا لەو وەختەدا کە چاوت بە گەڵوگونی هەتیوەکە ئەکەوێ، گەڵوگونی باوکی ڕەحمەتیت ناکەوێتە بیر؟»!.

**٢١٨.** لە ساڵی (١٩٤٩)دا حزبی دەستووری نووری سەعید لە عێراقا دامەزرابوو. ئەم حزبە خۆشەویستی هەموو کەس نەبوو. لە کۆڕێکا دانیشتبووین باسی ئەو حزبە هاتە پێشەوە، داوودبەگی فەتاح بەگی جاف وتی: «لە کورددا کەس بە قەدەر بەگزادەی جاف پارەی بەو حزبە نەداوە». منیش وتم: «لە کورددا کەس بە قەدر بەگزادەی جاف نەچوونەتە ناو ئەو حزبەوە».

**٢١٩.** ڕۆژێك وەسمان پاشا لە سولەیمانییەوە ئەڕواتەوە بۆ هەڵەبجە؛ لەناو ئاوەکەی «بوارەپان»ـدا تووشی ژنێك ئەبێ کە لە ئاوەکە ئەپەڕێتەوە. تەماشا ئەکا ژنەکە بۆ ئەوەی تەڕ نەبێ، دەرپێکەی داکەندووە. پاشا ویستی بیدوێنێ، سەیری ناولنگی ئەکا ئەپرسێ: «کچێ کوێندەریت و چە کەسیت؟» ژنەکە ئەڵێ: «قوروان سەی سایقیم و دۆمم». ئەڵێ: «بەخوا کەنی! قوزێکی ناشیرینت هەیە، ئەوە بۆچی دەمی وەها شێواوە؟» ئەویش ئەڵێ: «قوروان ئەو ئەرکەی لەسەر ئەوە، ئەگەر لەسەر دەمی تۆ بوایە ددانێکی تێدا نەئەما و لەمە خراوتریشی لێ ئەقەوما».

٢٢٠. حاجی شوکروڵڵابەگی هەوشاری تووشی کابرایەك ئەبێ کەرێکی پێیە. لە کەندەڵانێکا کەرە مانی گرتووە نارِوا، ئەویش پێی ئەڵێ: «برا بیگێ، بیگێ». کابراش ئەڵێ: «ئاخر کەرە نێرە».

٢٢١. کابرایەکی کەچەڵ کە کرێش هەتا مل و لاجانکی هاتبوو، تووشی منداڵێکی دراوسێیان بوو، پێی وت: بەخوا ڕۆڵە دایکت وەختی خۆی جوان بوو، زۆرم حەز لێ ئەکرد، ئاخۆ ئەو هیچ جارێ باسی من ناکا؟ کوڕەکەش وتی: «بەخوا مامە بە سەری تۆ هەموو شەوێ هەتا نیوەشەو هەر باسی سەر و کاکۆڵە جوانەکەت ئەکا».

٢٢٢. کابرایەك ڕۆژێك لە دەشتێکا بە تەنها بە ڕێگادا ئەڕوا باییێکی لێ بەر ئەبێتەوە؛ وە واش ئەزانێ کە کەس بە دوایەوە نییە. خۆی بە خۆی ئەڵێ: «بەهارە، بەهار». نەختێکی تر ئەڕوا و باییێکی‌تر بەر ئەدا. دیسان ئەڵێ: بەهارە، بەهار. کاتێ ئاوڕ ئەداتەوە تەماشا ئەکا زەلامێك لە دوایەوەیە؛ لێی ئەپرسێ: ئەرێ برا تۆ لە کەیەوە لە پشت منەوەی؟ ئەویش ئەڵێ: «دوو بەهاری تەواوە. ئەم بەهارە بیەوە ئەبێ بە سێ بەهار».

٢٢٣. کابرایەکی کورد هەبوو بە منداڵانی ئەخوێند. کوڕێکی سەیدی لا هەبوو جوانکەلە و ژیکەلە بوو. هەموو جار لای دەست خۆیەوە دایئەنا و دەرسی پێ‌ئەوت. کە لێ‌ئەبوونەوە تێر و پڕ ماچی ئەکرد و گەلێ خزمەتی‌تریشی ئەکرد. کابرایەکی دراوسێ هەبوو ئاگای لەم کارەساتە هەبوو، ڕۆژێك پێی وت: ئەرێ ئەوە تۆ بۆچ ئەوەندە ماچی ئەو منداڵە ئەکەیتەوە و هەڵیئەگلۆفی؟ ئەویش وتی: «سەیدە و محەمەدیشی ناوە. منیش مسڵمانم، لەبەر خۆشەویستی پێغەمبەرەکەمان

پێویستە لە سەرم خۆشم بوێ و خزمەتی بکەم!».

ماوەیەکی پێ‌چوو، ڕۆژێک کابرا منداڵێکی‌تری چاوپێ‌کەوت مێزەرەیەکی سەوزی بە سەرەوە بوو؛ بەڵام سەری کەچەڵ و لووتی چڵمن و چاوی کتوکوێر و هەتا بڵێیت ناشیرین بوو. پەلی گرت و هێنای بۆلای مامۆستاکە و پێی وت: ئەمەش سەیدە و هەتیوە؛ دیسان محەمەدیشی ناوە، پێی بخوێنە و خزمەتی کە. مامۆستاش سەیرێکی منداڵەکە و سەیرێکی کابرای کرد و وتی: «برا بۆچ هەر من مسڵمانم؟ خۆ تۆیش مسڵمانی. من هەر خزمەتی یەکێکم پێ ئەکرێ، تۆیش بچۆ خزمەتی ئەوە بکە».

٢٢٤. کابرایەکی کورد تووشی کوڕێکی جوان بوو دانیشتبوو، پێی وت: «توخوا کوڕەکە ئەگەر قنگێم نەدەیتێ». کوڕەش وتی: «بەخوا مامە هەر یەکێکم هەیە، ئەویش خۆم لە سەری دانیشتووم».

٢٢٥. ژنێکی جوان لە سولەیمانی بە کۆڵانێکا ئەڕۆیشت و منداڵێکی پێ‌بوو. کابرایەکی کورد تووشی بوو، پێی وت: «توخوا خوشکم ئەگەر ئەو مناڵەتم نەدەیتێ ماچێکی بکەم!». ژنە وتی: بۆچی وا ئەوەندە دڵت پێ‌چووە و ماچی ئەکەی؟ کابرا وتی: چونکە لەو قوزە دەرهاتووە. ژنە وتی: «کەواتە بچۆ کێری باوکی ماچ کە». کابرا ئیتر دەمی بوو بە تەڵەی تەقیوەوە.

٢٢٦. کابرایەکی کورد چووە لای سەرتاشێک سەری بتاشێ. پیرە سەرتاش هەر کە چەقۆیەکی ئەهێنا بە سەریا لایەکی سەری ئەهێنایە خوارەوە. لە دڵی خۆیا وتی: ئەگەر نەیگرمە قسە ئەم کابرایە لە ئاخرا لێم دێتە دەنگ، هەروا بە دەم سەرتاشینەکەوە قسەی لێ پرسی؛ ئینجا هاتە سەر ئەوە وتی: «ئەرێ کاکی خۆم ئێوە چەند بران؟» کابراش

وتی: «بەخوا کاکی خۆم، ئەگەر من لە دەستت ڕزگارم ببێ، چوار؛ ئەگینە سێ براین!».

٢٢٧. کابرایەکی شەلی قسە زل ڕۆژێك تووشی دەستەژنێکی جوان ئەبێ؛ پیرێژنێك لە پێش دەستە ژنەکەوە ئەڕوا. شەلە ئەپرسێ: پووریێ ئەم جوانانە بۆ کوێ ئەبەی؟ پیرێژن ئەڵێ: ئەیانبەم چاکیان ئەکەم. شەلە ئەڵێ: «پووریێ بە قوربانت بم هەرچەن قاچێکم شەلە بەڵام نێرم». پیرێژن ئەڵێ: «تکات لێ ئەکەم ڕوو زەردم مەکە سوێندیان داوم لە کەری شەلیان چاك نەکەم!».

٢٢٨. کابرایەکی کورد جارێك ڕووەو قیبلە دانیشتبوو دەستی بە ئاو ئەگەیاند. مەلایەك چاوی لێبوو، چوو لێی کرد بە هەرا وتی: «کابرا تەلاقت کەوت، جارێکی کە توخنی ژنەکەت نەکەوی؛ چونکە هەرکە ڕووەو قیبلە میز بکا تەلاقی ئەکەوێ». کابرا ئیتر نەچووە لای ژنەکەی. مەلا لە پاش بەینێ ژنەکەی مارە کرد. کابرا وتی: بەڵکوو هەلێکم بۆ هەڵکەوێ تۆڵەی خۆم لە مەلا بکەمەوە. کوتوپڕ ڕۆژێك بە سەرا چوو سەیری کرد وا مەلا ڕووەو قیبلە دانیشتووە میز ئەکا. وتی: «ئای مەلا، ئەوە ڕووەو قیبلە وەستاوی میز ئەکەی؟ بەخوا تەلاقت کەوت». مەلا وتی: «ڕۆڵە، سەرەکەیم وەرچەرخاندووە».

٢٢٩. جارێك سەید ئەحمەدی خانەقا لە مەلاساڵحی «کۆزەپانکە» ئەپرسێ ئەڵێ: «ئەرێ مەلا! تۆی مەلا ساڵحی کۆزەپانکە؟» مەلا ساڵحیش بە سەید ئەڵێ: «ئەرێ سەید جەنابتی سەید ئەحمەدی عەلی‌عێری؟» (کۆزەپانکە، بە واوی کراوە، گوندێکە لە دەشتی دزەیی مەلا ساڵح خەڵکی ئەوێیە. «عەلی غێر»یش دێیەکە لە دەشتی

کەرکووك هی سەید ئەحمەدی قانەقا بووە، مەلا ساڵح نوختەی غەینەکە لا ئەبا «ی»یێکی موتەکەلیمی پێوە ئەنووسێنێ).

٢٣٠. مەلایەکی حافیز هەبوو هەروەخت ئەچوو بە هەر لایەکدا ئەیوت: خەڵکینە وریا بن بەبێ دەستنوێژ دەستم پێوە نەدەن. کابرایەك وتی: مامۆستا بۆچی؟ وتی: «ئاخر قورئانم لە سنگدایە و بەبێ دەستنوێژیش دروست نییە دەست بە قورئانەوە بدرێ». کابرا وتی: «مامۆستا ئاخر ئەوەش نازانی پڕ ورگیشتە لە گوو!».

٢٣١. کابرایەکی دەوڵەمەندی تڕ زلی بێ چاو و ڕوو، تووشی مەلایەکی خێل ئەبێ، ئەڵێ: مامۆستا ڕاستە ئەڵێن پیاوی خێل یەك بە دوو ئەبینێ؟ مەلا ئەڵێ: بەڵێ وایە. کابرا ئەپرسێ چۆن؟ ئەڵێ: «ئەوەتە ئەڵێن تۆ دوو پێت هەیە، کەچی من بە چوار ئەیبینم!».

٢٣٢. کابرایەکی کوێر ژنێکی هەبوو، ژنەکەی زۆری خۆش ئەویست و هەموو جار پێی ئەوت: پیاوەکە خۆزگا چاوت ئەبوو سەیرت ئەکردم کە من چەندە جوان و نازدارم. لەگەڵ ئەوەش من چەندە تۆم خۆش ئەوێ. کوێرەکەش وتی: «ڕاست ئەکەی ئەگەر ئەوەندە جوان بوویتایە وەکوو خۆت ئەیڵێی، بەر من نەئەکەوتی!».

٢٣٣. کابرایەك ڕۆژێك دەرپێی لە پێیا نەبوو، دانیشتبوو دەعباکەی شۆڕ بووبووەوە. کوڕێکی منالی هەبوو چاوی بە کێری باوکی کەوت پرسی: بابە ئەوە چییە؟ باوکیشی نەیویست پێی بڵێ وتی: ڕۆڵە ئەوە قاچی سێهەممە. وتی: «بابە ئەی پێڵاوەکەی کوا؟» وتی: «ڕۆڵە لای دایکتە!».

٢٣٤. كابرایەكی دەوڵەمەند بوو جلی جوان و پاك و تەمیزی لە بەردا بوو، بەڵام دەستێكی گۆج بوو، سەروچاوی ئاوڵاوی بوو، چاوێكیشی كوێر بووبوو. تووشی كرێكارێكی كورد بوو كە لە قوڕكاری ئەهاتەوە. قاچوقول و دەست و مەچەك و جلەكانی هەموو قوڕاوی بوون؛ كابرای گۆجە وتی: «سەیری ئەم كابرا گەڵوقنگ قوڕاوییە بكەن چەن ناشیرینە». كابرای كرێكاریش وتی: «بەخوا هەقتە؛ بچۆرە ماڵەوە سەیرێكی سەر و ڕوومەتە جوانەكەی خۆیشت بكە و ئەو وەختە ڕەحمەتێك بۆ باوكت بنێرە!».

٢٣٥. ژنێك مێردێكی هەبوو مرد. لە پاش بەینێ لە خەوا چاوی پێ‌كەوت لێی پرسی: پیاوەكە حاڵ و ئەحواڵت چۆنە؟ وتی: زۆر خۆشە. وتی: گوایە لەو زەمانەش خۆشترە كە لەگەڵ منا بووی؟ وتی: هەزار قات. وتی: كەواتە پیاوەكە توخوا تۆزێ باسی بەهەشتم بۆ بكە. وتی: وەڵڵا ئاگام لێی نییە. وتی: بۆچ ئەی تۆ لە بەهەشتا نیت؟ وتی: «نا وەڵڵا! لە جەحەنەمام!».

٢٣٦. جوولەكەیەكی سولەیمانی كووتاڵ فرۆش، بە كۆڵانێكا ئەڕوا چاوی لە بەرپێی خۆی نابێ؛ سەگێ لەسەر ڕێگای ئەبێ. جووە پێ ئەنێ بە قاچی سەگەكەدا. پیاوێكی ئاسووری لە باڵەخانەوە چاوی لێ ئەبێ بانگی ئەكا: «جووە ئەوە بۆچی پێت نا بە قاچی باوكتا؟» جوولەكەكە دەست ئەبا قاچی سەگەكە هەڵئەبڕێ و تەماشای ناولنگی ئەكا ئەڵێ: «كوا؟ خۆ خەتەنە نەكراوە!».

٢٣٧. «ئەحەی كڕنوو» نەخۆش بوو، لە سەرەمەرگا بوو. «خلەی پوورەنازێ» هەبوو لە سولەیمانی چووە لای وتی: ها مامە

ئەحمەد چە خێرتە؟ وتی: بەخوا فلانی نەخۆشم؛ لام وایە ئەمرم. وتی: کەواتە توخوا مامە ئەحمەد ڕاسپێرێکت پێ ئەڵێم بۆلای باوکم پێی بڵێ. ئەحەش ئەڵێ: «بەخوا ئەوی ڕاستی بێ ڕێگەم ناکەوێتە جەحەنەم!».

**٢٣٨.** کابرایەك ئەچێتە شاری کۆیە، هەژار ئەبێ دەست ئەکا بە توور فرۆشتن. ڕۆژێك لە کۆلانێکا بانگ ئەکا: «های توور بە نان، بە پارە، بە برنج، بە ساوەر، بە ترخێنە، بە نۆك، بە نیسك، بە ماش». وا ڕێ ئەکەوێ گەلێ لە پیاوماقوولی شارەکە لە ماڵ پیاوێکی گەورە دانیشتبوون، گوێیان لە توور فرۆشتنی کابرا ئەبێ. بانگی ئەکەنە ژوورەوە ئەیانەوێ سەر بخەنە سەری. ئەپرسن: توورەکەت بە چی ئەدەی؟ ئەڵێ: قوربان، بە هەموو شت. ئەڵێن: «بە گووی ئەدەی؟» ئەڵێ: «ئەگەر بە کێری خۆم دەری بێنم بەڵێ!».

یەکێکیان لێی ئەپرسێ: تۆ خەڵکی کوێیت و ماڵت لە کوێیە؟ ئەڵێ سولەیمانی و ماڵیشم لە گەڕەکی هۆڵییە. ئەڵێ: «ئەرێ ڕاستە ئەڵێن: ژنی هۆڵی هەموو لەبەر دەرگا بەبێ سەرپۆش دائەنیشن تەشی ئەڕێسن و بنێشت ئەجوون؟ هەر پیاوێ بە بەردەمیانا بڕوا تەماشای ئەکەن؟». کابرا ئەڵێ: بەخوا قوربان ڕاستە زۆر بێ شەرمن؛ ئەڵێی هەموو لە ئاوی «حەمامۆك»یان خواردۆتەوە. (حەمامۆك کانییەکە لە کۆیە).

**٢٣٩.** کابرایەك کاغەزێ بۆ دۆستێکی ئەنووسێ، ئەیەویست هەندێ شتی بەینی خۆیانی بۆ بنووسێ، بەلام کابرایەکی تر لە بن دەستیەوە دانیشتبوو سەیری کاغەزەکەی ئەکرد. ئەمیش لەبەر ئەوە قسەکەی نەئەنووسی. ئینجا هەر ئەوەندەی نووسی: «برا سەگبابێك لە بن دەستمەوە دانیشتووە کاغەزەکەم ئەخوێنێتەوە، ناتوانم هیچت بۆ

بنووسم». کابرای بن دەستی وتی: «کورە کابرا بۆچ جنێوم ئەدەیتێ من کەی سەیری دەستی تۆم کردووە؟» ئەویش وتی: «ئەگەر نەتکردووە چۆن ئەزانی جنێوت ئەدەمێ؟».

٢٤٠. ژنە کوردێکی شاری چووە لای دارتاشێك وتی: «بلوێرێکی کچانەم بۆ دروست بکە». دارتاش وتی: ئەندازەت پێیە؟ وتی: نەوەڵڵا! وتی: کەواتە ئەگەر بە قەد هینەکەی خۆم بێ چۆنە؟ ژنەکە وتی: «ئەندازەی پێ ناوێ وەکوو ئەبینم بە قەدەر دەمی تۆ باشە. ئیتر دەمت ئەندازە بگرە و بەو جۆرە».

٢٤١. ژنێك لە حەمام بە ژنێکیتری وت: «دوێنێ مێردەکەت دەستەسرێکی ئاوریشمی ژنانەی جوانی بە دەستەوە بوو». ژنەکە وتی: ئۆف لە دەست ئەم مێردە ناجسنەی من کە چەن چاو لە دەرەوەیە». ژنەکەیتر پرسی بۆچی چاو لە دەرەوەیە؟ وتی: «ئەو دەسەسرە کە تۆ ئەفەرمووی ئاخۆ لە چ ژنێکی بە یادگار وەرگرتووە، چونکە من هیچ دەسەسرێ ئاورێشمم نییە و نەبووە بیدەمێ».

٢٤٢. کابرایەك مەرێك لە شوێنێك ئەدزێ و ئەیباتەوە بۆ ماڵەوە. لەوێ بە ژنەکەی ئەڵێ: ئەچم بۆ شار ئەیفرۆشم و پارەکەی ئەدەم بە شتومەك. مەڕ ئەداتە پێش و دێت بۆ شار. لە نیوەی ڕێگەدا مەڕەکەی لێ ئەدزن. ئەویش ئیتر بە دەستی خاڵی ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، ژنەکەی لێی ئەپرسێ: مەڕەکەت بە چەن فرۆشت؟ ئەڵێ: «وەڵڵا! ژنەکە فرۆشتمەوە بە مایەکەی خۆی».

٢٤٣. سوالکەرێك چووە لای کابرایەك وتی: پوولێکم بەرێ بۆ خوا. وتی: چی‌چی؟ وتی: پوولێکم بەرێ بۆ خوا. وتی: «کەواتە تۆ برۆ من خۆم چاوم پێ ئەکەوێ».

٢٤٤. «شێخ محەمەدی شێخ‌وەسمان» لە دێی «دەکە» لەگەڵ «شێخ‌عومەر» ئەکەونە قسە کردن. ڕوو ئەکاتە شێخ عومەر ئەڵێ: «لە خەوما لەگەڵ سەگا بووم»؛ مەبەستی شێخ عومەر ئەبێ. شێخ عومەریش خێرا ئەڵێ: «فلانی منیش لە خەوما لەگەڵ سەگا بووم و دەوری یەکانەیەکمان دابوو!».

٢٤٥. حەسەن‌بەگی مەنگوڕ ئەچێتە لای حاجی‌عەلیاغای ئێلخانی ئەڵێ: ئای عەلیاغا! تووتکی «دێبوکر»ی چەندە ئەوەڕێ؟ عەلیاغاش ئەڵێ: «حەسەن‌بەگ! هی مەنگوڕ ئەوەڕێ و ئەشگەزێ».

٢٤٦. قادربەگی سلێمان‌بەگ بە عەزیزبەگی ئەوڕەحمان‌بەگی دێبوکری ئەڵێ: «تۆ ئەزانی عەزیزبەگ! من وەجاغم کوێرە؟» عەزیزبەگیش ئەڵێ: «قوربان! بەو قورعانە باوکیشت هەر وەجاغی کوێر بووا!».

٢٤٧. جارێك «موفتی زەهاوی» لە بەغدا لەلای والی دائەنیشێ و لە تەنیشتیەوە ئەبێ و سەرینێك لە بەینیانا ئەبێ. لەو وەختەدا یەکێك لە کوردە فەیلییەکان ئەبەنە لای والی و والی زۆر تووڕە ئەبێ و ئەڵێ: «بریا ئەمزانی بەینی کورد و کەر چەندە؟» خێرا موفتی زەهاوی هەڵئەداتێ ئەڵێ: «تەنها سەرینێك». والی کە لا ئەکاتەوە زۆر شەرمەزار ئەبێ و داوای لێبوردنی لێ ئەکا.

٢٤٨. شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە دیواخانی سەید «عبدالرحمن نقیب» لە بەغدا ئەبێ و نان دائەنێن. لەگەڵ نانەکەدا پڵاویش دائەنێن. بە دەم نانخواردنەوە قسە ئەکەن. دوکتۆرێکی هندیش لەسەر سینییەکە ئەبێ. ئەو قسە لەوەوە ئەکا کە گیا و دار و دەون ڕۆنی لێ ئەگیرێت و ڕۆن و زەیت هەیە. شێخ ڕەزا ئەڵێ: من بڕوا بەم قسەیە ناکەم. دوکتۆرەکە ئەڵێ: چۆن بڕوا ناکەی؟ ئەمە بە تاقیکردنەوە دەرکەوتووە کە وایە.

شێخ ڕەزاش ئەڵێ: «منیش بە تاقیکردنەوە بۆم دەرکەوتووە کە وا نییە، ئەگەر ئەم قسەیە ڕاست بوایە ئێستە ئەم برنجەی ماڵی نەقیب ڕۆنی تیا ئەبوو!».

٢٤٩. لەو کوردەوارییە شێخێك ئەچێتە دیواخانی ئاغایەك سەیر ئەکا هیچیان بۆ نەکردووە. شێخە تووڕە ئەبێ ئەڵێ: بۆچ نان و تفاقتان ڕێك نەخستووە؟ ئاغەش دەست ئەکا بە لە خۆبوردنەوە و ئەڵێ: «یا شێخ! قوربان لێمان ببوورە فریا نەکەوتین، وا بزانە تەکیەکەی خۆتانە!».

٢٥٠. جارێك ئافرەتێك گۆزەیەکی بەسەر شانەوە ئەبێ، تووشی کابرایەکی سەروگوێلاك شکاو ئەبێ، لێی ئەپرسێ: ئەوە بۆچ وای؟ هەموو سەروگوێلاکت شکاوە؟ ئەڵێ: وەڵڵا هەمووی لەسەر قسەی حەق. ئەڵێ: دە لاچۆ، چۆن پیاو لەسەر قسەی حەق سەروگوێلاکی ئەشکێ؟ لەو کاتەدا ژنەکە ئەیەوێ بڕوا کابرا پەنجەیەك ئەکا بە قوزیا ئەڵێ: «توخوا دایکم ئەمە قوز نییە؟» ئافرەتەکە گۆزە ئاوەکە ئەماڵێ بەسەر کابرادا خوێن چۆڕاوگە ئەکا. کابرا ئەڵێ: «من پێت ئەڵێم سەروگوێلاکم لەسەر قسەی حەق شکاوە تۆ بڕوا ناکەی تا بە چاوی خۆت بینیت».

**٢٥١.** جارێك پیاوێكی گەورە بە بازاڕا تێئەپەڕێ، سەیر ئەكا وا پیاوێكی پیری ڕیش سپی سێ چوار دانە كەوچكی «هەڵەدەن»ـی لە دووكانێكا داناوە و بە دیاریەوە كزۆڵەی كردووە. چوو لێی پرسی وتی: «مامە، ئەمە چییە ئەم سێ چوار كەوچكە داتناوە ئەتەوێ چیت لێ دەست كەوێ؟» ئەڵێ: «ئاغە! هۆی ڕزق و نان پەیدا كردنە». ئاغەكە وتی: «كەواتە تۆ بە شوێن نان پەیدا كردنا ئەگەڕێی وەرە لە پشت سەری منەوە بڕۆ هەردوو گونم لە پشتەوە بۆ هەڵبگرە هەموو ڕۆژێ دوو قڕانت ئەدەمێ. ئیتر ئەم ئیشە بۆچ ئەكەی؟».

كابرای ڕیش سپی ئەڵێ: «ئاغەم من شتێكی باشترم بۆ تۆ دۆزیوەتەوە؛ ئەم كەوچكانە من ئەیاندەم یەكی بە دوو قڕان، تۆ وەرە كەوچكێكم لێ بكڕە كلكەكەی بخەرە قنگتەوە هەردوو هێلكەگونیشت بخەرە ناو كەوچكەكە و لێ دە بڕۆ؛ ئیتر بۆچ دێنی ڕۆژی دوو قڕان ئەدەی بە من؟!».

**٢٥٢.** كابرایەك بە ڕووتی چووە حەمامێكەوە، كابرایەكی تر لەوێ بوو كە چاوی بەم كەوت هەردوو چاوی نووقان. پێی وت: ئەوە لە كەیەوە كوێر بوویت؟ ئەویش وتی: «لەو وەختەوە كە خوا حەیای لە تۆ داماڵی».

**٢٥٣.** كابرایەكی كورد بوو بە میوانی ماڵێك، سەیری كرد داری بن میچی ژوورەكە هەموو چركەچركیانە. كابرا بە خانەخوێكەی وت: ئەم دارانە چاك كەنەوە نەوەك شتێك بقەومێ؟ كابرا وتی: هیچ نییە، ئەوە زیكر و فیكری خوا ئەكەن. ئەویش وتی: «ئاخر ئەترسم دڵیان لای خۆیان نەمێنێ و بكەونە سوجدە بردن!».

**٢٥٤.** لە بەغدا لە کۆڕێکا بووین، باسی ئەو کۆبوونەوەیە کرا کە حکوومەتی عێراقی بەهۆی لاچوونی پەیمانی ١٩٣٠ یەوە کردی و خەڵکێکی زۆر لە مەلاکانی بەغدا و لە ئەفەندی و پیاوماقووڵانی‌تر بانگ کرابوون بۆ نان‌خواردن و چا خواردنەوە. دوکتۆر ئیبراهیم حلمی وتی: «کوڕینە! تەماشا کەن ئەم مەلایانە هیچ ویلێکیان نییە. لەو کۆبوونەوەی نانخواردنەدا مێز دانراوە و چێشتی لە سەرە، دەورییەکی خاڵی زۆر دانراوە بۆ ئەوە هەرکە بەشی خۆی تیٚ‌کا و بچیٚ لەولاوە بیخوا؛ کەچی مەلاکان هەر لەسەر مێزەکە ئەیانخوارد، نەئەچوون بەولاوە ڕێگەکەیان گرتبوو».

منیش وتم: «تەماشا کەن ئیش چەن سەیرە! ئێستە ئەوا تۆ وا ئەڵێیت، کەچی من تووشی مەلاکان بووم ئاگریان ئەکردەوە، ئەیانوت: سەیرکەن ئەم ئەفەندییانە چەندە بیٚ‌ویڵن، ئەوا مێز دانراوە و چێشتی لە سەرە، ناکەن لەسەر مێزەکە نانی خۆیان بخۆن، هەرکە دێنیٚ تۆزێک ئەکاتە دەورییەکەوە و ئەچیٚ لەولاوە وەکوو منالیٚ بەشی درابیٚ بە تاقی تەنها ئەیخوا!»).

**٢٥٥.** عەلی‌بەگی «ڕیشێن» و مەلاحسەینی کوڕی مەلاقادری بیارە لە «هەڵەبجە» لە دیواخانێکا دائەنیشن و کۆڕ گەرم ئەبیٚ. مەلا حسەین ئەڵیٚ: «بەینێکی‌تر وای لیٚ دیٚ ئەگەر باسی سمێڵ بکریٚ خەڵکی ئەڵێن: ها ها، سمێڵ ئەوەبوو کە بەسەر لێوی عەلی‌بەگی ڕیشێنەوە بوو، ئەتوت باوەشە بەڵمە».

عەلی‌بەگیش ئەڵیٚ: «بەینێکی‌تر وای لیٚ دیٚ کە باسی فێڵبازی و چەتوونی بکریٚ ئەڵێن: ها، ئەمانە ئەوەبوون کە بە مەلا حسەینی کوڕی مەلا قادری بیارەوە بوون».

**٢٥٦.** سەید «عبدالصّمد»ی برای سەید عەبدولعەزیزی شێخولئیسلامی سنە هەبوو پیاوێکی ڕیش سپی، کەڵەگەت و نەخوێندەوار و قسەخۆش بوو. لەبەر شێخولئیسلامی برای هەموو کەس ڕێزی لێ ئەگرت. سەید عەبدولحەمیدی «ناظم الشّریعه»ش پیاوێکی کەڵەگەتی جوانچاك و لاوچاك و بە جەوهەر بوو. ئەم نازموششەریعەیە کوڕی سەید عەبدولعەزیز و برازای سەید عەبدوسسەمەد بوو.

ڕۆژێك هەروا دائەنیشن قسە ئەکەن، سەید عەبدوسسەمەد بە سەید عەبدولحەمید ئەڵێ: «ئەولحەمی! تۆ بووی بە بەڵا بەسەر ئێمەوە، ناوێرین لەگەڵ ژنەکانمانا قسە بکەین خێرا پێمان ئەیژن: دە بچن، بچن دەم و لەوستان بەرن بەولاوە، ئەیژی سەی ئەولحەمین بە جوانخاسی خۆتانەوە بنازن!».

سەید «عبدالحمید» پێی ئەڵێ: «بەڕاستی مامە تۆیش بەسەر ئێمەوە بووی بە بەڵا، ناوێرین بە منالەکانمان بیژین بخوێنن، خێرا پێمان ئەیژن: دە لاچن، لاچن ئەی مامەولسەمەمان بەو زلی و گەورەییە بۆچی نەیخوێندووە؟!».

**٢٥٧.** شێخ عومەری «دەکە» هاتە لام هەروا قسەمان ئەکرد وتی: «فلانی بەخوا من ئەگەر بچمە بەهەشتیش ناحەسێمەوە تەنها لە ماڵەکەی خۆما نەبێ». منیش وتم: «فلانی، بەخوا منیش تەنانەت ئەگەر بچمە جەحەنەمیش هەر ئەحەسێمەوە تەنها لە ماڵەکەی خۆما نەبێ!».

**٢٥٨.** شێخ ڕەزای تاڵەبانی سواری ئێسترێك ئەبێ ئەچی بۆ کۆیە، ئەبێ بە میوانی ئەمین ئاغای کۆیە. پیاوەکەی ئەمیناغا دێت

ئێسترەکەی لێ بگرێ، لەو وەختەدا ئێستر لەقەیەك ئەهاوێژێ، کابرا ئەسڵەمێتەوە. شێخ ڕەزا پێی ئەڵێ: «مەترسە ئەمینە». وا ئەمیناغاش ڕاوەستاوە، ئەمیناغا گورج هەڵئەداتێ ئەڵێ: «بەڵێ، ئەگەر بیشیگێت ڕەزایە».

٢٥٩. مەلا ئەحمەدحەسەن مەلای مزگەوتی مەجیدبەگ، لە خانەقا شەڕیان لەگەڵ کردبوو، لێیان دابوو، سەریان شکاندبوو. مەلا ئەحمەدی هۆرینی چووبوو بۆلای، ئامۆژگاری ئەکرد پێی ئەوت: «برا تۆ مانگانەیەکت لەلایەن حوکمەتەوە ئەدەنێ، بۆ خۆت دانیشە بەبێ قڕە بیخۆ، بۆچ ئیشێکی وا ئەکەی سەرت بشکێنن؟» مەلا ئەحمەدیش ئەڵێ: «برام حوکمەت مانگانەم ئەداتێ بۆ ئەوە پێشنوێژی بۆ خەڵك بکەم، خۆ بۆ ئەوەم ناداتێ کە لێم بدەن و سەرم بشکێنن!».

٢٦٠. شێخ ڕەزای تاڵەبانی جارێك زەمی حاجی مستەفای قیردار ئەکا ئەڵێ: «ئەبێ لەگەڵ دانیالە گاورا دەستیان ببەستم بە دەستی یەکەوە و بیانخەمە بیرێکی پیساییەوە». حاجی مستەفا ئەمە ئەبیێتەوە ئەچێتە لای شێخ عەلی برا گەورەی شێخ ڕەزا شکات لە شێخ ڕەزا ئەکا ئەڵێ: لەگەڵ دانیالە گاورا منی کردووە بە یەك.

شێخ ڕەزا ئەچێ بۆ تەکیە. شێخ عەلی لێی تووڕە ئەبێ ئەڵێ: ئەرێ شێخ ڕەزا تۆ بۆچ ئەوەندە بێدەرەتانی؟ ئاخر نازانی حاجی مستەفا سەر بە ئێمەیە و دۆستایەتی لە بەینمانا هەیە؟ تۆ چۆن دێنی لەگەڵ دانیالە گاورا ئەیانکەی بە یەك و زەمی ئەکەی؟

شێخ ڕەزاش ئەڵێ: «کاکە، زۆر سەیرە! ئێستە کە هاتم بۆ ئێرە دانیالە گاور خۆی گرتبووە قوڕ و سەری ڕێی پێ گرتبووم، ئەیوت: من ئەوەم پێ

ناخۆش نییە کە زەمت کردووم، بەڵام ئایا کەسی‌ترت دەست نەکەوت وا لەگەڵ حاجی مستەفادا منت کردووە بە یەك!».

٢٦١. شێخێك هەبوو لە قسە کردنا زمانی کۆڵ بوو، پێی ناوێ بەچکە لالێك بوو. ئەچێتە لای کابرایەکی دانساز دانی بۆ دروست کا. دانەکانی ئەخاتە دەمی، کەچی هەر ناشزانێ قسە بکا. ئەچێتەوە لای دانسازەکە ئەڵێ: ئەمە تۆ چ جۆرە دانێکت بۆ من دروست کردووە، خۆ بە تەواوی پەکی قسە کردنم کەوتووە. دانسازیش ئەڵێ: «یا شێخ! من دانسازم خۆ زمانساز نیم!».

٢٦٢. پیرێژنێکی بڵباسەتی لە وەختی خۆیا بووە بووە و لێی ئەقەومێ و لە ڕوویشی هەڵنایە داوا لە کەس بکا. ئەچێتە لای حەماغای کۆیە ئەڵێ: ئاغا چەند ڕۆژێکە مشك لە ماڵەکەما نابینم ئەترسم خانووەکەم ئاگری تێ بەر بێ. (ئەمە قسەیەکە لە کوردەواریدا تاقی کراوەتەوە کە مشك شوێنێکی بەجێ‌هێشت ئەوە ئەو شوێنە ئاگر ئەگرێ بۆیە بەجێی دێڵێ). حەماغاش ئەڵێ: «بچۆ ئەوە دوو بارە گەنم و بارێك برنج و هیزەیە ڕۆن بەرە تێیخە با ئاگری تێ بەر نەبێ».

٢٦٣. کابرایەکی گەدا چووە بەر قاپی کۆشکێکی گەورە وتی: قڕانێکم بدەنێ. وتیان: نییە. وتی: نەختێ شەکر و چام بەنێ. وتیان: نییە. وتی: تۆزێ ڕۆن، وتیان: نییە. وتی: گوێلە ساوەرێ، برووشێ شتێکم بدەنێ، وتیان: نییە. وتی: دەسا چۆڕێ ئاوم بەنێ بیخۆمەوە. وتیان: وەڵڵا ئاویشمان نییە. وتی: «کەواتە بۆ دانیشتوون، وەرن با دەست بگرین و پێکەوە بگەڕێین، ئێوە لە من لاتترن».

٢٦٤. کابرایەك ئەبێ بە میوانی ماڵە کوردێك، بەرخێك ئەکەن بە بریانی و دایئەنێن. کابرای میوان زۆری برسی ئەبێ پارووی سەیرسەیر و بە پەلەی لێ دائەگرێ. میوانێکی‌تریش لەوێ ئەبێ پێی ئەڵێ: «برا بۆچ ئەوەندە لێی بە داخی، خۆ باوکی شەڕەقۆچی لەگەڵ نەکردووی». ئەمیش ئەڵێ: «برا تۆ بۆچ ئەوەندە دڵت پێ ئەسووتێ، خۆ دایکی شیری پێ نەداوی».

٢٦٥. سەید عەلی «بِسمِ اللّه» هەبوو لە سولەیمانی، کە بیسمیللا ئەکرا ئەو تووڕە ئەبوو. مەلا جەلالی کوڕی مەلاحەسەنی ئابڵاخیش هەبوو، لەوانەبوو کە دەرزی ئەخوێند؛ بۆ ڕۆژی دوایی شوێن دەرزەکەیان لێ تێك ئەدا، نەیئەزانی. ڕۆژێك سەید عەلی بەم مەلا جەلالە ئەڵێ: «ئەرێ مەلا جەلال! دوێنێ چاوم لێ‌بوو لای بابە عەلی دەرست ئەخوێند، بابە عەلی شوێن دەرسەکەی لێ تێکدابووی، تۆش هەر کتێبەکەت پەڕە پەڕە ئەکردەوە و نەتئەزانی سەر دەرسەکەت کامەیە». مەلا جەلالیش ئەڵێ: «نەوەڵڵا سەی عەلی؛ ئەوە پەڕە پەڕە کردنەوەم بۆ ئەوە نەبوو، بۆ ئەوەبوو من ئەموت: ئەم کەلیمەیە بیسمیللایە، شێخ بابە عەلی ئەیوت نە بیسمیللا نییە. سەی عەلی قوڕ و قەپ ئیتر وشك بوو.

٢٦٦. حاجی‌شێخ ئەمینی تەکیەیی هەبوو حسابگر بوو. شێخ مەحموودی گومەتەییش ژنێکی هەبوو ئەویش هەر حسابگر بوو. ڕۆژێك باسی پاییز و حسابی پاییز ئەکرا، یەکێ لە حاجی شێخ ئەمینی پرسی کە پاییز چەندیەتی؟ ئەویش ئەڵێ: «لە شێخ مەحموود بپرسین ژنی حسابگرە». شێخ مەحموودیش بەبێ وەستان ئەڵێ: «حسابگر ژنمە».

**٢٦٧.** لە بەغدا لە سەر کورسی بەرهەیوانی مزگەوتێك دانیشتبووم چاوەڕێی ئەوەم ئەکرد بانگی عەسر بدەن و نوێژ بکەم. هێشتا مابووی بە بانگ. کوتوپڕ کابرایەك بە پەلە هات و هەر لە دوورەوە وتی: «ئەوە بۆچ بانگ نەدراوە؟ خۆ لەو مزگەوتە بانگیان دا». منیش هەروا لەسەرخۆ پێم وت: «زۆر سەیرە! ئێستە لەو مزگەوتە کابرایەك بە شێنەیی ڕۆیشت نوێژ بکا سەیری کرد بانگیان دابوو، وتی: ئەوە بۆچ بانگتان داوە؟ خۆ لەو مزگەوتە بانگ نەدراوە». کابرا دەمی بوو بە تەڵەی تەقیوەوە.

**٢٦٨.** لە سولەیمانی لە شوێنەکەی قادرئاغای عەتار دانیشتبووین. ئەوڕەحمان بەگی بابان و پیاوێکی خەڵکی دەرەوە و چەند کەسێکی تر بووین، باسی گوللەبەندەکەی کاك ئەحمەد هاتە پێشەوە. ئەوڕەحمان بەگ وتی: «جانم وا نییە، کەی گوللەبەند هەیە، بۆ ئەوە بڕوای پێ بکرێ هەندێ شەرت و شرووتی بۆ دانراوە کە هەرگیز نەیەتە دی، وەکوو ئەوە ئەڵێ: ئەو کەسەی کە هەڵیئەگرێ نابێ قەت درۆی کردبێ، ماڵی حەرامی هیچ نەخواردبێ، قەت بە لەشی پیسەوە دانەنیشتبێ. دەی ئەمە چۆن ڕێ ئەکەوێ؟».

پیاوەکەی خەڵکی دەرەوە لەم قسانە تووڕە بوو وتی: «سا بە مەرقەدی کاك ئەحمەد وا نییە. من بە چاوی خۆم چاوم پێ کەوت گوللەبەندەکەیان کردبووە ملی گیسکێك، زیاتر لە بیست گوللەیان پێوە نا کاری تێ نەکرد». منیش وتم: «جا ئەمە ڕاستە؛ چونکە ئەو گیسکە نە درۆی کردووە، نە ماڵی حەرامی خواردووە، نە قەدیش بە لەشی پیسەوە دانیشتووە». کابرا واقی وڕ ما و ئیتر هیچ قسەی پێ نەکرا.

٢٦٩. کابرایەك تووشی ئافرەتێکی جوانکیلە بوو کە بارەشاری هێنا بوو بۆ شار و ئەڕۆیشتەوە. پێی وت: توخوا ژنەکە ئا ئەم ڕاسپێرەم لەگەڵ خۆت بۆ ناگەیەنی؟ لەو وەختەدا دەستی برد بۆ دەعباکەی. ژنەکەش کوتوپڕ وتی: «ئەگەر دایکتم بەرچاو نەکەوت، بیگەیەنم بە خوشکت؟».

٢٧٠. کابرایەك زۆر ناشیرین «دومەڵ»ـێکی لێ هاتبوو. ڕۆژێك کابرایەکی هاوڕێی تووش بوو وتی: ئەوە بۆچ دیار نیت؟ وتی: «فلانی، دومەڵێك لە شوێنێ زۆر پیسم هاتووە لەبەر ئەوە ناتوانم دەرکەوم». وتی: فلانی ڕاست ناکەی، ئەوە ڕوومەتتە هیچ دومەڵی پێوە نییە.

٢٧١. کابرایەکی ڕووتەڵەی لووت زل خوازبێنی ژنێکی جوانی ئەکرد. لە میانەی قسەدا بۆ ئەوە ژنەکە ساز کا ئەیوت: «تۆ ئەبێ بزانی کە من پیاوێکی بارهەلگرم، هەموو ناخۆشی و سەختێك بەڕێوە ئەبەم». ژنەکەش وتی: «ڕاست ئەکەی تۆ کە ئەمە سی چلساڵە ئەو لووتەت هەڵگرتبێ هەموو شتێك هەڵئەگری».

٢٧٢. ئاغەیەك هەبوو کوڕێکی خزمەتکاری لابوو. ڕۆژێك ئاغەکە چاوی بە کچێکی خزمی خزمەتکارەکەی خۆی ئەکەوێ و دڵی لێ ئەچێ. بە کوڕەکە ئەڵێ: هەرچەن بۆ منیش ناشێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا هەر بچۆ خوازبێنیم بۆ بکە». کوڕەکە ئەڵێ: قوربان بە کەڵکی تۆ نایە. ئەڵێ: بۆچی؟ ئەڵێ: «ڕۆژێ چاوم لێبوو پیاوێك ماچی ئەکرد». ئاغە ئیتر واز دێنێ و لە پاش چەند ڕۆژێك، کوڕە خۆی ئەچێ و کچەکە مارە ئەکا. ئاغەکەی پێی ئەزانێ و ئەڵێ: هەتیو! خۆ تۆ بە منت وت چاوم لێبوو پیاوێك ماچی ئەکرد، کەچی ئێستە تۆ خۆت چوویت

مارەت کرد؟» وتی: «بەڵێ قوربان، درۆم عەرز نەکردووی، چاوم لێ بوو باوکی ماچی ئەکردا».

٢٧٣. مەولەوی لە دیواخانی والی سنەدا ئەبێ، پیاوێکی والی کە سوننی نابێ ئەیەوێ بە قسە مەولەوی بشکێنێ. ئەڵێ ماموستا هەر ئێستە بەو لایەدا ڕۆیشتم سەگێك میزی بە گۆڕی سوننییەکدا ئەکرد. مەولەویش بەبێ وەستان ئەڵێ: «بەڵێ، وەنەبێ ئەمە کاری ئێستەیان بێ، شێعە و سوننی دەمێکە ئەم ناکۆکییەیان هەیە!».

٢٧٤. کابرایەکی کورد کەڵەشێرێکی پێ ئەبێ و ئەچێتە بیجاڕ. کابرایەکی بیجاڕی لێی ئەپرسێ: برا ئەم کەڵەشێرە لە ئێمەیە یان لە ئێوە؟ ئەویش ئەڵێ: «لە گوو خواردنا لە ئێوەیە و لە بانگدانا لە ئێمەیە».

٢٧٥. کابرایەك چووە گوندێك و بوو بە میوانی پیاوێکی کورد. چوار پێنج شەوی پێچوو، خانەخوێکە هیچ دەنگی نەکرد لە پاشا لێی پرسی: «برا تۆ چیت؟» وتی: «من خۆشکەزای خوام». دەستی کرد بە خزمەتکردنی و دە پانزە شەوێکی‌کە مایەوە. کابرا وەڕس بوو، شەوێك نوستبوو هەڵسا باوەشی پیا کرد و بردی فڕێی دایە سەر حەسیرە شڕی مزگەوتەکەیانەوە. کابرا خەبەری بووەوە خۆی لە شوێنێکی سەیرا چاوپێکەوت. پرسی ئەمە چییە؟ کابرای خانەخوێ خێرا هەڵیدایە وتی: «برا، زیاتر لە بیست شەو لە ماڵی منا بوویت، با شەوێکیش لە ماڵی خاڵتا بیت!».

٢٧٦. جارێکیان ئاغایەك ئەچێتە سەر کارێزی «قەتەوی» سەیر ئەکا ئەڵێ: «ها، ڕەشی بەشی قوون فش چیت کردووە، کەرت گاوە؟» ئەویش ئەڵێ: «نە بە سەری تۆ، ئاغاژنم گاوە!».

٢٧٧. مەلایەك كوڕە كوردێكی فێری حساب ئەكرد، جەمعی فێر كردبوو، خەریك بوو فێری تەرحی بكات لێی پرسی وتی: هەردوو دەستت چەند ئەنگوستی هەیە؟ كوڕەكە وتی: دە ئەنگوست. مامۆستا وتی: ئەگەر چواری نەمێنێ چی ئەبێ؟ كوڕە وتی: «جا مامۆستا ئەگەر چوار ئەنگوستم نەمێنێ خۆ بە جارێ پەكی شەڕەقەڵماسك و بلوێر لێدانم ئەكەوێ».

٢٧٨. جارێك مەلایەك فەقێیەكی لەگەڵا ئەبێت ئەچنە دیواخانی غوڵامڕەزاخانی كولیایی. غوڵامڕەزاخان پیاوێكی قسە خۆش و ئەدیب بووە، ڕوو ئەكاتە فەقێیەكە ئەڵێ: «فەقێ! ڕاستە ئەڵێن تۆ ژنی مامۆستات ئەگێیت؟» فەقێیەكە زۆر شەرمەزار ئەبێ. مەلا خێرا ئەڵێ: «بەڵێ قوربان، مامۆستای ڕەزایە».

٢٧٩. دوو كابرای كورد پێكەوە نانیان ئەخوارد، یەكێكیان وتی: وا چاكە من ئەو خەریك كەم بە قسە كردنەوە و من هەموو نانەكە بخۆم. لێی پرسی: «ئەرێ توخوا برا، ڕەحمەتییەكەی باوكت چۆن و بۆچی مرد؟» كابرا دەستی پێ كرد بە پەسا داخستن، لەبەر چی نەخۆش كەوت و چۆن و چەندە لەگەڵی خەریك بوون و چۆن هیچ شەخس و داودەرمانێك نەما نەگەڕن و نەیكەن و هیچ كەڵكی نەبوو، ئاخری هەر مرد. ئەویش بە شێنەیی نانی ئەخوارد و جارجار «ئم»ێكی بۆ ئەكرد. كابرا وەختێ بە خۆی زانی ئەوا نان لە دوایی هاتنایە و ئەمیش هیچی نەخواردووە. وتی: با منیش هەقی خۆمی لێ بكەمەوە بڵێم ئەی باوكی تۆ چۆن مرد. لێی پرسی: «ئەرێ برا ئەی باوكە ڕەحمەتییەكەی تۆ چۆن مرد؟» ئەو هیچ سێودووی لێ نەكرد، بە كورتی وتی: «نەخۆش كەوت و مرد».

**۲۸۰.** فەقێیەکی قۆشمە ئەچێتە لای ژنێك، داوای ساجی لی ئەکا، ئەڵێ: توخوا خوشکێ ساجەکەتانم بدەنێ نەختێ نانی پێ ئەکەین و بۆتان دێنمەوە. ژنەش کۆشی هەڵئەداتەوە و شتە ڕەشەکەی بۆ دەرئەخا، ئەڵێ: ئەوەتە ببیە. فەقێیەش دەستکاوانەکەی خۆی دەرئەخا و ئەڵێ: «توخوا خوشکێ قوڵفەکەی بکە بەو سنگەدا با دەستنوێژەکەم نەشکێ».

**۲۸۱.** کابرایەك دەرۆزەی ئەکرد، چووە شوێنێك وتی: برسیمە. وتیان: درۆ ئەکەی. وتی: «تاقیم بکەنەوە؛ بریانییەك و مەنجەڵێ برنجم بۆ دانێن، ئەگەر نەمخوارد ئەو وەختە درۆ ئەکەم».



# سەیر کردنێک

زمانی کوردی ئەگەر لە ساماندارترین بەشە زمانەکانی ئاری نەبێ، یەکێکی هەرە دەوڵەمەندە لەو زمانانە. تاك‌تاکی شێوەکانی و بەندبەندی لقەکانی خۆی بۆ خۆی گەواهی ئەو داواکردنە ئەدا.

کەواتە ئەبێ ئێمە لەسەر ئەو باوەڕە بین کە زمانەکەمان زمانێکی فراوانە. تا ئێستە ئەگەر نازێکی نەکێشرابێ لەبەر بێ‌نازی ئەو قەومە بووە کە زمانەکەی وەکوو ملوانکەی مرواری کەوتۆتە ژێر خاك و خۆڵی بێ‌کەسییەوە. تا ئەم دەورەیە وا بووە، ئومید ئەکەم لە ئێستە بەدواوە بە پشتیوانی کوڕانی دایکی نیشتمانی خاکی کوردەوە، ئیتر بەهۆی تیشکی زانین و نووسینەوە لە چاڵی بێ‌خزمەتی بهێنرێتە دەرەوە و بکەوێتە ئاسمانی بەرزی و لە ڕووناکی ئەو، کورد و نیشتمانی کوردی پێ دەرکەوێ.

من بۆ دانان و ڕێکخستنی ئەم کتێبە گەلێ شوێن گەڕام و هەڵسوکەوتم لەگەڵ گەلێ کەسی سادە و بەرزا کرد. لە بەری ئەم فرمانەم ئەوەم دەست کەوت: کە کۆمەڵە ئەدەبێکی لە وشەی کوردی پەتیم بۆ هاتە ئەنجام. لە مەوە ئەگەر کتێبێکی وەها نەبوایە ئەو وشانە نەئەچوونە ناو خەزنەی سامانی مانەوەی زمانی کوردی. لەوانە بوو هەروا بەرەبەرە بۆ خۆیان لە ئاخرا ئەپووکانەوە. ئەم بەرگە و بەرگەکەی‌تری لە شێوەکانی زمانی کوردیدا داستانێك ئەگێڕنەوە.

منەتباری هەستە شیرینەکەی «حەمەبەگی حاجی ڕەسوول‌بەگ» و «حاجی توفێق‌بەگی پیرەمێردم». پیرەمێرد چ بە زمانی خۆی و چ بە گاڵتەوگەپەکەی، سەرچاوەیەك بوو بۆ ئەم کتێبە. حەمەبەگی حاجی ڕەسوول‌بەگ بە زمانە پاراوەکەی و بە قەڵەمە ڕەوانەکەی لە نوکات و سەرگوزەشتی کوردیدا جێگەی خۆی لە ڕیزی هەرە پێشەوەی ئەدیبە گەورەکانی کوردا تەرخان کردبوو. لە بەرگی دووهەمی ئەم کتێبەدا سەرگوزەشتەی ژیانی ئەخرێتە ڕیزی ناودارانەوە.

**عەلائەددین سەججادی ـ بەغدا**
**٢٦٥٧/١/٥ کوردی**
**٣ جمادی الثانی ١٣٧٦ هجری**





عاشقی وشەی خاوێنی کورد، کەلەپیاوی بەدەستوبرد، هۆگری داب‌ونەریتی کوردەواری، کۆکەرەوەی کەلەپوور لە دێهات و شاری، زیندووکەرەوەی شادی، شێخ عەلائەددینی سەججادی.

ناوی «عەلائەددین نەجمەددین عیسامەددین»ە و لە بنەماڵەی ناوداری «سەججادی»یە لە ڕۆژهەلاتی کوردستان. لە ساڵی ۱۹۰۷ی زایینی لە سنەدا هاتۆتە دنیاوە و لە کۆشی خێزانێکی ئایینیدا پەروەردە کراوە. لە ساڵی ۱۹۳۸ی زایینی ئیجازەی مەلایەتی لای مامۆستا «شێخ بابەعەلی تەکیەیی» وەرگرتووە و چووە بۆ بەغدا و لە مزگەوتی «نەعیمە خاتوون» بووە بە پێش‌نوێژ. لە بەغداش لای مامۆستایان شێخ «ئەمجەدی زەهاوی» و شێخ «محەممەدی قزلجی» بە هەندێ لە زانستە ئیسلامییەکاندا چۆتەوە. لە ساڵی ۱۹۳۹ی زایینیدا چۆتە مەیدانی ڕۆژنامەنووسی و لە ۱۹٤۱دا بووە بە بەڕێوەبەری گۆڤاری «گەلاوێژ» و وردە وردە بووە بە هەمەکارەی و تا داخستنی لە ۱۹٤۹دا لەگەڵی بووە.

لە ساڵی ۱۹٤۸دا گۆڤاری «نزار»ی بە عەرەبی و کوردی دەرکردووە، کە گۆڤارێکی نیشتمانپەروەری و سیاسی بووە. تا ساڵی ۱۹۷٤ مامۆستای وێژە و مێژووی وێژەی کوردی بووە لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا. لە ساڵی ۱۹۷٤دا کرا بە ئەمینداری گشتی ئەوقاف و سێ ساڵ لەو کارەدا ماوەتەوە.

ئێوارەی ڕۆژی پێنج‌شەممەی ۱۹۸٤/۱۲/۱٤ی زایینی، کۆچی‌دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە نزیکی شێخ عەبدوڕڕەحمانی ئەبولوەفای نەقشبەندی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی بە کۆشی خاک سپێرراوە.

عەلائەددینی سەججادی زیاتر لە چل ساڵ خەریکی زیندووکردنەوەی کەلەپوور و نووسینی مێژووی وێژەی کورد بوو. تێکۆشانی بێ‌وچانی ئەم پایەبەرزە نەیهێشت کە گەنجینەی کەلەپووری نەتەوەکەمان بفەوتێ.

**ناوی بەرز و ڕۆحی شاد بێت**




انتشارات کردستان

Kurdistan Publication

سنندج- پاساژ عزتی - تلفن: ۳۳۱۶۵۳۸۲

جلد اول




شابک دوره

